# سەردەم 46

ئابی
2006
ساڵی شەشەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی


خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی — شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید — شێرزاد حەسەن

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

کاری کۆمپیوتەری: تاڤگە فائق

هەڵەچنی چاپ: ساکار رەووف

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد رەفیق

چاپ: دەزگای حەمدی



ناونیشان

سلێمانی — فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی

ژمارە ( 14665/615و 14665/616) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

www.sardam.info



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە


–سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

–تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بلاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمەکان بلاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

–هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.

# ناوەرۆك



## وێستگەکانی سەردەم



**نرخی ( 1200 ) دینارە**

# قەیرانی هۆشیاری ئەوروپی و دابڕانی گەورەی ئەپستمۆلۆژی

هاشم ساڵح

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

پێویستە بزانین کە هۆشیاری ئەورووپی (یاخود مەسیحی) لە ساڵی 1685 یان تەنانەت کەمەکێك بەر لەو ماوەیەش، کەوتە ناکۆکی لەگەڵ خۆیدا. هەموو ئەوانەش لەبەر ئەوە بوو کە جیهانبینینیەکی نویٚ بۆ دنیا هاتە گۆڕیٚ و ئەم جیهانبینینیەش کەوتە ململانیٚ لەگەڵ ئەو تێڕوانینە مەسیحیەی، بەدرێژایی هەزار ساڵ واتە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست، بەسەر ئەقڵ و بیرکردنەوەی خەڵکیدا زاڵ بوو. دنیا بینی مەسیحی هەروا بە ئاسانی قبوڵی نەدەکرد ڕێگا بە سەرهەڵدان و هاتنە ئارای جیهانبینینیەکی دیکە بدات، هەروەها خەڵکیش نەیاندەتوانی وا بە ئاسانی و لە پڕێکدا عەقڵ و بیرکردنەوەی خۆیان بگۆڕن، بۆ ئەوەی پەیڕەوی بۆچوون و دیدگایەکی تازە بکەن. چونکە بۆچوونی کۆن عادەتەن بە حوکمی خوو پێوە گرتن و ڕاهاتن لەسەری، خۆشەویستە و لە ناخ و دەروونندا دەچەسپێت. کەواتە هەروا ئاسان نییە خۆت لە بۆچوون و قەناعاتی ڕابردوو پاککەیتەوە، واتە دەستبەرداری کۆی ئەو شتانە بیت کە لەسەرەتای تەمەنتەوە دەرگیریان بوویت.

بەمجۆرە دەبوو کێشەی نێوان ئەو دوو دنیابینیە تاو بسەنیٚ و چەند سەدەیەکیش درێژە بکێشێت. شایەنی باسە دنیا بینی زانستیانە بۆ جیهان، بەماوەیەکی دوور و درێژ بەر لە ساڵی 1685 دروست بوو. واتە دەتوانین سەرەتای دروست بوونی بگەڕێنینەوە بۆ چرکەساتی "گالیلۆ"، بەڵام لە سەردەستی "ئیسحاق نیوتن" و لە ماوەی ساڵانی 1685-1687 دا، واتە بەرواری دەرچوونی کتێبە بەناوبانگەکەی (بنەما ماتماتیکیەکانی فەلسەفەی سروشتی)، خۆی بەیان دەکات.

شۆڕشی گەورەی زانستی نوێ بە فیعلی لە دەوروبەری ساڵی 1620، لەسەردەستی "گالیلۆ و کیپلەر و دیکارت" دەستی پێکرد و ساڵی 1686، لەسەر دەستی "لایبنتز و نیوتن" گەیشتە ترۆپك. ئەمەش بە گەورەترین شۆڕشی زانستی و ڕۆحی دەژمێردرێت، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا و سەرچاوەی شۆڕشە زانستیەکانی دیکەش بوو لە سەدەی نۆزدەو بیستدا. سەبارەت بەم مەسەلەیە بیریارێکی هاوچەرخی وەك "جۆرج گۆسدۆرف" پڕکێشی دەکات و دەڵێت: (ئەوە گالیلۆ بوو کە بەیەکجاری تێڕوانینی میتۆلۆژی دەربارەی گەردون تێکوپێکداو تێڕوانینێکی زانستی لە بری ئەوە هێنایە ئارا). لێرەدا دەتوانین بڵێین تێکوپێکدانی ئەو دنیابینیە میتۆلۆژیە بۆ جیهان لەلایەن "گالیلۆ"وە، ئەو جیهانبینیەی لە سەدەکانی ناوەڕاست و "ئەرستۆ"و "پەتلیمۆس"وە مابووەوە، گەورەترین ڕوداوێك بوو لە مێژووی فیکری خۆرئاوادا. لەبەرئەوەی تێکڕای ئەو شۆڕشە ئەپستمۆلۆژی یان زانستیانەی دوای ئەو مێژووە ڕویاندا، لەو کەوتنەوە (وەك شۆڕشی ئیسحاق نیوتن لە هەمان سەدەدا و شۆڕشی ئەنشتاین لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا).

لە مێژووی فیکردا تاکە یەك دابڕانی ئەبستمۆلۆژی هەیە: ئەویش ئەوەیە کە لەچرکەساتی "کلیپەر" و "گالیلۆ"دا ڕوویدا و "دیکارت"یش لە ڕووی فەلسەفیەوە تیۆریزەی بۆ کرد. (سەبارەت بە کۆپەرنیکۆسیش کە سەر بە سەدەی شازدەهەمە، ئەوا بێگومان دەکەوێتە ناو شۆڕشی گالیلۆییەوە). کەواتە ئەوە "دیکارت" بوو توانی لە سەر ئاستی فەلسەفی کۆمەڵێك دەرەنجامی گرنگ، لە ڕووداوێکی زانستی گەورەی لەو شێوە، بەدەست بێنێت. دواتریش دەبینین چۆن چۆنی "کانت" دەتوانێت دەرەنجامی فەلسەفی گرنگ، لە دۆزینەوەکانی "نیوتن" بە دەست بێنێت. لێرەوە ئەو دەستەواژەیە بڵاوبووەوە کە دەڵێت: (گەر نیوتن نەبوایە، کانت نەدەبوو!). ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەی ئەوەیە کە لە خۆرئاوا، تا چ ئاستێك فەلسەفە بە پێشکەوتنی زانستەوە بەستراوە. تەنانەت تۆ لە خۆرئاوادا ناتوانیت دەست بە فەلسەفاندن بکەیت، ئەگەر ئاگاداری دواین دەرەنجامی دۆزینەوە زانستیەکانی سەردەمەکەت نەبیت. ئەمەش بەو مانایە نایەت کە دەبێت فەیلەسوف بە تەواوەتی زانابێت، بەڵکو بۆ ئەوەیە بتوانێت تێگەیشتنێکی قوڵی بۆ ئەوە هەبێت کە لە کایەی زانستی سەردەمەکەیدا چی دەگوزەرێت. ئێمە ئەگەرچی ئەمەش دەڵێین، بەڵام ڕەنگە فەیلەسوفانێکی زۆر گەورەش هەبن کە ئاشنایەتیان لەگەڵ زانستدا نەبێت، بەڵام هەستێکی ناوەکی ئەوەندە سەیریان هەیە، کە دەتوانێت بە ناخی مێژوودا ڕۆبچێت. لێرەدا دەتوانین نمونە بە "ژان ژاك ڕۆسۆ" لە سەدەی هەژدەهەمدا و یان تەنانەت "سپینۆزا" لە سەدەی حەڤدەهەمدا، بهێنینەوە. بۆ فەلسەفاندن دوو ڕووداو هەیە: یان ڕوداوێکی زانستی گەورە، یاخود ڕوداوێکی ڕۆحی و مێژوویی مەزن (بۆ نمونە گەر شۆڕشی فەرەنسی نەبوایە، هیگڵ نەدەبوو). لەلایەکی ترەوە زۆر دەگمەنە زانایەکی گەورە، فەیلەسوفێکی گەورەش بێت (بۆ نمونە گالیلۆ لەسەر ئاستی فەلسەفی، شتێکی ئەوتۆ نییە، بەڵام لەسەر ئاستی زانستی نکوڵی لێ ناکرێت). هەرچی "دیکارت"یشە، بایەخ و گرنگی فەلسەفی زۆر لە بایەخ و گرنگی زانستی زیاترە.

هەر چۆنێك بێت، مەسەلەی (دابڕانی ئەپستمۆلۆژی) هەر لەو کاتەوەی "گاستۆن باشلار" لە چارەکی یەکەمی سەدەی ڕابردوودا

تیۆریزەی بۆ کرد، کێشە و مشتومڕی توندی لە فیکری ئەوروپادا خستەوە. پاشان بیریارانی دیکەی فەرەنسی و بە تایبەت "میشێل فۆکۆ" و "لوی ئالتۆسێر"، ئەو چەمکەیان لێخواست. "فۆکۆ" کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی (وشەکان و شتەکان)ی لەسەر دارشت، کاتێك هەستا بە دیاریکردنی دوو دابڕانی سەرەکی: دابڕانێك کە لە ساتەوەختی "دیکارت" (نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدە)دا دروست دەبێت و دابڕانێکیش لە چرکەساتی "کانت" (نیوەی دووەمی سەدەی هەژدە)دا روودەدات.

"فۆکۆ" چەمکی دابڕانی ئەبستمۆلۆژی لە میانەی تاوتوێکردنی تێکستە فەلسەفی و زانستە مرۆییەکانەوە گەلاڵە کرد، نەك لە ڕێگای لێکۆڵینەوەی زانستەکانی وەك: (ماتماتیك و کیمیاو فیزیا). چونکە ئەو لەو بوارەدا شارەزانەبوو. سەرەڕای ئەوەش سەیرکردنی "فۆکۆ" بۆ دابڕان وەك پرۆسەیەکی ڕەها و یەکجارەکی، لە چەندین لاوە ڕووبەڕووی ڕەخنەی کردەوە.

سەبارەت بە "لوی ئالتۆسێر"یش، ئەوا هەوڵیدا چەمکی دابڕانی ئەبستمۆلۆژی نەك بەسەر سەردەمە جیاوازەکاندا پراکتیزە بکات، بەڵکو بەسەر بەرهەمی تاکە بیریارێکدا بیکات: ئەو بیریارەش "کارل مارکس" بوو. بە بۆچوونی "ئالتۆسێر"، ئێمە دوو "مارکس"مان هەیە، "مارکس"ی لاو و ئایدیۆلۆژی، لەگەڵ "مارکس"ی پیر و زانستی. ئەم دابڕانە ئەپستمۆلۆژیەش لە دەوروبەری ساڵی 1845دا ڕوودەدات، واتە بەر لە بڵاوبوونەوەی ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی یاخود تەنانەت چەند تێزێك دەربارەی فویرباخ. "مارکس" بەر لەم دوو نوسینەی ئایدیالست و ئایدیۆلۆژی بوو، بەڵام دواتر بووە کەسێکی تەواو ماتریالیستو زانستی. ئەم تیۆریایەی "ئالتۆسێر"، دواتر ڕووبەڕووی ڕەخنە و گازندەی زۆر بووەوە. ئەگەرچی بۆ ماوەیەك ڕەواجی پەیدا کرد، بەڵام لە دوایدا لەبیرچووە و کاڵ بووەوە. چونکە کەس پێیوانییە "مارکس" لە پڕێکدا لە خودی خۆی دابڕابێت و بووبێتە کەسێکی دی، یاخود سەرەتا پڕاوپڕ ئایدیۆلۆژیست بووبێت و لە پڕێکدا بووبێتە کەسێکی تەواو زانستی.

گومانی تێدا نیە ئەویش وەك هەر بیریارێکی مەزن بە تێپەڕبوونی کات، گەشەی کردووە و گەشتۆتە قۆناغی کامڵی، بەڵام ناتوانین بڵێین دابڕانێکی ڕەها هەیە. شایەنی باسە ئەوەی جێی ناڕەزایی و گازندەیە، ئەو تێڕوانینە ڕەهایە یە بۆ چەمکی دابڕان. لەلایەکی ترەوە لێکۆڵینەوە و نوسینەکانی ئەپستمۆلۆژیستی ئەمریکایی "تۆماس کوهن"، بووە مایەی دروستکردنی ڕەخنەو مشتومڕی زۆر، دوای ئەوەی لە ساڵی 1962دا کتێبە بەناوبانگەکەی (بونیادی شۆڕشە زانستیەکان)ی بڵاوکردەوە. "کوهن" لەو کتێبەدا وەکو "میشێل فۆکۆ" بە شێوەیەکی ڕەها دەکەوێتە پراکتیزەکردنی چەمکی دابڕان. لێرەدا دەکرێت بڵێین "فۆکۆ" لاسایی "کوهن"ی کردۆتەوە، لەبەرئەوەی کتێبەکەی (وشەکان و شتەکان – 1966) چوار ساڵ دوای کتێبەکەی "کوهن" کەوتە بەردەستی خوێنەران، بەڵام "فۆکۆ" بە هیچ شێوەیەك ئاماژەی بۆناکات و باسی ناکات.. ئاشکرا نییە ئایا کەسیان ئاگایان لەوی دیکەیان نەبووە، یاخود "فۆکۆ" بە ئەنقەست ناوی نەهێناوە، تا نەڵێن کۆپی ئەوی کردووە؟ کەس وەڵامی بۆ ئەمە پێنیە. "تۆماس کوهن" لە ڕێی یەك تێرمەوە کە (پارادیم)ە – *Paradigm*، بایەخ بە چەمکی دابڕانی ئەپستمۆلۆژی دەدات، وەك چۆن "فۆکۆ" لە ڕێی

وتەزای (ئەبستیم)ەوە – *Episteme*، گرنگی بە هەمان چەمك دەدات. دەتوانێت وتەزای (ئەپستیم) بەوە تەرجەمە بكەین كە سستمێكی قوڵی بیركردنەوەیە و بەدرێژایی ماوەیەكی دیاریكراو چۆنیەتی بیركردنەوەو دنیا بینی ئینسانەكان دیاری دەكات، (بۆ نمونە سستمێكی بیركردنەوە هەیە كە لە سەدەكانی ناوەڕاستەوە دەست پێدەكات و تا سەدەی شازدە بەردەوام دەبێت، سستمی فیكری سەردەمی كلاسیك هەیە، لەگەڵ سستمی فیكری مۆدێرنە. ئەم دابەشكردنە بەپێی ئەو پۆلێنكارییەیە كە لە كتێبی وشەكان و شتەكاندا هاتووە). دەتوانین (پارادایم) وەها بناسێنین وەك ئەوەی تیۆریایەكی نمونەیی باڵا بێت كە بەدرێژایی قۆناغێكی دیاریكراو قورسایی لەسەر بیركردنەوەی لێكۆڵیاران دەبێت و بەو تیۆریایەش یان بەو پارادایمە هەموو شتەكان تەفسیر دەكەن. هەر كاتێكیش ئەو پارادیمە تێكشكاو پاشەكشەی كرد ئەوا تیۆریایەكی نوێ یان پارادیمێكی تازە بۆ تێگەیشتن لە دیاردە و شتەكان، دێتە ئاراو شوێنی دەگرێتەوە. بۆ نمونە ئێمە دەتوانین باس لە (پارادایمی ئەرستۆتالیسی)و (پارادایمی گالیلۆ) و (پارادایمی نیوتن) و (پارادایمی ئەنشتاین) بكەین. هەریەك لەو پارادایمانە لەسەروەختی خۆیدا (واتە ئەو كاتەی شێوازی بیركردنەوەی ئینسانەكانی دیاریدەكرد)، بۆ تەفسیركردنی جیهان و گەردون بەكاردەهێنران.

كەواتە (پارادایم) واتە ئەو سستمی بیركردنەوەیەی لە قۆناغ و لە ژینگەیەكی دیاریكراودا باڵا دەستە، ئەمەش بەو چەمكی ئەبستمیە دەچێت كە "فۆكۆ" هێنایە ئارا. بەڵام كێشەكە لێرەدا نییە، بەڵكو لەوەدایە كە هەریەك لە "میشێل فۆكۆ" و "تۆماس كوهن"، پێیان وایە دابڕانێكی ڕەها و گشتگیر لە نێوان تەواوی ئەو سستمی بیركردنەوانەدا هەیە كە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هاتووە، هەر لە "ئەستۆ" وە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ. ئەوان وای بۆ دەچن هەر سستمێكی بیركردنەوە كە دێت سستمی بەر لە خۆی مەحف دەكاتەوە و شوێنی دەگرێتەوە. بەڵام ئاخر كەی ڕێی تێدەچێت ڕایەڵێك لە بەینی دوو قۆناغدا نەبێت، كە بەدوای یەكتریدا بێن؟ چۆن دەبێت دابڕانێكی ڕەها و عەدەمی هەبێت؟ دەبێت هەمووشتێك بەیەكجار كۆتایی بێت، وەكو ئەوەی هەر نەبووبێت؟ ئەمانە پرسیارگەلێكن كە تا ئێستا و پتر لە بیست ساڵە، ناوەندە ئەبستمۆلۆژیەكانی خۆرئاوای بەخۆیەوە سەرقاڵكردووە.

من لای خۆمەوە نایشارمەوە، لایەنگری ئەو چارەسەرەم كە زانای فەرەنسی "جیل گاستۆن گرانجیّ" مامۆستای ئەپستمۆلۆژیای بەراوردكاری لە كۆلیژ دوفرانس، پێشنیاری كرد.. "گرانجیّ" ڕەخنە لە بۆچونی "فۆكۆ" و "كوهن" دەگرێت، دەربارەی چەمكی دابڕانی ئەبستمۆلۆژی و پێیوایە هەردووكیان زیادەڕۆیی دەكەن، كاتێك وەك پرۆسەیەكی ڕەها و گشتگیرمامەڵەی لەگەڵدا دەكەن. ئەمە "گرانجیّ" ناچار دەكات بڵێت: (هەردووكیان سەر بە باڵی توندڕەو یان ڕادیكاڵی یا خود نا ئەقلانی، ئەبستمۆلۆژین). ئەو پێیوایە دابڕانێكی گشتگیرو ڕەها لە نێوان تیۆریا زانستیەكاندا نییە (یان لە نێوان پارادایمەكان بە زمانی كوهن، یاخود لە نێوان ئەبستیمەكاندا بە بۆچونی فۆكۆ)، بەڵكو هەموو تیۆریایەكی نوێ بە جۆرێك لە جۆرەكان بڕێك لە تیۆریای كۆنی تێدایە و هەوڵی لە خۆگرتنی دەدات، بە مەبەستی تێپەڕاندنی. "گرانجیّ" تەنها دان بە بوونی دابڕانێكی ڕەهاو مەزندا دەنێت: ئەویش ئەوەیە كە لە ساڵی 1632 لەسەر دەستی "گالیلۆ" ڕویداو بووە دەسپێكی زانستی نوێ.

شۆڕشی گالیلۆیی، توانی سەر لە بەر زانستی ئەرستۆ تالیسی ڕابماڵێت، تەنانەت بووە مایەی ئەوەی ئیشکالیەتی ئەرستۆ تالیسی لە ڕەگ دەربهێنێت، ئەمەش بووە سەرەتایەکی تازە: بۆیە ناکرێت ئەم دابڕانە مەزنەی "گالیلۆ" لەگەڵ "ئەرستۆ"دا دروستیکرد، بەو دابڕانە بەراورد بکرێت کە لە نێوان "نیوتن" و "گالیلۆ" یاخود لە نێوان "ئەنشتاین" و "نیوتن"دا ڕوویدا. چونکە "نیوتن" و "ئەنشتاین" هەردووکیان دەچنە چوارچێوەی ئەو دابڕانە مەزنەی "گالیلۆ"ی ڕابەری زانستی نوێ دروستی کرد. سەرەڕای ئەو پێشکەوتنە بەرچاوەی "نیوتن" بەراورد بە "گالیلۆ" هێنایە ئارا، بەڵام بەشێوەیەکی تەواوەتی لێی دانەبڕا، وەك ئەوەی "گالیلۆ" لەگەڵ "ئەرستۆ"دا کردی. دەتوانین دەرهەق بە "ئەنشتاین" و "نیوتن"یش هەمان شت بڵێین. ئەمە ئەو بۆچوونەیە کە لە ئێستادا سەبارەت بە چەمکی دابڕانی ئەپستمۆلۆژی لە بواری زانستەکانی وەك: (ماتماتیك، فیزیا، کیمیا)دا هەیە.. ئەی دەبێت دەربارەی چەمکی دابڕان لە کایەی فەلسەفە و زانستە – مرۆڤایەتیەکاندا چی بڵێین؟

لە ڕاستیدا ئەو شۆڕشە زانستیە مەزنەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەمدا ڕوویدا، لە نێوەی دووەمی هەمان سەدەدا، گوازرایەوە بۆ کایەی فیکر و فەلسەفە. وەکو لە سەرەتای ئەم نەسکەدا ئاماژەمان پێدا، شۆڕشی زانستی لە ئەورووپا پێش شۆڕشی فەلسەفی کەوت. لە ئەورووپا هەموو شتەکان وەك ئەوە وەهابوو کە "کیبلەر" و "دیکارت" و "گالیلۆ"، پێویستیان بەوە بوو بێت شۆڕشی سیاسی و ئاییینی واز لێبێنن، بۆ ئەوەی دەست کراوە بن بۆ شۆڕشێکی زانستی پەتی. لێرەدا دەکرێت ئەو لێدوانانەی "دیکارت" بە بیر بهێنینەوە کە تیایدا باس لە دڵسۆزی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ ئایینی مەسیحی دەکات. بۆ نموونە لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (وتارێك دەربارەی میتۆد) دەڵێت: (یەکەمین پرانسیپێك پەیڕەوم کردبێت ئەوەیە لە یاسا و ترادسیۆنی وڵاتەکەم لانەدەم و لەسەر ڕێبازی ئەو ئاینەش بەردەوام بم کە یەزدان لە منداڵیمەوە لە ناخمدا چاندی، هەروەها لە سەرجەم کایەکاندا ئەو بۆچونانە تەبەنی کەم کە زۆر نەرم و میانڕەون و دوورن لە شەڕانگێزی و توندڕەوی)(1).

ئەم پیاوەی یەکەمین شۆڕشی لە فیکری مۆدێرندا بەرپا کرد، لێرەدا چەند میانڕەوو موحافیزکارە و تەنانەت بۆ هەندێکیش، بە کۆنەپەرست دێتە بەرچاو؟ چۆن دەتوانین لەم هەڵوێستە دژوار و ناکۆکەی حاڵی بین؟ ئەو لەلایەکەوە باس دەکات و دەڵێت: (دەمەوێت هەموو شتێك بخەمە ژێر گومانەوە)، کەچی لەلایەکی ترەوە ئەوە دەدات بە گوێی خەڵکیدا کە هیچ لە عادات و تەقالیدی وڵاتەکەی ناگۆڕێت! بە کورتی لێرەدا دەتوانین بڵێین: (لە باریدا نەبوو بە یەکجار هەرچی شۆڕشە بیکات). ئەوەی خەمی گەورەی ئەو بوو، شۆڕشی زانستی بوو. بەڵام بیرو بۆچوونەکانی هەڵگری تۆوی شۆڕشی کۆمەڵایەتی و ئاییینی و سیاسی بوو، کڵێساش لە تێگشتنیان بە هەڵەدانەچوو. کاتێك کڵێسا هەستی بەڕادەی مەترسی بۆچونەکانی "دیکارت" کرد، ساڵی 1662 کتێبەکانی خرایە لیستی کتێبە قەدەغەکراوەکان، ساڵی 1667 (واتە بیست ساڵ دوای مردنی)، "لویسی چواردە" خوێندن و وتنەوەی فەلسەفەی "دیکارت"ی لە زانکۆکانی فەرەنسادا قەدەغە کرد. بەڵام ئەو تۆوی گومانەی لە بواری زانستدا چاندبووی، دواتر بەکایەی فیکری ئاییینی و

سیاسی و کۆمەڵایەتیش گەیشت. ئەوە بوو بیریار گەلێکی مەزنی وەك "سپینۆزاو پییربایل" قۆستیانەوەو ئاگریان لە هەموو شوێنێك بەردا. بەم پێیە دەتوانین باس لە دابڕانێکی فیکری بکەین لە نێوان ساڵانی 1685 و 1715دا، ئەمەش بۆ خۆی دەسپێکی سەرەتا بوو بۆ سەردەمی گەورەی ڕۆشنگەری.

ئەو شۆڕشە زانستیەی دەوروبەری ساڵی 1620 ڕوویدا، تەنها هۆکارێك نەبوو بۆ لەقکردنی پایەکانی ئایینی مەسیحی، بەڵکو هۆکاری دیکە هەبوو کە پەیوەندی بە ئایین خۆیەوە هەبوو، یان دەتوانین بڵێین پەیوەندی بە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی پیاوانی ئایینیەوە هەبوو. چونکە پیاوانی ئایینی لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا، شتێکیان دەوت و شتێکی تریان دەکرد. واتە ڕەفتاریان پێچەوانەی قسەکانیان بوو، ئەمەش وایکرد لای زۆربەی ڕۆشنبیران متمانەیان نەمێنیَ و ڕاستگۆیی خۆیان بدۆڕێنن. ڕاستە لای خەڵکانی ئاسایی سەنگ و قورساییان مابوو، بەڵام گومان لە ناخیاندا چەکەرەی کردبوو، بە تایبەت ئەوانەی خوێندەوارییەکی باشیان هەبوو. مەسەلەکان زیاتر پەرەیان دەسەند، تا لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدە و سەردەمی ڕۆشنگەریدا، گەیشتە قۆناغی قەیرانێکی ئاوەڵاَ. لێرەدا نابێت ئەو حوکمە بەسەر سەرجەم پیاوانی ئایینیدا بدەین، چونکە هەندێکیان ئیمانداری ڕاستەقینەبوون و زاهیدانە دەژیان، بەڵام زۆربەی زۆریان بنەما سەرەکیەکانی ئایینیان لە بیرکرد و لە جەوهەری دین دورکەوتنەوە. ئەمە ئەو شتەیە دواتر "سپینۆزا" زۆر بە توندی سەرکۆنەی دەکات. هاوکات قەشەکان بوونە خاوەن پارەو پولێکی زۆر و ژیانێکی شاهانە دەژیان لە کۆشکەکانی ڤاتیکان یان لە کۆشکی پاشاکان یاخود لە کۆشکە تایبەتیەکانی خۆیاندا، بەڵام ئەو شتەی وێنەی ئایینی مەسیحی لەبەرچاوی خەڵکی خست، ئەو ڕووداوە دەستەجەمعیە گەورانە بوو کە ئەوروپای هەژاند، ڕووداوەکانیش بریتی بوون لە: (شەڕی نێوان ئاینزاکان، دادگاکانی پشکنین، ڕاوەدوونانی زانایان و بیریاران و سوتاندن یان پاکتاوکردنیان). ئەم شتانە تێکڕا خەڵکیان والێکرد نەك تەنها گومان لە پیاوانی ئایینی بکەن، بەڵکو گومان لە خودی بیروباوەڕی مەسیحیەت خۆشی بکەن. دواتر لە پای ئەمە مەسیحیەت باجێکی گەورەیدا. باجی دەمارگیری و توندڕەوی و داخرانی ئەقڵی ئەوانەی خۆیان بە دەمڕاستی دەزانی. دەستەبژێرەکانی کۆمەڵگا لەوە تێنەدەگەیشتن چۆن دەبێت کاتۆلیکیەك بەناوی ئینجیل یان مەسیح یان ئیمانەوە، پرۆتستانت مەزهەبێت بکوژێت، لە کاتێکدا ئەو پرۆتستانتیە وەك ئەو ئیماندار و مەسیحیە!.. ڕاستە سەر بە ئاینزایەکی دیکەی مەسیحیەتە و بە ستایلێکی جیاواز سروتە ئایینیەکانی بەجیَ دێنێت، بەڵام باوەڕی بە یەزدانو ئینجیل و مەسیح هەیە.. چۆن دەبێت ئیمان مرۆڤ هانبدات یەکتری بکوژن؟ ئایا ئەمە دەچێت بە ئەقڵدا؟ بەمجۆرە گومان لە ناخی مرۆڤەکاندا کنەی دەکرد.

لێرەدا پێویستە ئاگامان لەوە بێت کە کاتۆلیك مەزهەبە فەرەنساییەکان، دوای هەڵوەشاندنەوەی بڕیارنامەی بەناوبانگی نانت لە ساڵی 1685دا، بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە کەوتنە پاکتاوکردنی هاوڵاتیانی پرۆتستانت مەزهەبی وڵاتەکەیان. ئەوەی واژۆی هەڵوەشاندنەوەی کارکردن بەو بڕیارەشی کرد، پادشای بەناوبانگ، پادشای خۆر "لویسی چواردە" بوو. "لویس" پێی وا بوو ئەوە هەنگاوێکی گرنگ و پێویستە لە پێناو کۆکردنەوەی

شانشینی فەرەنسی لە دەوری ئاینزای کاتۆلیکی و کەسایەتی پیرۆزی پادشا. بۆ ئەم مەبەستەش ئەم دروشمە هەڵکرا: یەك پادشا، یەك ئیمان، یەك یاسا. ئەو کات بە ناچاری بەشێکی زۆری پرۆتستانتیەکان دەستبەرداری ئاینزای خۆیان بوون و بوونە کاتۆلیکی، لە پێناو پاراستنی سەرو ماڵیاندا. پیاو ژن و منداڵێکی زۆری پرۆتستانتیەکان، لەسەر دەستی میلیشیا کاتۆلیکیە توندڕەوەکان کوژران. ئەوانەشی بەرنەکەوتن، بەرەو وڵاتانی باکوری ئەوروپا هەڵهاتن، بە تایبەت بۆ ئەڵەمانیا و هۆڵەندا. ئەوانە دوو وڵاتی پرۆتستانت مەزهەب بوون و بەمەش بوونە پەناگەیەکی ئارام بۆ پرۆتستانتەکانی فەرەنسا. ئەوانەی هەڵهاتبوون کەسانی ڕۆشنبیر و دەست ڕەنگینەکان بوون. فەرەنساش بە ڕۆشتنی ئەوانە زیانێکی زۆری بەرکەوت. هەروەها ئەفسەر و بازرگان و پیشەوەر و ڕۆشنبیریان تێدابوو، ژمارەیان بە دووسەد هەزار کەس مەزەندە دەکراو ئەمەش بۆ ئەو سەردەم و ڕۆژگارە، ژمارەیەکی تەواو زۆر بوو. بەشێکی کەش لەوانە ڕوویانکردە ئنگلتەراو سوید و کەنەدا.

دواتر فەرەنساییەکان لەم کارەیان پەشیمان بوونەوە و ئەوە بە پەڵەیەکی ڕەش دەزانن، بە مێژووی خۆیانەوە. مێژوونووسانی ئەمڕۆی فەرەنسا دان بەوەدا دەنێن کە زۆربەی کاتۆلیك مەزهەبەکان ڕایان لەگەڵ ئەوەدا بووە، پرۆتستانت مەزهەبەکان سەرکوت بکرێن و لەناو ببرێن. ئەمەش ئەو بۆچونە باوە بەدرۆ دەخاتەوە کە دەڵێت: (میللەت دەمارگیر نییە و ئەو کارانە ئۆباڵی بە ئەستۆی سیاسەت و حوکمڕانەکانە). بێگومان هەندێ کات میللەت توندڕەو دەمارگیرەو کاتیش هەیە لێبوردە و کراوەیە، هەموو ئەمانەش گرێدراوی جۆری بارودۆخەکە و ئاستی ئەو میللەتەیە، لە ڕووی ڕۆشنگەری و فیکری و کۆمەڵایەتی و ئابووریەوە. توندڕەوی و دەمارگیری پەتایەکە گەر زەمینەی هەبێت، زۆر زوو تەشەنە دەکات، بەڵام گەر ئەو هەلومەرجەمان نەهێشت کە توندڕەوی بەرهەم دێنێت، ئەوا بارودۆخەکە دەگۆڕێت. کەواتە سوکایەتی پێکردن نییە گەر بە میللەتێك بڵێین لە قۆناغێکی مێژوویدا بە دەست پەتای توندڕەوییەوە گیرۆدە بووە، گەروا بوایە ئەوا مێژوو نوسانی فەرەنسا لە ئێستادا شەرمیان لە مێژووی خۆیان دەکرد، یاخود ساختەکاریان لە نوسینەوەی مێژووی خۆیان دەکرد و حاشایان لەوە دەکرد کە کاتۆلیکیەکان زەبریان بە پرۆتستانت مەزهەبەکان گەیاندبێت. ئەوان ئەوە ناکەن و ئەوە دەنووسنەوە کە بەحەقیقی ڕوویداوە، بۆ ئەوەی پەندی لێوەربگرن.

لێرەدا دەکرێت بڵێین قەسابخانەی (سانت بارتێلمی)، لە دزێوترین ئەو تاوانانەیە کە کاتۆلیکەکان دەرهەق بە پرۆتستانت مەزهەبەکان کردیان. قوربانیەکانیشی لە ماوەی سێ ڕۆژدا و تەنها لە شارێکی وەك پاریسدا، سێ هەزار کەس بوو. لە پای ئەم قەتڵوعامەشدا پاپا "گریگۆریۆسی سیازدەهەم" ستایشی پرۆسەکەی کردوو، ڕایگەیاند: (ئیمانی ڕاست و دروست بەسەر لادەر و گومڕاکاندا سەرکەوت). شەڕی ئاینزاکان هەر بە فەرەنساوە نەوەستا، بەڵکو ئەڵەمانیا و ئینگلتەراو ئیرلەنداشی گرتەوە. شایەنی باسە تا هەنووکە ئەو شەڕە لە ئیرلەندا بەردەوامە. ئەمەش شتێکی سەیرە، چونکە تێکڕای وڵاتانی ئەوروپایی، سەردەمی شەڕی ئاینیان جێهێشتووە، تەنها ئایرلەندا نەبێت.

دووەمین هۆکار کە بووە مایەی قەیرانی هوشیاری ئەوروپی و وایکرد مەسیحیەت زۆر لە

پلەو پایەی خۆی بدۆڕێنێت، وەکو پێشتریش باسمانکرد، پەیوەندی بە دادگاکانی پشکنین و پاکتاوکردنی بیریاران و زانایانەوە هەبوو کە بە تۆمەتی کوفر و لادان لە ئایین تاوانبار دەکران. شایەنی باسە دادگاکانی پشکنین لە بنەڕەتدا دادگای ئایینی بوون و ساڵی 1235 پاپا "گریگۆریۆسی نۆیەم" دایمەزراند و بەستیەوە بە ڤاتیکانەوە. نمونەی ئەم جۆرە دادگایە لەسەرجەم وڵاتانی کاتۆلیك مەزهەبدا بڵاوبووەوە، بە تایبەت لە ئیسپانیا. ئامانجی ئەم دادگایە تەمێکردنی ئەوانە بوو کە گومانی بێباوەڕییان لێدەکراو لە ئایین لایاندا بوو، چونکە ئەمانە وەك مەترسیەك بۆ سەر کۆمەڵگە و یەکیەتی نەتەوە سەیر دەکران. لەم پێناوەشدا دەسەڵاتی ئایینی و دەسەڵاتی سیاسی کەوتنە هاوکاریکردنی یەکدی، بەو پێیەی کە کوفرو لادان لە ئیمان، هەر بە تەنها هەڕەشە لە ئایینی مەسیحی ناکات، بەڵکو هاوکات مەترسیە بۆ سەر یەکیەتی دەوڵەت یاخود وەکو ئەوەی لە ئێستادا دەوترێت (ئاسایشی دەوڵەت دەخاتە مەترسیەوە).

لەم سەروبەندەدا قەشە "تۆمای ئەکوینی" بە خۆی فتوای داو شەرعیەتی دایە دادگاکانی پشکنین، وەکو ئاشکراشە "تۆمای ئەکوینی" لەناو ئاینزای کاتۆلیکیدا، سەنگ و قورساییەکی ئایینی گەورە و گرانی هەیە. وەکو باسدەکرێت لە نێوان ساڵانی (1570 و 1630)دا، واتە تەنها لە ماوەی شەست ساڵێکدا، پەنجا هەزار کەس بوونە قوربانی دادگاکانی پشکنین. ئەوانەی دەبرانە ئەو دادگایانە، یەکەمجار سزادەدران و پاشان دەیانسوتاندن. لە یادەوەری گشتی ئەوروپیەکاندا دادگاکانی پشکنین، بەدترین و ڕەشترین کاریگەریان بەجێهێشت..

لەلایەکی ترەوە "گالیلۆ"ش لە دەست ئەو دادگایانە قوتاری نەبوو، تا ئەو کاتەی لە بۆچوونەکانی سەبارەت بە خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا پەشیمان بووەوە. هەروەها "جۆردانۆ برۆنۆ"ش ساڵی 1600 لە شاری ڕۆما، بە زیندویەتی لە ناو ئاگردا سوتێنرا. ئەم هۆکارانە لە ناوەوە بوونە مایەی داخورانی مەسیحیەت، بەڵام لە دەرەوەش هۆکاری دیکەش هەبوو. ئێمە سەرەتا باسمان لەوە کرد کە پرۆژەی گەورەی ڕابەرانی زانستی مۆدێرن، ئەوە بوو بە ئاشکرا خۆیان لە قەرەی دوو مەسەلەی زۆر هەستیاری وەك: (ئایین و سیاسەت) نەدەن. باسمان لەوەشکرد کە "دیکارت" هەڵویستێکی موحافیزکارانەی لەو دوو مەسەلەیە وەرگرت و دواتر بە خراپ بە سەریدا شکایەوە و بووە جێگەی ڕەخنە و گازندە. ڕاستیەکەی ئەوە تەکتیکێکی زیرەك و سەرکەوتوانەی "دیکارت" و "گالیلۆ" و "کیپلەر" بوو، هەر ئەمەش وایکرد لە سزادان و مەرگ قوتاریان بێت و بتوانن بە دڵنیاییەوە خەریکی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە زانستیەکانیان بن. بەڵام ئەمە هەڵویستی "جۆردانۆ برۆنۆ" نەبوو، کە سەرەڕۆیی کرد و باجێکی گەورەی ئەو سەرە ڕۆییەشیدا.

پاش ئەوەی ئەم پرۆژە مەزنە سەری گرت و جیهانبینی کۆنی بۆ دنیا ڕاماڵی، ئەوا زۆر بە ڕوونی بۆمان ئاشکرا دەبێت کە جیاوازی لە نێوان جیهانبینی نوێ بۆ دنیا لەگەڵ هەلومەرجی تەقلیدی میللەتانی ئەوروپاییدا هەیە. ئەم هەلومەرجەش لە ڕووی سیاسیەوە قابیلی قبوڵ نەبوو، بوونی ئەو کەلێن و جیاوازیەش نەدەکرا هەروا بەردەوام بێت. دوای ئەوەی شۆڕش لە کایەی زانستدا بەرپا بوو، لەسەر دەستی هەریەك لە: (گالیلۆ و دیکارت و کیبلەر و لایبنتز و هیوجین و نیوتن)، ئەستەم بوو

له كايەكانی تردا شتەكان وەكو خۆیان بمێننەوە. بە مانایەكی دی شۆڕشی زانستی، شۆڕشی ئایینیو شۆڕشی سیاسی دەخواست، بۆ ئەوەی گەشەسەندن و بەرەو پێشچوون لەسەر هەموو ئاستەكان چونیەك و وەك یەك بێت. ئەمەش لە بەراییەكانی سەردەمی ڕۆشنگەریدا هاتە دی. ڕۆشنگەریش بۆ مەیسەركردنی ئەو پرۆسەیە هات.

لە دوای سەردەمی "دیكارت"، سەردەمی "سپینۆزا" دەستی پێكرد.. "دیكارت" شۆڕشەكەی لە بواری زانستدا قەتیس دابوو، پاشان "سپینۆزا" هات بۆ ئەوەی بەرفراوانتری بكات و بواری سیاسەت و ئایینیش بگرێتەوە. بەم پێیە "سپینۆزا" بۆ خۆی كەسێكی دیكارتیە، بەڵام بە شێوازی تایبەتی خۆی. هەروەها دەكرێت بڵێین "سپینۆزا" نەبوایە، نە "ڤۆڵتێر" دەبوو نە سەردەمی ڕۆشنگەری. تەنانەت هەندێك پێیان وایە "سپینۆزا" زۆر لە "ڤۆڵتێر" بوێرتر و چاونەترستر بووە. با لێرانە بپرسین، دروست لە ساڵی 1680دا چی ڕویدا؟ ئەی لە نێوان ساڵانی 1685 و 1715 دا چی قەوما؟ ئەوەی ڕویدا، ئەقڵانیەتێكی نوێ هاتە ئارا، ئەقڵانیەتێكی نامەسیحیانە و تەنانەت ئەنتی مەسیحیانەش. بەمجۆرە گەورەترین قەیران لە هۆشیاری ئەورووپیدا دروست بوو. قەیرانێك كە بەدرێژایی مێژووی خۆی، ڕوونیەدابوو. بەڵام ئەو قەیرانە چارەسەر یاخود سەرەتایەكی تازەی لێكەوتەوە. نهێنی باڵادەستی و سەركەوتنی ئەورووپاش لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. ئێمە لە سەرەتای ئەم كتێبەدا باسمان لەوە كرد كە ڕەنگە قەیران و تەنگەژە ببێتە مایەی مردن و تیاچوون، بەڵام لەوانەشە هەستانەوە و سەرلەنوێ ژیانەوەی لێ بكەوێتەوە. ئەگەر بە دیوی دووەمدا كەوتەوە ئەوا ئەنجامەكەی زۆر پۆزەتیڤانە دەبێت. مرۆڤی ئەورووپایی (یاخود بیریارانیان)، ئیمانێكی نوێیان لەسەر داروپەردوی بیروباوەڕی كۆنی مەسیحی دروستكرد. پەرجویی ئەزمونی ئەورووپایی كە بۆتە جێ باسی هەموو لایەك، لەمەدایە. لەو كاتەی خەڵكی پێیان وا بوو ڕۆحی ئەورووپایی مرد، پاش ئەوەی خۆی تێكشكاند و كەوتە ڕەخنكردنی میراتیە ئایینیەكەی بە توندترین شێوە، لەو كاتەدا سەر لە نوێ ئەو ڕۆحە زیندوو بووەوە، بەڵام بە فۆرمێكی زۆر لیبرال و تەندروست و چاپوكانەوە. ئەمە قەیرانی تەندروست و ڕاستەقینەیە، چونكە نەتەوە و پیاوانی نەتەوە دروست دەكات و هێزێكی ناوەكی كەم وێنەش لە ناخیاندا دەچێنێت. ئەو ئیمانە نوێیەی دوای گێنگلدان و ناهەمواریەكی قورس دێت، ئەوە تەنها ئیمانی ڕاستەقینەیە، چونكە باجێكی گەورە و گرانی ویستووە.

بە درێژایی ئەم كتێبە هەوڵدەدەین سەربوردەی ئەم كێشە و ململانێیە باس بكەین، كە بووە مایەی دەسپێكی قۆناغێكی تازە. بۆ ئەمەش ماڤ قسە كردن دەدەینە هەردوولا: واتە بیریارانی ڕۆشنگەریو بیریارانی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی. لەم سەروبەندەشدا دەبینین چۆن چۆنی ئەوانە كێشەكانی نێوانیان براندۆتەوە و ئەو بەهانانە چی بووە كە لە پێناو بردنەوەی ئەو ململانێیەدا هێناویانەتەوە. هەروەها تێدەگەین چۆن دواجار ئەو كێشەیە لە بەرژەوەندی ڕۆشنگەری و هێزە تازە پێگەیشتووەكانی كۆمەڵگە و پاشان لە بەرژەوەندی ئاقاری ئەقڵانی لە مەسیحیەتدا، شكایەوە.

ئەورووپاییەكان وەكو ئێمە و مانان پێمانوایە، هەر هەموویان دەست بەرداری مەسیحیەت نەبوون، بەڵكو ئەوەی ڕویدا مەسیحیەت بووە مەسیحیەتی پاش ڕەخنەی مێژوویی، نەك بەر لە ڕەخنەی مێژوویی. ئەم مەسەلەیەش پێویستی بە

تاوتوێکردنی زیاتر و تایبەت هەیە، بۆ ئەوەی بزانین نوێبونەوەی تیۆلۆژی لە ئاینی مەسیحیدا چۆن ڕویدا، بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی لەگەڵ سەردەمەکەدا بگونجێنێت یان لەگەڵ مۆدێرنەی زانستی و فەلسەفیدا هەڵبکات. بەڵام بەر لەوە پێویستە کەمەکێك بگەڕێینە دواوە، تا بزانین چۆن چۆنی ئەوروپا توانی لە ڕێگای ئەو دابڕانە ئەپستمۆلۆژیە مەزنەی لە سەرەتادا ئاماژەمان بۆ کرد، لە هەلومەرجی ئەقڵی سەدەکانی ناوەڕاست بێتە دەرێ و ئەو قۆناغە جێ بهێڵێت.

## چەمکی ڕۆشنگەری و ماناکانی لە فیکری ئەوروپیدا

توێژەری بەلجیکایی پرۆفیسۆر "ڕۆلان مۆرتی"[2]، پێیوایە سەدەی هەژدە یەکەمین سەدەیە لە مێژوودا هەست بە قەوارە و تایبەتمەندی خۆی بکات. هاوکات هەست بکات پەیامێکی گەورە و گرنگی بۆ مرۆڤایەتی لەسەر شانە، کە ئەویش ڕۆشنگەریە. سەدەی هەژدە یەکەم سەردەمە بەرنامەی کارێکی دیار و ئاشکرای بۆ خۆی فۆرمەلە کردبێت، ئەویش لە ڕێگای نوسینی فەیلەسوفان و مشتومڕە فیکرییەکانیانەوە. چەمکی ڕۆشنگەری لە بنەڕەتدا، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم. بۆ ئەوەی لە ڕۆشنگەری تێبگەین، پێویستە ڕوناکی بەتاریکی بەراورد بکەین. بەڵام هاوکات دەبێت ئەوەش بزانین کە تێرمی ڕۆشنگەری هەڵگری مانای ئەخلاقی و ئەپستمۆلۆژیشە.

ئەو ناکۆکیەی لە نێوان ڕوناکی و تاریکیدا هەیە، بەو ناکۆکیە دەچێت کە لە نێوان چاکە و خراپە، یان ڕاست و هەڵە، یاخود زانین و نەزانیندا، دەبینین. وا دیارە چەمکی ڕۆشنگەری لە سەرەتادا چەمکێکی ئایینی بووە، بەڵام لەسەر دەستی فەیلەسوفان لە ڕۆژگاری ئەقڵدا (واتە لە سەدەی هەژدەدا) بە عەلمانیکراوە. بۆ نمونە لە (سفر التكوين)دا هاتووە: (ثم وجد الله أن النور حسن، و فصل بين النور و الظلمات). بەو پێیەشی یەزدان ئەفرێنەری ڕوناکیە، ئەوا پیرۆزترین سیفەتەکانی خۆی لە ڕوناکیدا بینیوەتەوە. هەر لە بەرئەوە یەزدان لە تەوراتدا خۆی بە (ڕوناکی سەرمەدی) ناو دەبات. سەر وەختێکیش ئینجیل هات هەمان شتی دووبارە کردەوە، کاتێك "مەسیح" دەربارەی خۆی وتی: (من ڕوناکی جیهانم. ئەوەی شوێنم بکەوێت، مەحاڵە بە تاریکیدا ڕێ بکات، بەڵکو ڕوناکی ژیانی دەسگیر دەبێت).

هەر سەبارەت بەم مەسەلەیە پرۆفیسۆر "مۆرتی" دەڵێت: (ئەم چەمکە ئاینییە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست، لە نوسینی تیۆلۆژیستە مەسیحیەکان و عارفەکاندا بەردەوام بوو. ئەمەش بەڵگەی ئەو وەحیە ڕۆشنەیە کە سروشت و ئامانجی مرۆڤ لەم دنیاو ئەو دنیا، بۆ ئینسانەکان ڕوناك دەکاتەوە. هەروەها ئەو ئەرکانەشی نیشان دەدات کە لە سەر شانیەتی. بەمجۆرە تیۆلۆژیستەکان کەوتنە باسکردنی نوری یەزدانی — و- نوری ئیمان، کە لە مێژوودا خۆی نیشانی هەندێ کەسایەتی تایبەت و هەڵبژاردەی وەك پێغەمبەران و گەورە عارفان دەدات. بەڵام ڕەنگە تێرمی ڕۆشنگەری ئاماژەیەك بێت بۆ کەلەپووری ئایینی کڵێسای مەسیحی، هەر بۆیە هەندێکیان دەڵێن: ڕوناکی ئیمان و ئینجیل، تاریکایی لەسەر ڕووی ڕەگەزی ئینسانی ڕاماڵی و نابینای کردن).

ئێستاکێ ئەم پرسیارە دەکەین: ئەم تێرمە بەناوبانگە چۆن لە فەرهەنگی ئایینی کۆنەوە بۆ فەرهەنگی فەلسەفی مۆدێرن گواسترایەوە؟ بە

واتایەکی دی چۆن بە عەلمانی یاخود بە ئەقڵانی کراو لەسەر دەستی کێ ئەو پرۆسەیە ئەنجام درا؟

پێدەچێت "دیکارت" (1596 - 1650) یەکەم کەس بێت، چەمکی ڕۆشنگەری بە مانا نوێیەکەی بەکارهێنابێت بۆ نموونە ئەو باس لە ڕوناکی سروشتی دەکات و مەبەستیشی لە ڕوناکی سروشتی: (کۆی ئەو حەقیقەتانەیە کە مرۆڤ تەنها لە ڕێی بەکارهێنانی ئەقڵەوە پێیان دەگات). بەڵام "دیکارت" ئەم چەمکە وەکو چەکێك لە دژی ئایین یاخود پیاوانی ئایینی بەکارناهێنێت، وەك ئەوەی دواتر "ڤۆڵتێر" و "دیدرۆ" دەیکەن، بەڵکو لە چوار چێوەی ڕێزگرتنێکی تەواوی بەها ئایینیەکان، بەکاردێنێت. بۆ نمونە لە کتێبەکەیدا (پرانسیپەکانی فەلسەفە)، دەڵێت: (بەهرەی زانین کە خوا پێیداوین و ئێمە پێیدەڵێین ڕوناکی سروشتی، تەنها ڕووی ڕاستەقینەی شتەکانمان نیشان دەدات). دوای "دیکارت" "لایبنتز" دێت (1646-1716)، بۆ ئەوەی هەمان بۆچوون دووبارە بکاتەوە و بڵێت: (ئەقڵ بریتیە لە زنجیرەیەك بەڵگە نەویست کە بە هۆی ئەو روناکیە سروشتیەی یەزدان پێیبەخشیوین، پەی پێدەبەین). بەڵام لە ناو تێکڕای خوێندکارەکانی "دیکارت"دا، دەبینین "مالبرانش" (1638-1715) زیاد لەوانی دیکە چەمکی ڕۆشنگەری بەکار هێناوە و عەشقی زۆری بۆی هەبووە.. لای "مالبرانش" ئەم چەمکە زۆر دووبارە دەبێتەوە، تا ڕادەی ئەوەی هەردوو چەمکی سروشت و ئەقڵ تێدەپەڕێنێت.

ئەوەی جێ سەرنجە لای پیاوێکی ئایینی گەورەی وەك "مالبرانش"، ئەوەیە چەمکی ڕۆشنگەری لای ئەو لەسەر و چەمکی دادپەروەری و گوناهەوە دێت. بالێرەدا چەند نمونەیەك بهێنینەوە لەسەر ئەوەی خاوەنی کتێبی (گەڕان بەدوای ڕاستیدا)، چۆن ئەم تێرمەی بەکارهێناوە: (پێویستە مرۆڤ هەموو شتێك بە پێی ڕوناکی ناخی هەڵسەنگێنێ، بەبێ گوێدانە حوکمی هەڵەو نادروستی هەست و خەیاڵی). هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت: (ئێمە بە ڕۆح دەڵێین ئەقڵ، کاتێك خۆبەخۆ کاربکات، یاخود کاتێك یەزدان کاری تێدا دەکات لە ڕێی ئەو ڕۆشناییەی ڕوناکی دەکاتەوە). پاشان دەربارەی یەزدان دەڵێت: (ڕوناکی ئەو چەند ڕون و ڕەوانە، ئەوەندەش پاك و بێگەردە.. بەڵام حەز و ئارەزووەکانمان ڕێگە نادەن چاوکراوە بین و تاریکیەکانیان ڕێگرە، بتوانین بە نوری ئەو خۆمان ڕوناك بکەینەوە). نمونەی تر زۆرە، بەڵام ئەوەی لێرەدا سەرنجی دەدەین ئەوەیە ڕۆشنایی سروشتی ئەقڵی مرۆڤ، بەشێوەیەکی کۆنکرێتی پاشکۆی ڕوناکی یەزدانیە و دەرگیری ئەوە. هۆکاری ئەمەش ڕون و ئاشکرایە، ئەویش ئەوەیە "مالبرانش" لە خۆیدا ئەقڵانیەتێکی دیکارتی توند و تۆڵ و بیر و باوەڕێکی ئایینی نەلەخشاوی کۆکردۆتەوە. ئەڵبەتە ئەوەی لەوە دەکەوێتەوە ئەوەیە کە لە بەهای خەیاڵ و ویژدان کەمدەکاتەوە و تەنها بایەخ بە ئەقڵ دەدات. لێرەوە ئەقڵانیەتی "مالبرانش" سەرەڕای گرنگی، وەك هەموو دیکارتیەکانی ناو مێژووی فیکر، بە ئەقڵانیەتێکی وشك و برنگ ناونوس دەکرێت.

دواتر بیریاری پرۆتستانتی "پییربایل" دێت (1647-1706)، کە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی فیکردا ڕوناکی سروشتی لە سەرو ڕوناکی میتافیزیکیەوە دادەنێت، بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت ڕوناکی میتافیزیکی فەرامۆش دەکات. ئەم کارەش هەنگاوێکی نوێیە، بە ئاڕاستەی قوتار بوون لە تیۆلۆژیای ئایینی و دواجاریش گەیشتن بە

ئەقلأنیەتێکی پڕاوپڕ. دەتوانین کورتەی بۆچونەکانی "بایل"، لەمەدا کورت بکەینەوە: (ئێمە ناتوانین خوا بناسین یاخود باوەڕی پێ بێنین، گەر پێشوەخت خاوەنی ڕۆشنایی سروشتی ئەقڵ نەبین)، کەواتە یەکەم شت ئەقڵە. بەڵام "بایل" پڕکێشی زیاتر بکات، بۆ ئەوەی بە تەواوەتی ڕوناکی میتافیزیك لە ڕوناکی ئەقڵ جیابکاتەوە، لەبەرئەوەی ئەو مەسەلەیە دەچووە چوار چێوەی ئەوەی مەحاڵ بوو لەسەردەم و ڕۆژگاری ئەودا، بیری لێبکرێتەوە. بەڵام لە سەردەمی "ڤۆڵتێر" و "دیدرۆ"دا، واتە ماوەی کەمتر لە سەدەیەك، بیرکردنەوە لەو مەسەلەیە، دەبێتە شتێکی ئاسایی. بەمجۆرە دەبینین ئەقڵ لە سەرەخۆ دەچێتە پێش، بەڵام هەر دەچێتە پێش. ئەقڵی مرۆڤ لە پڕێکدا لە دەست تیۆلۆژیای ئایینی مەسیحی قوتاری نەبوو، بەڵکو قۆناغ بە قۆناغ مەیسەر بوو. نمونەی ڕوون و ئاشکراش، ئەزموونی فیکری ئەوروپییە کە لێرەدا باسی دەکەین.

چەمکی ڕۆشنگەری گاف گاف لە ژێر هەژمونی ئایینی مەسیحی هاتە دەرێ و بوو بە تایتڵی تەواوی سەردەمێك: ئەو سەردەمەش سەردەمی ئازادی ئەقڵ و فیکربوو لە سەدەی هەژدەدا. ئەو کات بوو بە پرۆژەیەکی فیکری و ڕادیکالی کە دەیوویست مرۆڤی ئەوروپایی و غەیرە ئەوروپایی، لە تاریکە شەوی سەدەکانی ناوەڕاست و دەسەڵاتی پیاوانی کڵێسا دەربهێنێت. بێگومان پڕۆژەیەکی وا بە شێوەیەکی ئاشکرا نەبوو، ئەویش لەبەرئەوەی فەیلەسوفان ترسی دەسەڵات و کڵێسایان هەبوو. ئەم پرۆژەیە بە ئاشکرا تەنها لەسەر دەستی "کۆندۆرسی" فۆرمەلە بوو، ئەویش لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا: (پلانی مانیفێستێکی مێژوویی بۆ بەرەوپێشبردنی ئەقڵی مرۆڤایەتی – 1794).

بۆ ئەوەی ئەو جیاوازیەی نێوان پێشەنگەکانی ڕۆشنگەری و بیریارانی ڕاستەقینەی ڕۆشنگەری ببینین، هێندە بەسە بەراورد لە نێوان "پییر بایل" و لەگەڵ "ڤۆڵتێر" و "دیدیرۆ" و "ڕۆسۆ"دا بکەین. ڕاستە "بایل" لە فەرهەنگە مێژوویی و ڕەخنەییەکەی خۆیدا، بۆچوونێکی ئەقلأنی بۆ ئایین پەیڕەو کرد و ڕەخنەی لە دەسەڵاتی پیاوانی کڵێسا دەگرت، هەروەها ڕاستە ئەو داوای دەکرد بەشێوەیەکی ئازاد ئینجیل تاوتوێ بکرێت و داوای ئازادی فیکر و عەقیدەی دەکرد، لە ڕۆژگارێکدا فەرەنسا دزێوترین تاوانی دەرهەق بە بیریاران ئەنجام دەدا.

بەڵام هێندە بوێرنەبوو بتوانێت پڕکێشییەکی وا بکات، ئەقڵ بەیەکجارەکی لە دەست تیۆلۆژیای کڵێسا ڕزگار بکات. "بایل" دیلی دیدگایەکی ڕەشبینانە و مەسیحیانە بوو، دەرهەق بە مرۆڤ و مێژوو. ئەو لە ئەقڵی ئینسان دڵنیا نەبوو، دەترسا ئەو سنورانە ببەزێنێت کە یەزدان بۆی دیاری کردبوو. ئەو پێی وابوو: (ئەقڵی ئینسان بەبێ کۆمەك و یارمەتی ئەقڵی یەزدان، وێڵ دەبێت و ڕێ وندەکات). بەڵام ئەو پرسیارەش لە جێی خۆیدایە کە دەڵێت: (ئایاڕۆشنگەری ئەورووپی لە بەرامبەر ئەقلأنیەتی ئایینی و دادگاکانی پشکنیندا، پەرگیری نەکردوو بە ئاڕاستەیەکی خراپدا نەڕۆیشت؟ پاشان نابێت بگەڕێینەوە بۆ ڕۆشنگەریەك کە زۆر هاوسەنگتر بێت: مەبەستم ئەو ڕۆشنگەریەیە کە لە یەککاتدا ڕوناکی ئەقڵ و ڕوناکی ئیمان پێکەوە کۆ دەکاتەوە؟).

## سەرەتا دژوارەکانی ڕۆشنگەری فەرەنسی

ڕۆشنگەری لە فەرەنسا چۆن هاتە ئارا و چۆن ئەو وڵاتە گاف گاف لە ڕۆژگاری فێندەمێنتالیزمی

کاتۆلیکی ڕەهاوە گواستیەوە بۆ سەردەمی ئیمانی ڕۆشنگەر و فیکری ئەقلآنی؟ هەندێك لە گەورە مێژونوسانی هاوچەرخ پێیان وایە "فۆنتنێل" (1657-1757)، یەکەمین کەس بووە ستایشی سەردەمی ڕۆشنگەری کردووە.. متمانەی "فۆنتنێل" بە مرۆڤایەتی و داهاتوی ئینسان دەگەڕایەوە بۆ ئەو پێشکەوتنانەی زانست لە سەردەمی ئەودا بە دەستی هێنابوو، بە تایبەت زانستی ماتماتیك و فیزیك. سەرەڕای گومان و سەنگینی، بەلآم خۆشحالّی خۆی بەو گۆڕانکاریانە نەدەشاردەوە کە بەسەر ژیانی رۆشنبیری فەرەنسیدا هاتبوو. بۆ نمونە لە جێگایەکدا دەڵێت: (ماوەیەکی کەمە گیانێکی فەلسەفی زۆر نویٚ لە ولآتەکەماندا بلآوبۆتەوە، ئەمەش بریتییە لە ڕۆشناییەك کە باوانمان دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخسا لێیبەهرەمەندبن و سەرەنجام ئێمە پێیگەیشتین). هەروەها دەڵێت: (ئێمە درەوشاوەین بە روناکی ئاینێکی راستەقینە و بڕواشم بە هەندێك تیشکی فەلسەفەی ڕاستەقینە هەیە. هەنوکە ئێمە هەزاران جار لە خەڵکانی سەردەمانی پێشوو ڕۆشنترین، ئەو خەڵکانەی وەهم و خورافاتیان بەرهەم هێنا).

لێرەدا سەرنج دەدەین "فۆنتنێل" هەستیکردووە لەسەردەمێکی ڕۆشنگەردا دەژی، لانی کەم لە بواری فەلسەفەدا و بەتایبەتی پاش "ڕینێیە دیکارت"، هەروەها لە بواری زانست و ڕەخنەی مێژویدا. بەلآم دەبێت ئەوەش بزانین تا ساتەوەختی "فۆنتنێل"، چەمکی ڕۆشنگەری هیچ ڕەخنەیەکی -لانیکەم بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ- ئاڕاستەی فیکری ئاینی نەکرد بوو. شایەنی باسە "فۆنتنێل" بەشێوەیەکی سەرەکی لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەدا ژیاو دەستی بە نوسینکرد.

ئێمە دەزانین جەنگی نێوان ئەقلآنییەکان و پیاوانی ئایینی بەشێوەیەکی فیعلی تەنها لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمدا دەستی پێکرد، بە تایبەت پاش سالّی 1760، کاتێك کتێبە سەرەکیەکانی "ڕۆسۆ" و "دیدرۆ" و "فۆلتێر" و "بارۆن دۆلباك" چاپکران و بلآوبوونەوە. ڕاستە چەمکی سەردەمی ڕۆشنگەری لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا هەبوو، بەلآم تەنها لە دوای نیوەی دووەمی ئەو سەدەیە بووە بنەما و دروشم، ئەمەش ناگەڕێتەوە بۆ هەندێك لەو ڕووداوە سیاسی و کۆمەلآیەتیانەی لەو ماوەیەدا ڕویاندا، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ڕوداوێکی فیکری سەرەکی ئەویش بلآوکردنەوەی ئینسیکلۆپیدیا بەناوبانگەکە بوو کە "دیدرۆ" (1713-1784) سەرپەرشتیکرد. ئەم پرۆژە فیکرییە مەزنە تەواوی ڕۆشنگەرەکانی لە هەموو بوارەکاندا لە دەوری خۆی کۆکردەوە. بەیاننامەی سەرەتای ئینسیکلۆپیدیا کە "دیدرۆ" نوسیبوی، سالّی 1750 بلآوبووەوە. هەرچی گوتاری پێشەکیە بە پێنوسی "دالامبێر" نوسرابوو، لە سالّی 1751دا بلآوکرایەوە.

ئینسیکلۆپیدیا بە هەموو بەشەکانیەوە، کۆکردنەوەی دەسکەوتەکانی ڕۆشنگەرییە کە لە ماوەی نیو سەدەی ڕابردوودا ڕویان دابوو. واتە دەرەنجامی کۆتایی سەرجەم ئەو زانیاری و زانستانەیە کە لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا لە ئارادا بوو. لە وتاری پێشەکیدا کە شایستەی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتە، "دالامپێر" (1717-1783) پێیوایە سەردەمی ڕێنیسانس یەکەمین چەرخی ڕۆشنگەرییە زەمینەسازی بۆ سەدەی هەژدەهەم کرد، بەم پێیە ئێمە قەرزار باری ئەو ڕۆژگارەین. پاشان دادگاکانی پشکنین لە سەدەی حەڤدەهەمدا و هەروەها ئاقاری کاتۆلیکی توندڕەوو

دژە ڕیفۆرمی ئایینی هاتنە ئارا، بەڵام نەیانتوانی ڕۆشنگەری خەفە بکەن کە سەرەتاکانی لەسەردەمی ڕێنیسانسەوە بەدەرکەوتبوو.

مەشخەڵی ڕۆشنگەری سەرەڕای هەوڵی زۆری دەمارگیرەکان بۆ خەفەکردنی، هەر بەدرەوشاوەیی مایەوە. لە ئینسیکلۆپیدیادا چەمکی ڕۆشنگەری بە زۆری دێت. لە یەکێك لە وتارەکانیدا "دیدرۆ" جیاکاریەك دەکات لە نێوان سەردەمی ڕۆشنگەری و سەردەمی جەهل و تاریکیدا، لە جێگەیەکی دیکەشدا بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە ترسی ئەوەیان هەبوو مرۆڤی ئەوروپی دوچاری نوچدان بێت و جارێکی دیکە لە تاریکیدا ڕۆبچێت، لەمبارەیەوە دەڵێت: (پێویست بەم ترسە ناکات، هیچ کاتێك هێندەی ئەم سەردەمەی ئێمە تاریکی و نەزانی لە پاشەکشەدا نەبووە، فەلسەفەش هەنگاوی گەورە دەنێت و بەرەوپێش دەچێت، لەم پرۆسەیەشدا ڕۆشنگەری هاوشان لەگەڵیدا ڕێدەکات). لە جێگایەکی دیکەدا "دیدرۆ" دەڵێت: (فەلسەفەی ڕاست و دروست کە ڕووناکی خۆی بە هەموو جێگەیەکدا پەخش دەکات و لە هەموو شوێنێك دەدرەوشێتەوە، خەریکە زیاتر و زۆرتر دەچێتە دێر و کڵێساکانەوە).

لەلایەکی ترەوە "گریم" (1723–1807)، خاوەنی گۆڤاری (نامە گۆڕینەوەی ئەدەبی) و هاوڕێی "دیدرۆ" و "ڕۆسۆ" ستایشی ڕۆشنگەری دەکات، بەڵام لە گروپی ئینسیکلۆپیدیا کەمتر گەشبینی پێوە دیارە. شایەنی باسە "گریم" بەچەند قۆناغێکدا ڕۆیشتووە. سەرەتا زۆر لەوان خوێنگەرمتر بوو، پێیوابوو هاوڕێکانی زیاد لە پێویست نەرم و شەرمنن. ساڵی 1755 ڕەخنەی ئاڕاستەی ئەو گوتارە کرد کە "دالامپێر" لە ئەکادیمیای فەرەنسی پێشکەشیکرد، کاتێك وەکی ئەندامێکی ئەکادیمیاکە پێشوازی لێکرا، لەبەرئەوەی وەکی پێویست جەختی لەسەرکەوتنی ڕۆشنگەری نەکردبووەوە. پێدەچێت "دالامپێر" لە پەرچەکرداری کۆنسێرڤاتیڤەکان ترسا بێت، بە تایبەت ئەوان زۆرینەی ئەو دەزگا فەرەنسیە دێرینەیان پێکدەهێنا. لە ڕەخنەکەیدا "گریم" نوسیبوی: (دەبوو باسی لە نەهامەتی سەردەمە تاریك و بەربەریەکانی پێشو بکردایە، سەردەمێك جەهل و نەزانی بەسەر ئەقڵیەتی مەسیحیەکاندا زاڵ بوو. هاوکات دەبوو باس لەو روناکیە نەرم و نیانەش بکات کە مرۆڤی ئەم سەردەمەی ڕوناك کردۆتەوە، مەبەستم لەوەش ڕوناکی فەلسەفە و زانستە). لە جێگایەکی تردا باس لە ڕۆڵی پرۆتستانتەکان دەکات، لە بڵاوکردنەوەی تۆلێرانس و ڕۆشنگەری و بەگژاچونەوەی دەمارگیری ئایینی و مەزهەبی. لەژێر کاریگەری ئەواندا ڕۆشنگەری هات بۆ ئەوەی دڕ بە تاریکیەکان بدات، کەچی دواتر "گریم" ساردبووەوە و ئەو حەماسەتەی سەرەتای نەما. بەڵام داخۆ ماندووبوو یان بێئومێد بوو لە دژایەتیکردنی دەمارگیری و دەمارگیرەکان؟ بۆ نمونە ساڵی 1757 دەڵێت: (جۆرە مرۆڤێك هەن زۆرینەن، ڕۆشنگەری فیکری هیچ کارێکیان تێناکات و سورن لەسەر کاڵفامی و دەمارگیری خۆیان).

تەنانەت کار دەگاتە ئەوەی سەدەی هەژدەهەم بەسەدەیەکی نا ڕۆشنگەری بداتە قەڵەم. بۆ نمونە دەرهەق بە یەسوعییەکان (دوژمنانی سەرسەختی فەیلەسوفان) دەڵێت: (بێگومان نەوەکانی تاریکی لە روناکی دەترسن و ڕقیشیان لەوانەیە روناکی لە نێو مرۆڤەکاندا بڵاودەکەنەوە). لە جێگایەکی تردا دەنوسێت: (ئەوانە یەکەمین ئامانجیان سڕینەوەی ڕۆشنگەری و زانستە لەسەر گۆی زەوی). بەڵام پاش ساڵی 1765 شتێك لە ناخ و دەرونی

"گریم"دا گۆڕاو وەکی پێشتر گەشبین نەماو نائومێد بوو، ئەمەش لەبەرئەوە نەبوو کە گومانی لە ڕۆشنگەری هەبێت، بەڵکو لەبەرئەوەبوو گومانی لە توانای مرۆڤ دەکرد لەوەی توانای تێگەیشتن و قبوڵکردنی ڕۆشنگەریان هەبێت. لەمبارەیەوە دەڵێت: (چرکەساتەکانی ڕۆشنگەری لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئێجگار کورتن)، یاخود دەڵێت: (ڕۆشنگەری گەلێك لە گەلان پەیوەستە بە ژمارەیەکی کەم یان دەستە بژێرێکی دیاریکراو، هەرچی زۆرینەشە ئەوا ئەستەمە ڕۆشنگەر بکرێن). بەڵام بۆچی نائومێدی تەنگی پێهەڵدەچنی؟ لەبەرئەوەی ئەو ڕوداوە مەزهەبیانەی ئەوکات لە فەرەنسادا ڕویدا ناهەموار بوو، بەڵگەی ئەوە بوو دەمارگیری لە ناخی مرۆڤەکاندایە و ئەستەمە ڕیشەکێش بکرێت. لەو ماوەیەدا کێشەی بنەماڵەی (کالاس) ڕویدا، کە بنەماڵەیەکی پرۆتستانتی بوونو لە شاری تولۆز لەلایەن زۆرینەی کاتۆلیکیەکانەوە بەشێوەیەکی ترسناك سەرکوتکران. هاوکات کێشەگەلێکی دیکەی وەك کێشەی (سیرڤین) و (لابار) و.. هتد، ڕویدا.

ئەمانە مرۆڤ گەلێك بوون بە تاوانی وازهێنان لە ئاینی مەسیحی یاخود پابەندنەبوون بە سروت و ڕێوڕەسمە ئاینییەکان، سوتێنران یاخود کوژران. ئەم ڕوداوانە دەریخست زۆربەی گەلی فەرەنسی تا ئەو کاتەش دوور بوون لە ڕۆشنگەری و ڕۆشنگەریش تەنها تایبەتە بە دەستەبژێرێك لە فەیلەسوفان و ڕۆشنبیران. لەم سەروبەندەدا کارگەیشتە ئەوەی یەکێك لە دادوەرەکانی شاری تۆلۆز ستایشی سزادان بکات، بەو پێیەی ئامرازێکی لەبارە بۆ ناچارکردنی کەمینەی پرۆتستانتی تا دەستبەرداری ئاینزای خۆی بێت و باوەڕ بە ئاینزای زۆرینە بێنێت کە ئاینزای کاتۆلیکییە. سەبارەت بەم بۆچونە "گریم" شێتگیر دەبێت و دەڵێت: (نەوەکانی داهاتوو نەفرەتمان دەکەن و بە تۆمەتی بەربەریەت و دڕندایەتی تاوانبارمان دەکەن، لە کاتێکدا ئێمە لاف ئەوە لێدەدەین سەر بە ڕۆژگارێکی فەلسەفی ئەقلانین)! بەڵام هەردوای ئەمە لەو ڕەشبینیە پاشگەزبووەوە و گەڕایەوە سەر گەشبینی سەرەتای و دەڵێت: (ئێمە لە باوکانمان چاکترین، ئەلبەتە ڕۆڵەکانیشمان لە خۆمان چاکتردەبن، لە ڕوی ڕۆشنگەری و دورکەوتنەوە لە دەمارگیری)، بەڵام سەرلەنوێ و لە ساڵی 1770 دوچاری ڕەشبینی دەبێتەوە! پێدەچێت ئەمجارەیان ڕەشبینی بەری نەدابێت، چونکە ڕێگای ڕۆشنگەری دورو درێژە و پڕی کەندو کۆسپە و ئاکامیشی پێشوەخت مسۆگەر نییە، وەکی هەندێك مەزەنەیان دەکرد. لەبەرئەوەی تاریکخوازان لە بۆسەدان بۆ فیکری ئازاد و هەر کاتێك هەلیان بۆ بڕەخسێت، بەبیانوی دژایەتیکردنی ئیلحاد و بێباوەڕییەوە یاخود بەرگریکردن لە بیروباوەڕ (بیروباوەڕی باب و باپیران)، دەست لە ڕۆشنگەری دەوەشێنن، بەمکارەشیان دژایەتی ئازادی فیکر و ویژدان دەکەن.

سەروەختێك یادی دوسەدساڵەی قەسابخانە بەناوبانگەکەی (سانت بارتیلمی، 24ی ئابی 1772) کرایەوە، "گریم" دەنوسێت: (ئێمە هەموو ڕۆژێك شانازی بەو پێشکەوتنەوە دەکەین کە ڕۆحی فەلسەفی و ئەقلانی لە وڵاتەکەماندا بەدەستی دێنێت، بەڵام ئەم پێشکەوتنە تا هەنوکەش هەموو چین و توێژەکانی نەگرتۆتەوە و تایبەتە بە دەستە بژێرێك لە بیریاران. دەبێت ئەوەش بڵێین تەنها فێندەمێنتالیستەکان نەفرەت لە ڕۆشنگەری ناکەن، بەڵکو حکومەتیش ترسی لێیهەیە و دەیەوێت

پەکیبخات و کۆسپی بۆ دروست بکات). لە جێگایەکی دیکەدا کە تەعبیر لە نائومێدی و پەستی ئەو دەکەن دەڵێت: (بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤایەتی بۆ ئازادی و حەقیقەت نەخوڵقاون، ئەگەرچی بەردەوام باسیان لێدەکەن، بەڵام لە ڕاستیدا ئازادیو حەقیقەت تەنها بۆ ئەو دەستەبژێرەی مرۆڤ خوڵقاوە کە دەتوانێت بەهرەمەند بێت لێیان، بەمەرجێك زۆر خۆی پێوەبانەدات. هەرچی مرۆڤەکانی دیکەیە واتە زۆرینە، ئەوا تەنها بۆ کۆیلایەتی و گومڕایی دروست بوون).

## ڕۆحی گشتی سەردەمی ڕۆشنگەری

زۆربەی لێکۆڵیاران کۆکن لەسەر ئەوەی کە دەڵێت: (لە مێژووی شارستانیەتی ئەورووپیدا، سەردەمی ڕۆشنگەری وەرچەرخانێکی مێژوویی چارەنووسسازە).. هەموو ئەو پرانسیپ و بنەمایانەی ماوەی دوو سەدەیە خۆرئاوا کاریان پێدەکات، لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا دروست بوون.. هەرچەندە هەندێك لە ئێستادا باس لە سەردەمی پاش- مۆدێرنە و پاش- ڕۆشنگەری دەکەن. بەڵام ناتوانین لە سەردەمی پاش- ڕۆشنگەری تێبگەین، بەبێ تێگەیشتن لە ڕۆشنگەری خۆی. ئەمەش ئەو شتەیە تا هەنوکە لە کایەی ڕۆشنبیری ئێمەدا ڕووینەداوە.. کەواتە بابزانین خەسڵەتە سەرەکیەکانی ئەم ڕۆشنگەریە کامەیە؟ یاخود جەوهەر و ڕۆحی ئەم ڕۆشنگەریە چییە کە وایکردووە ببێتە مایەی دروستبوونی گەورەترین شارستانیەت لەسەر گۆی زەوی؟ سەرەتاکانی چۆن دەستی پێکرد؟ ئەمە ڕستێکە لەو پرسیارانەی دەمەوێت لە ئێستادا وەڵامیان بدەمەوە؟

"دالمبێر" یەکێك لە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەریو هاوڕێی "دیدرۆ" و "ڤۆڵتێر"، دەڵێت: (لە ناوەڕاستی هەر سەدەیەك لە سێ سەدەی ڕابردوودا، وەرچەرخانێکی مێژویی ڕویدا.. لە ناوەڕاستی سەدەی پازدەهەمدا، سەرەتاکانی بزاوتێکی ئەدەبی و فیکری دەستی پێکرد کە بەسەردەمی ڕێنیسانس ناوی دەرکرد. لەو کاتەشدا ئەو بزوتنە هیومانستیەش دەستی پێکرد کە لە هەوڵی ئەوەدا بوو هەماهەنگیەك لە نێوان ترادسیۆنی مەسیحی و ترادسیۆنی یۆنانی و ڕۆمانیدا دروست بکات. مەڵبەندی ئەم بزوتنەوەیەش ئیتاڵیا بوو.. لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەیەمدا بزاوتی ڕیفۆرمی ئاینی بەڕابەرایەتی "مارتن لۆتەر" لە ئەڵمانیا سەریهەڵدا. لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا فەلسەفەی دیکارتیزم بەدەرکەوت کە بەدەسپێکی مۆدێرنەی فەلسەفی دادەنرێت و لە دنیا بینیماندا کۆدێتایەکی مەعریفی دروستکرد).

ئەی ئێستا چی لە ناوەڕاستی ئەم سەدەیەدا، سەدەی هەژدەهەم ڕوودەدات؟ "دالمبێر" دەپرسێت و بەخۆشی وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: (گۆڕانێکی گەورە لە بیر و بۆچونماندا دروست بوو، شۆڕشێکی فیکری ڕاستەقینە ڕویداو تەنها نەوەکانی داهاتوو دەتوانن سەنگ و قورسایی و لایەنی سلبی و ئیجابی دیاری بکەن. ئێمە تا ئێستاش لەناویداین و ناتوانین هەموو ڕەهەندەکانی ببینین. بەڵام دەتوانین باس لەوە بکەین کە سەردەمەکەمان سەردەمی فەلسەفەیە. سەرنجێکی خێرای دۆخی مەعریفە بدەین لە ئێستادا، دەبینین فەلسەفە چ قەڵەمبازێکی گەورەی داوە. زانستی سروشتی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زانیاری زیاتر بەدەست دێنێت و زانستی ئەندازەش سنورەکانی بەرفراوانتر کردووە و لە فیزیا نزیك بۆتەوە. واتە گەشتوینەتە دۆخێك سستمی جیهانی ڕاستەقینەمان بۆ ئاشکرا بووە. هەر لە زەویەوە تا

ئەستێرەی زوحەل و مێژووی ئاسمانەکان و زیندەوەران. فیزیا دەستی بە گۆڕینی سیمای جیهان کردووە و لەگەڵیشیدا تەواوی زانستەکانی دی خەریکن فۆرمێکی نوێ وەردەگرن).

بەمجۆرە هەمووشتێك بۆتە بابەتی گفتوگۆ و تاوتوێکردن و هەڵسەنگاندن. تەنانەت پرانسیپەکانی زانستە دنیاییەکان و بنەماکانی وەحی ئیلاهیشیان گرتەوە. دەتوانین هەمان شت دەربارەی: (میتافیزیك، چێژ، مۆراڵ، میوزیك، کاروباری بازرگانی، ماڤ فەرمانڕەواکان و میللەتان و.. هتد)، بڵێین. (بەمجۆرە گۆڕانێکی چۆنایەتی لە ڕۆحی سەردەمەکەماندا ڕوویداو بووە مایەی ڕوناککردنەوەی شتگەلێك و مانەوەی شتگەلێکی تر بە تاریکی و داخراوی)[3]. ئەوەی ئەم قسانە دەکات، وەکو "ئەرنست کاسیرەر" دەڵێت: (یەکێکە لە گەورە زاناکانی سەردەمی خۆی). "دالمپێر" بەو هەستە فەلسەفیە ئاست بەرزەی دەیزانی باهۆزی گۆڕانێکی گەورە بەڕێوەیە و دەتوانێت بنەماکانی مەعریفەی تەقلیدی سەردەمەکەی لەق بکات. بەمجۆرە فەزایەکی ئەقڵی نوێ لەبەردەم ئینسانی ئەورووپیدا کرایەوە، کە پێشتر مێژوو شتی وای بە خۆیەوە نەبینیبوو.

وەکو ئاشکرایە فیکری سەدەکانی ناوەڕاست، لەسەر یەقینێکی تیۆلۆژی ڕەها دامەزرابوو. بەڵام هەنووکە فیکر لەسەر بنەمایەکی دیکە خۆی ڕێکدەخات، ئەویش ئەقڵی فەلسەفیە. لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین چەمکی فەلسەفە بە مانای گشتاندنی میتۆدی فیزیا دێت، بەسەر کۆی بوارەکانی مەعریفەدا. دامەزرێنەری ئەقڵانیەتی مۆدێرن کەسێکە بەناوی "ئیسحاق نیوتن". ئەم پیاوە متمانەیەکی بێ حەد و حسابی بە ئەقڵ بەخشی و وایلێکرد بتوانێت، لە ڕێی میتۆدی ئەزمونگەری و ماتماتیکیەوە یاساکانی گەردون کەشف بکات. ئیتر لەم چرکە ساتەوە ئینسانی ئەوروپی لە ڕووی ژیارییەوە قەڵەمبازێکی گەورەیدا، قەڵەمبازێك بووە مایەی ئەوەی بۆڕی سەرجەم نەتەوەکانی تر بداتەوە..

ئەگەر مرۆڤ تەنها بەهۆی ئەقڵی خۆیەوە بتوانێت ئەو یاسایانە کەشف بکات کە ئاڕاستەی گەردون دەکەن، ئەی کەواتە بۆچی ئەم ئەقڵە بەگەڕ ناخات؟ ئایا یەزدان فەرمانمان پێدەدات ئەقڵمان فەرامۆشکەین یاخود کاری پێبکەین و بەکاری بهێنین؟

شایەنی باسە تیۆلۆژیای سەدەکانی ناوەڕاست پێیوابوو کەشفکردنی سروشت و ئەناتۆمیکردنی جەستە، دەسکاریکردنی ئیشی خودایە، لێرەوە ئەستەم بوو مەعریفەی ئینسانی لە سایەی ئەوتیۆلۆژیا باڵادەستەدا، هەنگاوێك بەرەو پێش بچێت. بۆیە دەبوو گۆڕانێکی ڕیشەیی لە زانستی تیۆلۆژیادا ڕووبدات، تا بواری هاتنە ئارای مەعریفەیەکی نوێ هەبێت. لێرەدا دەگەینە خەسڵەتێکی سەرەکی دیکە لە خەسڵەتەکانی ڕۆشنگەری. ئەویش ئەوەیە ڕۆشنگەری بەر لە هەر شتێك بریتیە لە دۆزینەوەی مانایەکی دیکە بۆ ئایین. کەواتە ئازادی ئایینی بەر لە ئازادی زانستی کەوت. زۆربەی زۆری زانایانی ئەو قۆناغە و بە تایبەتی "نیوتن"، ئیمانداری زۆر گەورە بوون. بۆیە نابێت ڕۆشنگەری و بێباوەڕی یان ڕۆشنگەری و کوفر، تێکەڵ بەیەك بکەین، وەك ئەوەی لەمڕۆدا فێندەمێنتالیستە توندڕەوەکان باسی دەکەن. ڕۆشنگەری بە مانای کوفر نایەت و مانای ئیمانیش نییە بە ستایلە تەقلیدیەکەی سەدەکانی ناوەڕاست. ڕۆشنگەری مانای لەدایکبونی ئیمانێکی تازەیە کە لەسەر داروپەردوی ئیمانی کۆن، سەر

دەردێنێت. ڕۆح و ناوەڕۆکی سەردەمی ڕۆشنگەریش لێرەدایە.

با لێرە بەدواوە کەم تا کورتێك بە وردی باس لەم مەسەلەیە بکەین. "ڤۆڵتێر" جەنگێکی قورس و بێ ئامانی دژی دەمارگیری و دۆگمای ئایینی ڕاگەیاند، نەك هەر لە فەرەنسا، بەڵکو لەسەر ئاستی تەواوی ئەوروپا. "ڤۆڵتێر" بەردەوام باسی لەوە دەکرد کە ئەو هەر بە تەنها شەڕی ئایین ناکات، بەڵکو بەگژ خورافە و توندڕەویشدا دەچێتەوە. ئەو شەڕی ئایینی وەك خۆی نەدەکرد، بەڵکو دژی کڵێسا دەیکرد، وەك دامەزراوەیەکی خاوەن دەسەڵاتی سەرکوتکەر. بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەو نەوەیەی دوای "ڤۆڵتێر" هات و ئەویان بەڕابەری ڕۆحی و فیکری خۆیان دەزانی، ئەم جۆرە جیاکاریکردنەی بەلاوە گرنگ نەبوو. واتە جیاوازی نەدەکرد لە نێوان ڕەخنەکردنی ئایین و کڵێسادا. ڕووە مەترسیدارەکەی ئەزموونی ئەوروپییش لە مامەڵەکردنی ئاییندا، لێرەدایە. چونکە ئایین وەك پێداویستیەکی ناوەکی مرۆڤ، بە دوورە لەو تێگەیشتنە دەمارگیر و توندڕەوەی کەسانێك بە ناوی ئایینەوە پیادەی دەکەن. لێرەوە دەستبەرداربوونی ئەو تێگەیشتنە دۆگما و کورت بینەی ئایین، کارێکی پێویست بوو بۆ تێگەیشتنێکی مۆدێرن و بەرفراوان و ئازاد. بەڵام ئەمە پرۆسەیەکی هەروا ئاسان نەبوو. دەبوو کێشە و ململانێیەکی گەورە ڕووبدات و ڕوشیدا. لاپەڕەکانی مێژوو پڕیەتی لەو شەڕانەی لەنێوان ڕۆشنگەران و فێندەمێنتالیستەکاندا ڕویداوە. پێویستە ئەزمونی ڕۆشنگەری ئەوروپی لەگەڵ ئاییندا، لەسەر ئەم ئاستە قوڵە بخوێنینەوە، گەر نا، ئەوا نەدەگەینە هیچ و نەلە هیچیش حاڵی دەبین.

(ئەنسیکلۆپیدیا)ی فەرەنسی کە لە دەوروبەری ساڵی 1755 دا "دیدرۆ" دایمەزراند، هاتە ناو ئەو جەنگە بەرفراوانەوە لە دژی دۆگمای مەسیحی و بەتایبەت دۆگما و دەمارگیری کاتۆلیکی. پێی وابوو ئەم دەمارگیریە کۆسپە لە بەردەم پێشکەوتنی فیکری و ڕێگەنادات مۆراڵێکی ڕاستەقینە و سستمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی دادپەروەر بێتە ئارا. لەم قۆناغەدا باڵی توندڕەوی ڕۆشنگەری، بە توندی کەوتنە پەلاماردانی بیروباوەڕی تەقلیدی. پێویستە لێرەدا جیاوازی بکەین لە نێوان ڕۆشنگەری ئیماندار "ڤۆڵتێر، ڕۆسۆ ..."، لەگەڵ ڕۆشنگەری بێباوەڕ "دیدرۆ، هۆڵباخ، لامتری..".

"هۆڵباخ" لە کتێبی (فەلسەفەی سروشتی)دا زۆر بە توندی ڕەخنە لەو نوسینە تەقلیدیانە دەگرێت کە باس لەوە دەکەن مرۆڤ دەبێت ملکەچ و گوێڕایەڵی هێزە غەیبی و نادیارەکان بێت. ئەو پێی وابوو ئەمەیە وا دەکات مرۆڤ فێری ئەوەبێت لەبەردەم ستەمکارەکانی سەر زەویدا گەردن کەچ بکات، هەروەها ئەو نوسینانە ڕێنادەن سەربەخۆ بیر بکەنەوەو خۆیان بڕیار لەسەر ژیانی خۆیان بدەن. باڵی توندڕەوی ڕۆشنگەری، بڕوا بوون بە یەزدانیشیان ڕەتدەکردەوە. وەکو دەزانرێت "ڤۆڵتێر" قەناعەتی وەهابوو، بڕوابوون بە خوا بەهایەکی سەرەکیە و ناکرێت دەستبەرداری بین. بەڵام "هۆڵباخ" ئەمەی بە هەڵوێستێکی ترسنۆکانە دەدایە قەڵەم و پێیوابوو ئەمە بۆ خۆی جۆرە سازشکاریەکە لەگەڵ دەزگا و پیاوانی ئاییندا.. ئەو ڕیشەکێشکردنی ئایین و پەیڕەوکردنی ڕێبازێکی ئەقڵانی، مادی، زانستی، بەکارێکی گرنگ و پێویست دەزانی. "دیدرۆ" دوای ئەوەی بڕوای بە یەزدان نەماو بووە کەسێکی مولحید، ئەم بۆچونانەی "هۆڵباخ"ی بەتەواوی پەسەندکرد.

"هۆڵباخ" دەیوت: (تەنانەت گەر سەری بیست ئیمانداری توندڕەویشمان پەڕاند، سەری تازە پەیدا دەبێت.. کەواتە چار نییە و پێویستە بە یەکجاری کۆتایی پێبێنین. دەبێت هەموو بیروباوەڕێکی غەیبانی بسڕینەوە، بەهانەی مانەوەشی هەر چیەك بێت و پشتی بە هەر دەسەڵاتێکی ئاسمانیش بەستبێت. ئەمە تەنها ئامرازێکە بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لە جەهل و بۆچونی پێشوەخت و دەمارگیری و توندڕەوی مەزهەبی، هەروەها تاکە ڕێگایە بۆ قوتارکردنی لە کۆیلایەتی و واڵاکردنی دەرگای خۆشبەختی و کامەرانی لەبەردەمیدا). بەڵام نابێت وا تێبگەین کە سەردەمی ڕۆشنگەری قۆناغێك بووە، هەر هەمووی سەر لەبەر دژی ئایین و هەموو بیروباوەڕێك بووە. بۆ نمونە دەتوانین بڵێین تەنانەت کەسانی وەك "دیدرۆ"ش، بێباوەڕی خۆیان ڕانەدەگەیاند، گەر ئایینی تەقلیدی بە زەبری هێز خۆی بەسەردا نەسەپاندایە.. کەواتە مرۆڤی ئەو قۆناغە دەیویست، ئازاد بێت و هەناسە بدات، دەیویست لە ڕێی قەناعەت و بڕوای خۆیەوە ئیمان بهێنێت، نەك بە زەبر و زۆر.

لەلایەکی ترەوە دەبێت چاك ئەوە بزانین کە سەدەی هەژدە توانستە فیکری و ڕۆحیەکانی، لە ئافەرۆزەکردنی هەموو جۆرە ئیمانداریەکەوە وەرناگرێت.. خۆ ئەگەر ڕۆشنگەری کاری ڕامالینی هەموو ئایین و بیروباوەڕێك بوایە، ئەوا نەیدەتوانی ئەم هەموو شارستانیەتە بونیاد بنێت کە ئێمە ئەمڕۆ بە دووچاوی خۆمان دەیبینین. هیچ ژیارێك ناتوانێت لەسەر زەمینێکی قات و قڕ لە ئیمان دروست ببێت. هەموو ئەو قۆناغانەی لە مێژوودا پڕ بەرهەم بوون، قۆناغی ئیمانی بوون و بەهێزی ئیمانێکەوە ڕووەو بونیادنان و ئاوەدانکردنەوە چوون. لێرەوە ئەو قسەیەی "گۆتە" بۆ سەردەمی ڕۆشنگەری ڕاستە کە دەڵێت: (هەموو مێژووی مرۆڤایەتی بریتییە لە ململانێی نێوان ئیمان و بێباوەڕی). بەبێ ئیمان نە پێشکەوتن دەبێت و نە دەسکەوتمان دەسگیر دەبێت. کەواتە ئەو هەستە گشتیەی لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا لە ئارەدا بوو، هەستکردنێکی قوڵ بوو بە ئەفراندن و داهێنان، لە پێناو دروستکردنی جیهانێکی نوێدا. ئەم شارستانیەتە نوێیە، سەرەتا و بەر لە هەر شتێك بە نوێکردنەوەی خودی بیری ئایینی دەستی پێکرد. بەو مانایەی نوێکردنەوەی ئیمان، مەرجێکی سەرەکی بوو بۆ نوێکردنەوەی تەواوی کۆمەڵگە. ئەمە خاڵێکی سەرەکیە و پێویستە لە بیرمان نەچێت. یەك بیریاری ڕۆشنگەری نییە، قسەی لەسەر ئایین نەکردبێت یان ئایین خەمی گەورەی نەبووبێت. ئەمەش پێچەوانەی بیریارانی ئەوروپاییە لە ساتەوەختی ئێستادا، کە بۆ ئەوان مەسەلەی ئایین بۆتە بەشێك لە ڕابردوو.

لێرەدا پێویستە بڵێین: بیریارانی سەدەی هەژدە پێیان وابوو ئیمانداری تەقلیدی لە باریدا نییە وەڵام بە هەلومەرجی تازە بداتەوە، بەڵکو بۆتە ئاستەنگێك لە بەردەم ئەفراندن و پێشکەوتندا. بەمجۆرە ئەو ململانێیەی لە نێوان ڕۆشنگەران و فێندەمێنتالیستەکاندا بەرپابوو، هەر بە تەنها پەیوەندی بە بیروباوەڕی ئایینی و چۆنیەتی تەفسیرکردنیەوە نەبوو، بەڵکو پەیوەندی بە شێوەی خودی یەقینی ئایینیەوە هەبوو. واتە هەر تەنها تایبەت نەبوو بە جەوهەری ئایین، بەڵکو قەرەی شێواز و ناوەڕۆکی ئایینیش دەکەوت. کەواتە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری، بە تایبەت لە ئەڵەمانیاو ئنگلتەرادا، لە هەوڵی ئەوەدا نەبوون بە هەموو هێزێکی خۆیانەوە ئایین تێکوپێك بدەن، بەڵکو هەوڵی ئەوان بۆ ئەوە بووە ئایین لە پۆخڵەوات

پاکبکەنەوەو لە فۆرمێکی تازەدا دایبڕێژنەوە. پرۆژەی سەرەکی سەردەمی ڕۆشنگەریش لێرەدایە.

جێی باسە بیرۆکەی لێکدانەوەی ئایین بە فۆرمێکی نوێ، بەر لە سەردەمی ڕۆشنگەری هەبووە. بۆ نمونە سەردەمی ڕێنیسانس هەر بە تەنها مەبەستی گەڕانەوە نەبوو بۆ ڕۆحی فەلسەفی و زانستی یۆنان و ڕۆمان، بەڵکو هەوڵێك بوو بۆ نوێکردنەوەو گۆڕینی تێگەیشتن لە ئایین. ئەو وێنەیەی هیومانیستەکان و ڕابونخوازەکان دەربارەی ئایین پێشکەشیان کرد، وێنەی ئاینێکە کە بە ژیانی سەرزەمین ڕازییە، بە پێچەوانەی خەڵکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە کە پشتیان لە ژیان دەکرد و بە چاوێکی سوك سەیریان دەکرد. ئەوان بەهۆی خواپەرستی و ئیمانەوە، نەکەوتنە تەرێزکردن لە جیهان و لە فیکر، بەڵکو شکۆیان پێبەخشین. کەواتە ئیمانی کۆن هەیە و ئیمانی نوێش. ئیمان هەیە ڕوکەش و ناچاری و سەرکوتکارە، ئیمانیش هەیە، ناوەکی و ئازاد و تایبەتی. ئەوروپا ئەو کاتە توانی سەرپێی خۆی بکەوێت و ڕابێت کە دەستبەرداری ئایینی کۆن بوو، لە بری ئەو ئایینە کۆنەش بڕوای بە ئایینێکی نوێ هێنا کە لەگەڵ جیهان و دۆزینەوە زانستی و فەلسەفیە نوێیەکاندا، هەڵدەکات.

## سەرەتاکانی ڕۆشنگەری

نابێت وا بزانین ڕۆشنگەری لە ناکاوو کتوپڕ لە کیشوەری ئەوروپا ڕویدا، یاخود لە چاوتروکانێکدا سەرتاسەری ئەو کیشوەرەی ڕوناك کردەوە.. نەخێر، ڕاستیەکەی ڕۆشنگەری پرۆسەیەکی لەسەرخۆ و دژوار و زەحمەت بوو. پرۆسەیەك بوو هەنگاو بە هەنگاو دەستی پێکرد، سەرەتا لە ئنگلتەراو هۆڵەنداوە، پاشان فەرەنسا و ئەڵەمانیا و تێکڕای وڵاتانی دیکەی ئەوروپای گرتەوە.

جەنگی ڕۆشنگەری لە دژی تاریکی، زۆر لەوە سەخت و دژوارتر بووە ئێمە مەزندەی دەکەین. چونکە بزاوتێکی وا هەر بە تەنها بەگژاچوونەوەی دەرەوە نەبوو، بەڵکو بەر لە هەر شتێك ململانێ بوو لەگەڵ ناوخۆدا. دەرەنجامی ئەم ململانێیەش، دەرکەوتنی ڕۆشنایی بوو. ڕۆشنگەری شەڕکردنە لەگەڵ ئەو هەموو تاریکیانەی لە ناخماندایە. بەم مانایەش، ڕۆشنگەری ئەوروپی بەگژاچوونەوەی هەموو ئەو سەدە تاریکانەبوو کە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست، لەسەریەك کەڵەکەبوو بوون. بەگژاچونەوەی فێندەمێنتالستی مەسیحی بوو کە وەك حەقیقەتێکی ڕەها، دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەو سەردەمانەدا سەپاندبوو.

هەرچەندە مێژوونووسان سەرەتاکانی ڕۆشنگەری دەگەڕێننەوە بۆ میتۆدی گومانکاری دیکارتیزم، بەڵام بەو مانایەی ئێمە و مانان تێیگەیشتووین، "دیکارت" بۆ خۆی ڕۆشنگەرنەبووە. مەبەستم ئەوەیە کە ئەو لە ڕیزی بیریارە ڕۆشنگەرەکاندا پۆلێن ناکرێت، بەڵکو دەچێتە خانەی ئەو بیریارانەی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، زەمینەیان لە بەردەم ڕۆشنگەریدا خۆشکرد. "دیکارت" قایل نەدەبوو بەوەی میتۆدی گومان لەسەر ئایین پراکتیزە بکرێت. پێی شتێکی ئاسایی بوو میتۆدە بەناوبانگەی بەسەر هەموو شتێکدا پراکتیزە بکرێت، تەنها بیروباوەڕی ئایینی نەبێت. ئەویش لەبەرئەوەی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی لەو ئان و ساتەدا لە ئەوجی دەسەڵاتیدا بوو، دەیتوانی ڕاستەوخۆ زەبری خۆی بووەشێنێت. "دیکارت" لەوەها هەلومەرجێکدا زۆر بە وریاییەوە مامەڵەی دەکرد، بۆ ئەوەی گیانی خۆی بپارێزێت و

بیَ سەرئیَشە خەریکی تەواو کردنی نوسینەکانی بیَت. ئەو زیاد لە لیَدوانیَکی هەیە کە تیایدا ئیمان و وەلائی خۆی بۆ کلَیسای کاتۆلیکی دووپات دەکاتەوە، بۆ نموونە لە یەکیَك لە لیَدوانە بەناوبانگەکانیدا دەلَیَت: (بڕیارمداوە گویَڕایەلَی یاسا و داب و نەریتی ولاَتەکەم بم و بەردەوامیش پابەندی ئەو ئایینەبم کە لە مندالَیەوە لەسەری پەروەردەبووم)[4].

"دیکارت" پەیڕەوی میتۆدی گومانکردنی دەکرد بۆ سەلماندنی ڕاستی و دروستی شتیَك و پیَی وابوو دەبیَت هەرچی بیروڕا و بۆچوونی باوە بخریَنە ژیَر ئەو میتۆدەوە، بەلاَم ڕیَگەی نەدەدا پرۆسەیەکی وا ئایین بگریَتەوە، کەواتە ئەمە ئەوە ئاشکرا دەکات کە "دیکارت"، جیاوازیەکی ڕون و ڕەوانی لە نیَوان بیروباوەڕی ئایینی و شتەکانی تردا کردووە. بەلاَم ئاخۆ لەم کارەیدا ڕاستگۆ بووە؟ ئایا ئەم هەلَویَستەی دووفاقیَتی پیَوە دیار نییە؟

نابیَت ئەم مەسەلانە وا بخەینە ڕوو، بەلَکو پیَویستە لەو سیاقە میَژووییە تیَبگەین کە "دیکارت"ی تیا ژیاوە، تا بتوانین وەلاَمی ئەو پرسیارانە بدەینەوە.. بۆ نمونە "دیکارت" ئەوەی لە باردا نەبووە بەیەکجار هەموو شۆڕشەکان بەرپا بکات. هیَندە بەسە بۆ ئەو کە توانیویەتی شۆڕشی زانستی یاخود فەلسەفی بەرپا بکات. بەلاَم شۆڕشی ئایینی (یان شۆڕشی ڕۆشنگەری لە بواری ئاییندا)، ئەوا هیَشتا کاتی نەهاتبوو. سەرەڕای ئەوەش "دیکارت" دوای سەرکۆنەکردنی "گالیلۆ" لە سالَی 1633 دا، زۆر لە ژیانی خۆی دەترسا. لەو کاتەدا خەریکی ئەوەبوو کتیَبیَکی بە چاپ بگەیەنیَت، بەلاَم کە ئەو هەوالَە دەبیستیَت، دەست بەجیَ پەشیمان دەبیَتەوەو کتیَبەکەی دەشاریَتەوە تا کەس پیَی نەزانیَت. لە نامەیەکدا بۆ هاوڕیَیەکی دەنووسیَت:

(ئامادەنیم لە پیَناو بیروبۆچوونە زانستی و فەلسەفیەکانمدا، قوربانی بە ژیانی خۆم بدەم، دلَنیایی و بیَوەیی لە هەموو شتیَك گرنگترە). بەهۆی ئەم بۆچونانەشیەوە بە ترسنۆکی تاوانبار کرا. بەلاَم ئەمانە ڕیَیان لەوە نەگرت "باسکال" گومان لە ئیمان و خواپەرستی "دیکارت" بکات و بلَیَت: (ناتوانم لەو کردەوەیەی ئەو خۆشبم.. لە تەواوی پرۆژە فەلسەفیەکەیدا ئاواتی ئەوە بوو بتوانیَت دەستبەرداری یەزدان بیَت، بەلاَم نەیدەویَرا ئەوە بە ئاشکرا باس بکات. ئەگەرچی دواتر وازی لیَهیَناو پیَویستی پیَی نەما)[5].

سەدەیەك دوای "دیکارت"، "کانت" دیَت بۆ ئەوەی بە ئاشکرا ئەو قەلَەمبازە فیکریە تەواو بکات: واتە بۆ ئەوەی میتۆدی گومانکردن بەسەر کایەی ئایین و بیروباوەڕە موقەدەسەکانیشدا پراکتیزە بکات. فەیلەسوفی گەورەی ڕۆشنگەری "ئیمانویَل کانت" لە شویَنیَکدا دەنووسیَت: (سەدەی ئیَمە بە شیَوەیەکی تایبەت سەدەی ڕەخنەیە و پیَویستە تەواوی شتەکان بدریَنە بەر ڕەخنە. بە تەنها ئایین و یاسا دەیانەویَت لە ڕەخنە بە دوور بن، یەکەمیان بە بیانووی پیرۆزی و دووەمیشیان بە پاساوی سەنگ و شکۆمەندی. بەلاَم نازانن بەو کارەیان گومانی زیاتر لەسەر خۆیان دروست دەکەن و بەم کارەشیان ناتوانن ناچارمان بکەن بەڕیَزەوە سەیریان بکەین. لەبەرئەوەی ئەقلَ ڕیَز لە شتیَك نانیَت، گەر بواری ئەوە نەدات بەشیَوەیەکی ئازادانە پشکنینی بۆ بکریَت و ڕەخنەی ئاڕاستە بکریَت)[6].

بەمجۆرە دەبینین مەسەلەکان لە سەردەمی "دیکارت"ەوە بۆ سەردەمی "کانت"، گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ئەوەی مەحالَ بوو بیری لیَ بکریَتەوە لە سەردەمی "دیکارت"دا، دەکرا لە

سەردەمی "کانت"دا بیری لێبکرێتەوە. ئەوەی جاران خۆی لەسەرو ڕەخنەوە دەبینیەوە وای لێهات ملکەچی ڕەخنە بێت. چرکەساتی سەرەکی ڕۆشنگەریش لێرەدایە، ئەو چرکەساتەی بەبێ ئەو هیچ ڕۆشنگەرییەك سەرهەڵنادات. لێرەوە بۆ یەکەمجار بیروباوەڕی ئاییني مەسیحی هاتە ژێر باری ئەوەی، بە شێوەیەکی ئەقڵانی – ڕەخنەیی تاوتوێ بکرێت(7). ئەمە ئەو چرکەساتەی ڕۆشنگەرییە، کە لە دواییدا دروستبوونی گەورەترین شارستانیەتی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا لێ دەکەوێتەوە، ئەویش شارستانیەتی نوێی ئەوروپایە.

شایەنی باسە سەرەتاکانی ڕۆشنگەری دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە "کانت"، ئەگەرچی لەسەر دەستی ئەو پێگەیشت و کامڵ بوو. لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەوە، واتە پاش مەرگی "دیکارت"، هەندێك لە بیریارە چاونەترسەکان دەستیانکرد بە پراکتیزەکردنی میتۆدەکەی، بەسەر خودی تێکستە ئایینیەکاندا. بێگومان "سپینۆزا" لە ڕیزی پێشەوەی ئەوانەدا بوو کە بەم کارە هەستان، بەڵام هەر خۆی بە تەنها نەبوو، بەڵکو کەسانی وەك: "پییر بایل"ی پرۆتستانت مەزهەب و "ڕیچارد سیمۆن"ی تیۆلۆژیست و "مالبرانش"ی فەیلەسوف و "جۆن لۆك" و "ئەنتۆنی کۆلینز" و "جۆن تۆلاند"ی لەگەڵدا بوو. ئەو بیریارانە کە لە ماوەی نێوان ساڵانی 1680 و 1715 دا ژیان و نوسیویانە، ئەوانەن کە زەمینەیان بۆ سەردەمی ڕۆشنگەری خۆشکرد.

قەیرانی هۆشیاری ئەورووپی لەگەڵ خۆیدا، واتە لەگەڵ ترادسیۆنی مەسیحیدا، بەر لە هاتنە ئارای بیریارە مەزنەکانی ڕۆشنگەری وەك: "ڤۆڵتێرو دالامپێر و ڕۆسۆ و کانت و.. هتد"، دروست بوو.

پێویستە لێرەدا ئەو ماوە کورتەی ڕاستەوخۆ پێش سەردەمی ڕۆشنگەری دەکەوێت دیاری بکەین، بۆ ئەوەی بزانین چی تێدا ڕوویداوە. وەکو ئاشکرایە "پۆل هازار" لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (قەیرانی هوشیاری ئەوروپایی)، تەواوی تێزەکەی لەسەر ئەم خاڵە داڕشتووە. لەو کتێبەدا "هازار" دەڵێت: (قەیرانێکی گەورە لە هۆشیاری ئەوروپیدا دروست بوو، ئەم قەیرانەش نێوان سەردەمی ڕێنیسانس و شۆڕشی فەرەنسی دەکەوێت و بە گەورەترین قەڵەمباز لە مێژووی فیکری مرۆڤایەتیدا ناونووسدەکرێت. لەبەرئەوەی جیهانی کۆنی ژێرەو ژوور کرد و لە جێگای ئەو جیهانێکی تازەتری دامەزراند.. لەسەرئەم مەسەلەیەش، لە نێوان بەرەی ئەقڵانی و بەرەی فێندەمێنتالیزمدا، شەڕو کێشەی قورس بەرپا بوو کە لە مێژووی ئەوروپادا بێ وێنە بوو، بەرەنجامی ئەم شەڕەش مۆدێرنەی لێکەوتەوە. مۆدێرنەی دێرین لە ئەوروپادا، لە بنەڕەتدا لەسەر ئایدیای ئەرك دامەزرابوو: واتە ئەرکی مرۆڤ بەرامبەر پیاوانی ئایین و پادشاکان و نیشاندانی هەموو جۆرە ملکەچی و خزمەتکاریەك، بێ هیچ پرسیار کردن و مشتومڕێك. بەڵام فەیلەسوفانی نوێ بەردی بناغەی شارستانیەتێکی مۆدێرنیان دادەنا کە لەسەر ئایدیای مافەکان دامەزرابێت: واتە مافی بیرکردنەوە و ڕەخنە گرتن و بەگەڕخستنی ئەقڵ‌و مافی مرۆڤ و هاوڵاتی بوون)(8). ئەمە گرەوی گەورەی ئەو جەنگە فیکریە بوو کە لە ئەوروپا و لە ژێر ناوی ڕۆشنگەریدا ڕوویدا. کەواتە پێویستە زۆر بە وردی ئاگاداری قۆناغە یەك بە دوایەکەکانی بین، بەتایبەت ئەو قۆناغەی ڕێگای بۆ خۆشکرد، لەگەڵ سەردەمی ڕۆشنگەری خۆیدا.

ئەمە مانای وایە ئەو قۆناغی سەرەتایەی گرنگی پێدەدرێت لە ساڵی 1680 تا ساڵی 1715

دەخایەنێت، قۆناغی دووەمیش لە ساڵی 1718 دەست پێدەکات بۆ ساڵی 1815. "پییر بایل"[9] (1647-1706)، بیریاری پرۆتستانت مەزهەبی فەرەنسی، یەکێکە لە قارەمانەکانی قۆناغی سەرەتاو لە پێناو بیر و بۆچوونەکانیدا، زۆری چەشت و قوربانیەکی بێحەدی دا. فێندەمێنتالیزمی مەسیحی کون بە کون بەدوایەوە بوون و هەراسانیان کردبوو. یەکێك لە فێندەمێنتالیستە کاتۆلیکیەکان شانازی دەکرد بەوەی "لویسی چواردە"، بە پرۆتستانتیەکانی کرد و سوپاسگوزاری کرد، دەرهەق بە پاککردنەوەی فەرەنسا لە گومڕاو لە ڕێ لادەرەکان.. "پییر بایل" لە شوێنی تاراوگە بوونی لە هۆڵەنداوە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: (ڕسوایی و بەدبەختیە مرۆڤ کاتۆلیکی بێت. دوای هەموو ئەوانەی لە شانشینی مەسیحیەتدا ئەنجامتانداو شانازی پێوە دەکەن کە زۆر مەسیحیە، ئەوا ئاینزای کاتۆلیکی بۆتە ئاینزای خەڵکانی شەڕانگێز و خراپەکار)[10]. ئەو کات دەمارگیری فەرەنسا و تەواوی ئەوروپای تەنی بوو. لەم سەروبەندەدا شا "لویسی چواردەهەم" بڕیاری دا بە پشتبەستن بە دروشمە بەناوبانگەکەی: (یەك ئاینزا، یەك یاسا، یەك پاشا!)، شانشینی فەرەنسا لە پرۆتستانت مەزهەبەکان پاك بکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش فێندەمێنتالستە توندڕەوەکانی نارد بۆ ئەوەی، پەلاماری کوچە و گەڕەکی پرۆتستانت نشینەکان بدەن و بەدەم هاوارەوە بڵێن: (بکوژن! بکوژن هەر کەسێك کە کاتۆلیکی نییە. بەمجۆرە کەوتنە خنکاندن و ڕاکێشانی ژنان و پیاوان و، هەندێ جاریش ئاگریان بۆ دادەخستن و فڕێیان دەدانە ناوییەوە، بەڵام گەر دەستبەرداری بیروباوەڕەکەیان بونایە، ئەوا دەیانهێنانە دەرەوەو لێیان دەگەڕان)[11].

بەڵێ ئەم ماجەرایە لە ئەوروپای سەدەی حەڤدە و تەنانەت سەدەی هەژدەهەمیشدا بەردەوام بوو. ئەمەش مشتێکە لە خەروارێك.. لێرەدا دەتوانین نمونە گەلێکی دیکە بژمێرین: قەتڵ و عامە بەناوبانگەکەی (سانت بارتیلمی)، کە لە ماوەی یەك شەودا چەند هەزار کەسێکی تێدا بوونە قوربانی و بووە سومبولێك بۆ دەمارگیری مەزهەبی و ئایینی. هەروەها جەنگی سی ساڵەی نێوان کاتۆلیك و پرۆتستانتەکان هەیە کە ئەڵەمانیا و تێکڕای ناوچەکانی ئەوروپای گرتەوەو تەڕوو وشکی پێکەوە سوتاند. لەبەرئەمانە بیریارە ئازادیخوازەکان هاتنە مەیدان و بەگژ توندڕەوی ئایینیدا چوونەوە. بەگژ ئەو ئایینەدا چوونەوە کە دەکوژێت. فێندەمێنتالیستە مەسیحیەکان بە ئاشکرا بانگەشەی کوشت و بڕینیان دەکرد و ئەو کارانەشیان بە فتوایەکی ئایینی پاساو دەدایەوە، کە سەرچاوەی لە تیۆلۆژیای سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەگرت.

دواجار دەبێت ئەوە بزانین، تاوانی فێندەمێنتالستەکان چەند درێوو ناشیرین بوو، پەرچەکرداری فەیلەسوفانی ڕۆشنگەریش لە بەرامبەریاندا قوڵ و ڕادیکاڵی بوو. بەڵێ ئەو فەیلەسوفانە ئەوەندە ڕەخنەیان لە بیروباوەڕی تیۆلۆژی سەدەکانی ناوەڕاست گرت، تا لە ڕەگوڕیشەوە دەریانهێناو ئاسەواری لە هیچ شوێنێکی ئەوروپادا نەما. گەورەیی ئەو شەڕەی ئەم فەیلەسوفانە بە درێژایی دوو سەدە ئەنجامیاندا، لێرەدایە. لە دوو توێی ئەم کتێبەدا، بەش بە بەشی ئەم شەڕو ململانێیە دەخەینە ڕوو. ئەوانە مرۆڤ گەلێك بوون تەسلیمی چارەنووس نەبوون و لەبەردەم واقیعدا دەستەپاچە نەوەستان. وەك ڕۆشنبیرانی ئێمە و بە بیانووی ئاوێزان بوون لەگەڵ

میللەتدا، سوار شەپۆلی توندڕەوی نەبوون.. چونکە یەکانگیربوون لەگەڵ کێشەکانی گەلدا، مانای ئەوە نییە دابەزیتە ئاستی ئاژاوە گێڕی یان ختوکەی گیانی توندڕەوی و دەمارگیری بدەیت، بەڵکو مانای ئەوەیە لە ڕێگەی ڕۆشنگەری و ڕۆشنبیرییەوە میللەت وریا بکەیتەوە و ڕاستە ڕێگاکانی نیشان بدەیت!

بەڵێ فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری ئەورووپی، سەبارەت بە چۆنیەتی بەرەنگار بوونەوەی توندڕەوی و ئسولیەت، وانەیەکی زۆر گرنگیان دادایین و لەمڕۆشدا ئێمە پێویستمان بەوەیە پەند لەو وانەیە وەربگرین، تا بتوانین چارەسەری ئەو هەلومەرجە ناهەموارەی پێبکەین کە پێیدا تێدەپەڕین.

## فێندەمێنتالیزمی مەسیحی لە خۆرئاوا

دادگاکانی پشکنین لەسەرەتای سەدەی سیانزەوە لەئەورووپای مەسیحیدا بە بڕیارێك لەلایەن پاپا "گریگۆری نۆیەم" دامەزرانو تاسەدەی هەژدە بەردەوام بوون، ئەم دادگایانە ئەو پەڕی دەسەڵاتی خۆیان لەئیسپانیای کاتۆلیکی پەڕگیردا مومارەسەکردووە. بەبڕیاری ئەو دادگایانە موسڵمانەکانی ئەو وڵاتە دەرکران، تەنانەت دوای ئەوەش کە لەژێر فشاردا بوونە مەسیحیو دەستبەرداری ئایینی خۆیان بوون. دژایەتیکردنی بیریارانو زانایانیش لەسەدەی سیانزەوە بەردوامبوو تاسەرەتاکانی سەدەی بیستەمو تەنانەت ڤاتیکان لیژنەیەکی تایبەتی بۆ قەدەغەکردنی کتێب دروستکرد[12]، ئەرکی ئەو لیژنەیە سانسۆرکردنی ئەو کتێبە فەلسەفیو زانستییانە بوو کەگومانی ئەوەیان لێدەکرا لەبیروباوەڕی مەسیحی ئەرسۆدەکسی لایاندا بێت..

بەمجۆرە کتێبەکانی (گالیلۆو دیکارتو سپینۆزاو دیدرۆ و جان جاك رۆسۆو ڤۆڵتێرو..هتد)، کەوتنە بەر ئەو شاڵاوە. لەو سەردەمانەدا زۆربەی فەیلەسوفەکان کتێبەکانیان لەهۆڵەندا چاپدەکرد، لەبەرئەوەی وڵاتێك بوو لەو رۆژگارەدا ئازادی زیاتری تێدابوو پاشان بەنهێنی دەیانبردە فەرەنسا. مێژوونووسیی هاوچەرخی ئەمریکی "رۆبێرت دارنتۆن"[13] چەندین لێکۆڵینەوەی دەربارەی ئەم مەسەلە گرنگە (مەسەلەی کتێبی قەدەغەکراوو چۆنیەتی رەوانەکردنی بۆ فەرەنسا بەشێوەیەکی نهێنی لەسەدەی هەژدەهەمدا)، بڵاوکردۆتەوە. دەتوانین بڵێین فێندەمێنتالیزمی مەسیحی دوو قۆناغی سەرەکی هەبووە، قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاستو قۆناغی سەدە نوێکان.. لێرە بەدواوە هەوڵدەدەین بەدوورو درێژی باس لەهەردوو قۆناغەکە بکەین.

## سەدەکانی ناوەڕاستو دادگاکانی پشکنین

دادگا بەدناوەکانی پشکنین وەك نموونەی ترۆپکی دەمارگیریو نالێکبووردەیی باسی لێدەکرێت. ئامانجیشی دژایەتیکردنی هەموو جۆرە لادانێك بوو لەبیروباوەڕی رەسمی و مەسیحی. لەسەرجەم ناوەندەکانیدا پیاوانی ئایینی بەو کارە راسپێردرابوونو هەریەك لەوان بەرپرسیاربوون لەوەی چاودێری ئەو کەسانە بکەن کە گومانیان لێدەکرا، بەمجۆرەو تەنیا لەرێی گومان لێکردن یاخود قسەی دەرو دراوسێوە، خەڵکی پەلکێشی دادگاکانی پشکنین دەکران. سەرەتا دەستیاندەکرد بەلێپرسینەوەی گومانلێکراوەکە بۆئەوەی دان

بەتاوانەکەیدا بنێت، گەر هاتوو ئیعترافی نەکرد ئەوا هەڕەشەی سزادانیان لێدەکرد. لەو کاتەشدا زۆریان خۆیان پێنەدەگیراو ناچار دانیان بەتاوانەکانیاندا دەناو داوای لێخۆشبوونیان دەکرد، هەندێکجار پەشیمان بوونەوەیان لێ قبوڵ دەکراو ئازادکران، بەڵام گەر گومانی ئەوەیان بکردایە کە لە تۆبە کردنەکەیاندا درۆ دەکەن و راستگۆنین، ئەوا دەیانخستە بەردەم سزایەکی جەستەی توند بۆئەوەی بەیەکجاری بڕوخێن. خۆ ئەگەر ئەو کەسە هەر سووربوایە لەسەر بۆچوونەکانی خۆیو پەشیمان نەبوایەتەوە لێیان، ئەوا ئاگریان بۆ دەکردەوەو دەیانسوتاند. خەڵکێکی زۆر بەم شێوە دڕندانەیە کوژرانو ئەمەش بووە پەڵەیەك بەناوچاوانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە.

هەندێك پێیانوایە ژمارەی ئەو قوربانیانەی لەو قۆناغەدا بەئاگر سوتێنراون، دەیانو بگرە سەدان هەزار کەس دەبن. لەبەناوبانگترینیشیان ریفۆرمستی بەناوبانگی چیکی "جان هۆس"ە[14] ئەم قەشەیە بەدڵسۆزیو خواپەرستیو رەوشت بەرزی بەناوبانگ بوو. هەروەها خاوەنی پلەوپایەیەکی بەرزی ئەکادیمیش بوو، بەو پێیەی لەسەرەتای سەدەی پانزەدا راگری زانکۆی پراگ بوو، بەڵام پیاوانی ئایینی رقیان لێهەڵگرت، لەبەرئەوەی پەردەی لەڕووی ئەو دەستڕێژییە ناڕەوایانە هەڵماڵی کەکڵێسا دەیکردە سەرخەڵکیو کڵێساش ئەوەی بەلادان لەبنەماکانی ئایینی مەسیحی دایە قەڵەم. هەروەها سەرنجی بۆ لای رەفتاری هەندێك قەشەو مەتران راکێشا کەئەرکی راستەقینەی سەرشانیان جێبەجێ ناکەن، بەڵکو تەنیا گرنگی بەبەرژەوەندی تایبەتی خۆیان دەدەنو خەڵکی سادەو ساکاریش هەڵدەخەڵەتێن. کڵێسای کاتۆلیکی ئەم قسانەی "هۆس"ی بەهەڕەشەیەك دەزانی بۆ سەرخۆی، هەربۆیە فەتوای تەکفیرکردنی دەرکرد. ئەگەرچی دوای بانگهێشتکردنی بۆ دادگا دڵنیایانکردەوە کەهیچی لێناکەن، بەڵام چاوبەستیان لێکردو هەرهەمان رۆژ (واتە لەبەرواری 6ی تەموزی 1415)دا، دەستگیریانکردو ئاگریان تێبەردا. دەبێت بزانین کەناوەرۆکی ئینجیل شتێکەو پراکتیزەکردنیش لەسەر زەمینەی واقیع شتێکیترە، لانی کەم ئەمە لەو قۆناغە ئەنگوستە چاوەی ژیانی مەسیحیەتی ئەورووپیدا وابوو.

هەر لەگرنگترینو بەناوبانگترین ئەو کەسانەی هێنرانە بەردەم دادگاکانی پشکنین، فەیلەسوفی ئیتاڵی "جۆردانۆ برۆنۆ"[15] و زانای بەناوبانگ "گالیلۆ" و تەنانەت "کۆپەرنیکۆس"یش بوو، کەباسی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا دەکردو توانی زۆر بەوریای خۆیەوە لەدەستیان قوتار بێت و ئەو کتێبەی باسی لەتیۆریا تازەکەی دەکرد، بڵاوکردنەوەی دواخست بۆ دوای لەدنیادەرچوونی! بەڵام چارەنووسی "جۆردانۆ برۆنۆ" جیاواز بوو، ئەم پیاوە دوای ئەوەی ماوەیەك بوو بەقەشە وازیهێناو خوی دایە فەلسەفەو کەوتە پەیڕەوکردنی تیۆریاکەی "کۆپەرنیکۆس". ئەم تیۆریایەش لەبەرئەوەی پاپاو فێندەمێنتالیزمی مەسیحی قەدەغەیان کردبوو، گومانیان لێپەیداکردو کەوتنە راوەدونانی. بۆیە ناچار بوو ئیتاڵیا جێبهێڵێو رووبکاتە فەرەنساو سویسراو ئینگلستانو ئەڵمانیاو لەزانکۆکانی ئەو وڵاتانەدا وەکو مامۆستایەك کاریکردووەو ئەمەش ناوبانگێکی زۆری بۆ پەیداکردووە.

دوای ساڵانێکی زۆر لەئاوارەییو دوورەوڵاتی مەیلی گەڕانەوەی دەکرد بۆ ئیتاڵیاو گەورە بازرگانێکی شاری ڤینیسیا داوالێکرد تابگەڕێتەوەو لەوێ منداڵەکانی فێری خوێندن بکاتو

بەدڵنیاییەوە بژی، بەڵام دەستبەجێ و لەگەڵ گەڕانەوەیدا دایەدەست دادگاکانی پشکنین لەڤاتیکان و ئەوانیش زمانیان بڕی و سوتاندیان، ئیتر "جۆردانۆ برۆنۆ" بوو بەنموونەی قوربانیدان لەپێناو راستی و ئازادی فیکرداو لەمێژووی ئەوروپاشدا بوو بەسومبولێک.. فێندەمێنتالیستە کۆنەپەرستەکان لەناوچوون، بەڵام ناوی ئەو لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو هەر دەدرەوشێتەوە. زانای بەناوبانگ "گالیلۆ" هەمان چارەنووسی دەبوو، گەر لەدواساتدا فریای خۆی نەکەوتایەو دەستبەرداری تیۆریا بەناوبانگەکەی نەبوایە. لەبەرامبەردا ڤاتیکان چاوپۆشی لێکردو حوکمی لەسیدارەدانیان بەسەردا جێبەجێ نەکرد، بەڵام دواتر رەوانەی فلۆرەنسایان کردو لەیەکێک لەگەڕەکەکانی ئەو شارەدا دەست بەسەریانکرد، بۆئەوەی لەژێر چاودێری خۆیاندا لێکۆڵینەوەکانی ئەنجامبدات. دوای تێپەڕبوونی زیاد لەسێ سەدساڵ بەسەر دادگایکردنەکەیدا، کڵێسای کاتۆلیکی دانی بەوەدانا کەناهەقی بەرامبەر بە "گالیلۆ" کردووە! پرۆسەی سوتاندنی دادگاکانی پشکنین تاسەدەی حەڤدەهەم و تەنانەت سەدەی هەژدەش هەر بەردەوامبوو، نێڵەی ئاگری ئەو دۆزەخە تەنیا ئەو کاتە خامۆش بوو کەسەردەمی رۆشنگەری دەستپێیکردو رۆژگاری تاریکی و بیرتەسکی بەسەرچوو.

هەر سەبارەت بەو مەسەلەیە بانموونەیەکی تر بەرچاوبخەین، لەئەوجی سەردەمی رۆشنگەریدا رووداوێکی بەناوبانگ لەکەسێک رویدا کەناوی "لابار"بوو[16]، ئەم کوڕە هەرزەکارێکی نۆزدەساڵان بوو، لەبەرئەوەی خاچێکی شکاندبوو دەستیان بڕی و زمانیان قرتاندو دواجار سوتاندیشیان. "ڤۆڵتێر" ئەم رووداوەی قۆستەوەو هێرشێکی توندی کردەسەر فێندەمێنتالیستە مەسیحییەکان.

هەروەها لەجنێڤیش "میشێل سێرڤیە"ی فەیلەسوفیان بەزیندوویی سووتاند، بەتۆمەتی گومانکردن لەعەقیدەی (باوک، کوڕ، رۆحی پیرۆز) کە لەعەقیدە سەرەکییەکانی ئایینی مەسیحییە. تەنیا گومانکردن لەڕاستیی ئەو عەقیدەیە بەس بوو بۆئەوەی ببێتە خۆراکی ئاگرو لەم سەروبەندەشدا نە زانست و نە ئینسانییەت و نەفەلسەفەکەی، بەهانایەوە نەهاتن و شفاعەتیان بۆ نەکرد. لەئیسپانیاش کاتێک لەساڵی 1492 شانشینی غەرناتە خۆیدا بەدەستەوە (کەدوایین دەوڵەتی ئیسلامی بوو لەئیسپانیا)، بەڵێنی ئەوەیان بەموسڵمانانندا کە لەبەرامبەر ملکەچکردنیان بۆ دەسەڵاتی تازە رێگایان پێدەدەن سرووتە ئایینییەکانی خۆیان ئەنجام بدەن، بەڵام هەرزوو لەو بەڵێنەی خۆیان پەشیمان بوونەوەو کەوتنە راوەدوونانیان، ئەوەبوو شاژنی بەناوبانگی ئیسپانیا "ئیزابیل" سەرپشکی کردن لەنێوان ئەوەی یان دەبنە مەسیحی یان دەبێت وڵات بەجێبهێڵن. زۆرێک لەوانە بۆ پاراستنی ژیانی خۆیان بوونە مەسیحی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر وازیان لێنەهێنان و چاودێریان دەکردن و بەگومان بوون لێیان، چونکە پێیان وابوو بەنهێنی و لەژێرەوە خەریکی ئەنجامدانی سرووتە ئیسلامییەکانی خۆیانن، بۆیە تاوانباریان کردن بەلادان لەبیروباوەڕی مەسیحییەت و کەوتنە سزادانیان. چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەو بەو جۆرە زۆر سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە بڕیاری دەرکردنی بەکۆمەڵیان لەئیسپانیا درا[17]. لەساڵی 1609 – 1610 نزیکەی 275000 کەس لەئیسپانیا دەرکران و روویانکردە وڵاتانی ئیسلامی وەک مەراکیش و تونس و جەزائیرو تەنانەت چوونە هەندێ لەوڵاتانی مەسیحیش، بەمجۆرە ئەم کێشەیە

بەشێوەیەکی رادیکاڵی و لەڕەگ‌وڕیشەوە دەرکێشان چارەسەرکرا.

## فێندەمێنتالیزمی مەسیحی و سەردەمە نوێکان

ئێستا دێینە سەرباسی ئەوەی کە لەدوای سەردەمی ڕێنسانس‌و ریفۆرمی ئایینی لەسەدەی شازدەهەمدا روویداوە. عادەتەن ئەم قۆناغە بەسەردەمە نوێیەکان ناونووس دەکرێت، ئەگەرچی لەڕاستیدا ئەم سەردەمانە دوای دووسەد ساڵ واتە لەکۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا نەبێت، سەرکەوتنیان بەدەستنەهێناو جێ پێی خۆیان نەکردەوە. ئیتر لەو کاتەدا دابڕانێکی ئەپستمۆلۆژی گەورە لەنێوان سەدەکانی ناوەڕاست‌و سەردەمی تازەدا روویدا. دوای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ریفۆرمی ئایینی‌و ڕێنسانس لەسەدەی شازدەهەمدا دوو کەس دەبنە دوژمنی سەرسەختی رۆماو ڤاتیکان، ئەوانیش بریتیبوون لە "مارتن لۆتەر"ی[18] پرۆتستانتی‌و "ئیراسمۆس"ی[19] رابەری بزووتنەوەی ڕێنسانس. لەبەرئەوە پاپا فەتوا بەناوبانگەکەی خۆی دەرکردو ((لۆتەر))ی تەکفیرکردو ساڵی 1521 لەکڵێساش دەریکرد. ئیتر لەوکاتەوە جیهانی مەسیحی لەئەوروپا بوو بەدوو بەشەوە: بەشێك کاتۆلیکی‌و ئەویتریان پرۆتستانتی‌و بۆ ماوەی دوو سەد ساڵ جەنگ‌و شەڕوشۆڕێکی زۆر لەنێوانیاندا بەردەوام بوو.

ئەمە ئەو جەنگە ئایینییە بەناوبانگەیە کەدەیان‌و بگرە سەدان هەزار کەسی کردە قوربانی، ئەم جەنگە لەنێوان ساڵانی 1562-1598 لەفەرەنسا تاوی سەندو گەیشتە ئەوپەڕی، کاتێك کاتۆلیك مەزهەبەکان پەلاماری پرۆتستانتییەکانیان دا (کەکەمینەیەك بوون لەوڵاتدا)و قەتڵ وعامیان کردن. گەورەترین تراژیدیاش قەسابخانەکەی (سانت بارتیلمی) بوو کەتەنیا لەماوەی سێ رۆژدا پێنج هەزار کەسی تیاکوژرا. ئەوانەی قوتاربوون فەرەنسایان بەجێهێشت‌و روویانکردە وڵاتانی دیکەی ئەوروپاو جیهان، تائێستاش هەندێك لەو بنەماڵانەو دوای سێ سەدە مانەوەیان لەئەڵمانیاو هۆڵەنداو سویدو ئینگلستان‌و تەنانەت کەنەداش، دەستبەرداری ناوە فەرەنسییەکانی خۆیان نەبوون. ئەو رووداوە لەسەردەمی "لویسی چواردەهەمدا" بوو. کە لەبەر هێزو دەسەڵاتی زۆری نازناوی پادشای خۆریان لێنابوو. سەبارەت بەقەتڵ وعامەکەی (سانت بارتیلمی)، لەمساڵدا "پاپا" عوزرخوایی بۆ پرۆستانتەکان هێنایەوەو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش ئیعترافی بەدەمارگیری‌و توندڕۆیی کاتۆلیکییەکان‌و ئەو تاوانە دڕندانەیە کرد کە لەدژی برا پرۆتستانتەکانیان ئەنجامیانداوە. هەرچەندە ئەوانە هەموویان مەسیحین، بەڵام ناکۆکی مەزهەبی توند لەنێوانیاندا هەیە. شایەنی باسە پرۆتستانتەکان لەو وڵاتانەدا کەزۆرینەن هەمان رەفتاریان لەگەڵ کاتۆلیکەکاندا کردووە، کەواتە، دەمارگیری‌و توندڕەوی لەهەردوولاوە دێت نەك لەلایەکەوە.

لەکۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەمدا کتێبەکانی هەریەك لە "مارتن لۆتەر" و "ئیراسمۆس"، لەسەرووی لیستی کتێبە قەدەغەکراوەکاندا بوون، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی لەگۆڕەپانە گشتییەکاندا سووتێران و ئاگریان تێبەردرا. لەسەدەی حەڤدەهەمیشدا کتێبەکانی ((دیکارت)) هەمان چارەنووسیان هەبوو،

کاتێك کڵێسا "دیکارت"ی وەك پیاوێکی بێئیمان دایە قەڵەم.

هەرچی فەیلەسوفێکی وەك "سپینۆزا"شە ئەوا لەیەك کاتدا زۆری بەدەست دەمارگیری یەهودیو مەسیحییەوە چەشت، یەکێك لەجولەکە توندڕەوەکان هەوڵی تیرۆرکردنیدا، بەڵام خۆشبەختانە خەنجەرەکەی تەنها پاڵتۆ ئەستوورەکەی بڕیو خۆی بێزیان بوو. لەسەدەی هەژدەمیشدا بەئاشکرا شەڕی نێوان فەیلەسوفانی رۆشنگەریو رابەرانی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی دەستی پێکرد، ئەم شەڕە شەڕێکی قورسو بێئامان بوو، هەرچی چەکی فیکریو نافیکری هەیە تیایدا بەکارهاتو دواجار بەسەرکەوتنی رۆشنگەری کۆتاییهات. ئیتر لەوکاتەوە ئەوروپا کەوتە خۆیو بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر لەڕووی شارستانییەوە چووەپێشو توانی کۆنترۆڵی تەواوی جیهان بکات، بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کەهێزە فێندەمێنتالیستەکان بەئاسانی خۆیان بەدەستەوە داوەو گۆڕەپانەکەیان چۆڵکردووە، بەڵکو بەدرێژایی سەدەی نۆزدەو تابەراییەکانی سەدەی بیستەمیش بەردەوام، دژایەتی هێزە رۆشنگەرەکانیان دەکردو لەهەوڵی ئەوەدابوون کۆسپو تەگەرە بخەنەبەردەم رەوڕەوەی پێشکەوتن. بەڵگەش بۆ ئەم قسانە ئەوەیە کەبەسەر قەشە "ئەلفرێد لوازی"دا[20] هات، ئەم پیاوە بەهۆی بۆچوونە بوێرەکانییەوە تەواوی ئەو پلەوپایانەی لەزانکۆدا هەیبوو لێی سەندرایەوە. هەرچەندە "لوازی" پیاوێکی ئایینی بڕوادار بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فێندەمێنتالیستەکان رۆشنفکری و ئەقڵ روونی ئەویان بۆ قووت نەدەچوو. وەك ئاشکرایە "ئەلفرێد لوازی" رابەری ئەو بزاوتە بەناوبانگەی ناو فەرەنسای دەکرد کەپێی دەڵێن مۆدێرنیزم (*Le modernisme*)، هەروەها دەیویست میتۆدی مێژوویی بەسەر تێکستە سەرەکییەکانی ئایینی مەسیحیدا پراکتیزە بکات. "لوازی" سەلماندی "عیسای کوڕی مریەم" تەنیا پێغەمبەرەو هەڵگری سیفەتی خوایەتی نییە، بەم قسەیەی دنیای لێڕاپەڕی، بۆیە ناچار پاریسی جێهێشتو روویکردە لادێو لەوێ تەریكو گۆشەگیر مایەوە. پاشان لەساڵی 1908 پاپا بڕیاری تەکفیرکردن و دەرکردنی لەکڵێسادا دەرکرد. سێ ساڵ بەر لەو بڕیارەش کتێبەکانی خرابووە سەروو لیستی کتێبە قەدەغەکراوەکان، بەڵام لەساڵی 1953 ئەو بڕیارە هەڵگیرا.

ئەوکات پاپا "بیۆسی دەیەم" بڕیاری تاوانبارکردنی سۆسیالیزمیو لیبرالیزمو دیموکراسیو مافەکانی مرۆڤو تەواوی بیروبۆچوونە نوێیەکانی دەرکردو هەموویانی بەکوفر دایە قەڵەم، بەمجۆرە سەرلەنوێ ململانێ لەنێوان مۆدێرنەو فێندەمێنتالیزمی مەسیحییەتدا دەستی پێکردووەو تەنیا لەساڵی 1962دا نەبێت (کەکۆڕی بەناوبانگی کڵێساکان بەناوی ڤاتیکانی دووەمەوە بەسترا)، ئەم کێشەیە یەکلایی نەکرایەوەو کۆتایی پێنەهات.

مەسیحییەکان ئیتر هەستیان بەوەکرد ناتوانن تاسەر دژایەتی رۆژگار بکەنو گەر لەسەر ئەو توندڕەوییەی خۆشیان بەردەوام بن ئەوا هەموو شتێك دەدۆڕێنن، بەمجۆرەو بۆ یەکەمجار ئیعترافیان بەشەرعیەتی میتۆدی مێژووییو نێو-لێکدانەوەی تازە بۆ ئایین کرد. هاوکات سازشی دیکەیان بۆ بۆچوون و دنیابینییەکانی سەردەمی تازەکرد. لێرەوە گەیشتنە دۆزینەوەی فۆرمێك بۆ پێکەوەژیان لەنێوان مەسیحییەتو مۆدێرنەدا، فۆرمێکی گونجاوی وا کەهەر لایەنەو مافی خۆی بدرێتێ، بەڵام هێشتا هێزی توندڕەوی وەها مابوو کەبڕیارە

بوێرانەكانی كۆڕی كڵێساكانی ڕەتدەكردەوەو هەرسووربوو لەسەر هەڵوێستو پێگە تەقلیدییەكەی جارانی خۆی. ئەمەش بووەمایەی ئەوەی ململانێ لەنێوان مەسیحییەكان خۆیاندا دروست بێت، واتە لەنێوان باڵی لیبراڵی نوێخوازو باڵی فێندەمێنتالیزمی دۆگماتستیدا، ئەم ململانێیەش تائەمڕۆ بەردەوامە. ئەگەرچی باڵی لیبراڵەكان سەركەوتوو بوون لەو ململانێیەدا.

بەڵام دەبێت ئەوە لەبیرنەكەین كەگەر پێشكەوتنو پەرەسەندنی كۆمەڵگا ئەوروپییەكان نەبووایە لەڕووی زانستیو تەكنۆلۆژیو ئابووریو هەروەها بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەران لەو وڵاتانەدا، ئەوا ئاقاری ئەقڵانی نەیدەتوانی بەسەر باڵی سەلەفی توندڕەودا زاڵبێتو سەركەوتن بەسەریدا بەدەستبێنێت. بەمجۆرە دەبینین ئەم شەڕە لەئەوروپادا (واتە شەڕی فێندەمێنتالیزم) تا بەلاداخرا، ماوەی سێ سەدەی خایاند. ئەمەش مانای وایە ئەو كێشەیە چەندە قورسو گرانو مەترسیدارە. دواجار ئەگەر ئەقڵانییەتو ڕۆحی زانستی لەناوەندێكی گەورەو بەرفراوانی مەسیحییەكانی ئەوروپادا بڵاونەبووایەتەوە، ئەوا ئاقاری پێشكەوتنو ڕۆشنگەری سەركەوتوو نەدەبوو.

## فێندەمێنتالیزمی مەسیحیو ڕۆشنگەری ئەوروپی

ئێمە وای مەزندە دەكەین كە كۆمەڵگە ئەوروپاییەكان تەواو خاڵی بن لە ئایین و پێمان وایە بە درێژایی مێژووش هەروا بووە: بێباوەڕ، زانستی، تەكنۆلۆژی و لە سەرو شتە مادیەكانیشەوە بڕوای بە هیچ شتێكی دی نییە. پاشان وا دەزانین پرۆسەی نوێ بوونەوەكەی لە دەرەوەی هەموو پەیوەندیەك لەگەڵ ئاییندا، دروست بووە و گەشەی كردووە، وەك ئەوەی لە هیچەوە دروست بوو بێت. هەروەها پێمان وایە ئایین بەردەوام لەو كۆمەڵگایانەدا شتێكی لاوەكی و پەراوێز بووە. داخۆ ئەم وێنە نامێژووییەمان، سەبارەت بە دروست بوونی مۆدێرنەی ئەوروپی، چۆن لا دروست بووە؟ ئەو دابڕانە گەورە و ترسناكە چۆن لە نێوان ئێمە و ئەواندا دروست بوو؟ ئەی بۆچی چەندین كتێب بۆ تاوتوێكردنی ئەو ململانێ بێئامانە تەرخان ناكەین، كە لەناو كۆمەڵگە ئەوروپییەكاندا و لە نێوان عەلمانییەكان و فێندەمێنتالیستەكاندا بەرپابوو؟ پێموایە ئەوەی ئەم بۆچونە نادروستەی لای ئێمە دروستكردووە، ئەو كەلێنە مێژووییەیە كە لە نێوان ئێمە و ئەواندا هەیە و لە دوو سەد ساڵێك زیاتر دەبێت.

ئەگەر كەمەكێك نەگەڕێینە دواوە، ئەوا لەو ململانێ دراماتیكیە تێناگەین كە لە كیشوەری ئەوروپادا ڕوویداو بووە مایەی دروستبوونی ئەم شارستانیەتە مۆدێرنەی ئەمڕۆكە بەچاوی خۆمان دەیبینین. پەیبردن بە هۆكارەكانی دروستبونی ئەم شارستانیەتە، گرێدراوی ئەو وێنە مێژووییەیە كە ئێمە دەربارەی سەركێشیەكانی مۆدێرنە لەگەڵ كڵێسا و فێندەمێنتالیزمی مەسیحی دەیخەینەڕوو. من ئەم كارە بۆ ئەوە ناكەم تا كتومت لاسایی ئەو ئەزموونە بكەینەوە، بەڵكو بۆ ئەوەمە پەند و ئەزمونی لێوەربگرین. من وەك چۆن دژی لاسایكردنەوەی كتومتم، ئاوەهاش دژی ئەوەم، سودوەرگرتن لە ئەزموونی گەلانی پێشكەوتوو وەلاوەبنرێت و ڕەتبكرێتەوە.

بۆچی ڕۆشنبیری ئێمە، سەروەختێك سەودا لەگەڵ تێكستی فەیلەسوفە هاوچەرخەكانی ئەوروپادا دەكاتو بەر كێشەو گرفت و زاراوەكانیان

دەکەوێت، هەست بە نامۆ بوون دەکات؟ لەبەرئەوەی ئیشکالیەتی ئایین، بە هیچ جۆرێك لەو تێکستانەدا نییە.. ئەی بۆچی کاتێك دووسەد ساڵێك دەگەڕێتەوە دواوەو سەرنج لە تێکستەکانی "سپینۆزا" و "ڤۆڵتێر" و "ڕۆسۆ" دەدات، هەست بە ئاشنایەتی و نزیکایەتیەك دەکات؟ بێگومان ئەمەیان لەبەرئەوەیە کە ئایین جێبایەخ و گرنگی ئەو پۆلە بیریارە بووە. ئەوەی لەو قۆناغەدا فەیلەسوفانی ئەوروپا پێیەوە سەرقاڵ بوون، مەسەلەی (فێندەمێنتالیزم و تۆلێرانس و تێگەیشتنی ئایین بەشێوەیەکی مۆدێرن و دەمارگیری و شەڕی ئاینزاکان) بووە. تێکڕای ئەم کێشانە دواتر نەمان و بۆ فەیلەسوفانی هاوچەرخی ئەوروپی شایەنی باسکردن نەبوون.

ئەم کەلێنە مێژووییەی لە نێوان پێشکەوتنی کۆمەڵگەکانی ئەوان و دواکەوتوویی کۆمەڵگەکانی ئێمەدا هەیە، ئەوەیە کە ناهێڵێت لە ڕووی فیکرییەوە هاوسەردەمیان بین، هەرچەندە لە ڕووی زەمەنیەوە، هاوکات و هاوسەردەمین. ئەگەر ئەم خاڵە لەبەرچاو نەگرین، ئەوا هیچ شتێك لە فیکری ئەوروپی حاڵی نابین. لێرەوە هەڵوێستی ڕۆشنبیرانی ئەوروپایی بەڕاست نازانم کە بە دەمارگیر و توندڕەو تاوانبارمان دەکەن و ئەوەیان لەبیر دەچێت خۆیان بەر لە سێ سەدە، چۆن چۆنی گیرۆدەی دەمارگیری کەلەپوور و پیاوانی کڵێسا بوو بوون. من پێم سەیرە ڕۆشنبیرانی ئێمە وا دەزانن، دەکرێت بگەینە مۆدێرنەی ڕاستەقینە (ئازادیە دیموکراسیەکان و پلورالیزمی ڕۆحی و سیاسی)، بەبێ ئەوەی بە ئاشکرا ڕووبەڕووی ترادسیۆن و کەلەپووری خۆمان ببینەوە. بەڵام با ئێستا واز لە هەموو ئەوانە بێنین و بەو ململانێیەوە خەریك بین کە لە ئەوروپادا دەستی پێکرد و نزیکەی سێ سەدەی خایاند.

تێکڕای لێکۆڵیاران کۆکن لەسەر ئەوەی کۆمەڵگە ئەوروپاییە مۆدێرنەکان، بەرهەمی سەردەمی ڕۆشنگەرین. ڕاستە سەرەتاکانی مۆدێرنە لە سەدەی شانزە و لەگەڵ سەردەمی ڕۆشنگەری و ڕیفۆرمی ئایینیدا دەستی پێکرد، بەڵام دابڕانی یەکجارەکی لەگەڵ سەدەکانی ناوەڕاستدا، تەنها لەسەدەی هەژدەدا بوو. "پۆل هازار" لە تێزە بە ناوبانگەکەیدا باس لەوە دەکات کە هوشیاری ئەوروپی لە کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا، لەگەڵ خۆیدا کەوتە قەیرانێکی قوڵەوە و بیر و بۆچوونەکانی ڕۆشنگەریش لەماوەی نێوان ساڵانی 1680 و 1715 دا، بەدەرکەوتن. ئەوکات ئیتر کێشەی نێوان فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری و بیریارانی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی تەقیەوەو هەرچی چەك و ئامرازێکیش هەیە، تێیدا بەکار هات. ئەوەی قارەمانی ئەم ململانێیە بوو، کەسانی وەك: "سپینۆزا" و "پییر بایل" و "بوسوێ"[21]ی سەرکردەی فێندەمێنتالستەکانی فەرەنسا بوون. سەروەختێکیش لە سەدەی هەژدەدا، کەسانی وەك: "ڤۆڵتێر" و "دیدرۆ" و "ڕۆسۆ" هاتن زەمینەیان لە بەردەمدا خۆشکرابوو، ئەمانەیش لەسەر هەمان ڕێگای ئەوان ڕۆیشتن، تا بەیەکجارەکی ڕۆشنگەری لە نیوەی دووەمی ئەو سەدەیەدا سەرکەوت.

شایەنی باسە "بوسوێ" هەستی بە مەترسی بیرو بۆچوونی نوێ لەسەر بیروباوەڕی تەقلیدی کرد، ئەوەتا لە ساڵی 1687 دا دەنووسێت و دەڵێت: (من خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگێکی گەورە لە دژی کڵێسا بەدی دەکەم، لە ژێر ناوی فەلسەفەی دیکارتیزمدا. بە بیانووی ئەوەی نابێت بروا بە هیچ شتێك بێنین، تا بەشێوەیەکی ڕاست و دروست نەیسەلمێنین، ئەوانە گومان لە هەموو شتێك دەکەن و پەلاماری کەلەپوور و ترادسیۆن دەدەن)[22].

پاشان داخی دڵی خۆی بە "سپینۆزا" دەڕێژێت، چونکە باوەڕی بە موعجیزە نییە و دەیەوێت یەزدان ملکەچی یاساکانی سروشت بکات! لە شوێنێکدا دەڵێت: (خوای موسا دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت. چۆنی بوێت کار ئاسان دەکات و گرانیشی دەکات. ئەو خۆی یاساکان بە سروشت دەبەخشێت و کەیش ویستی بوو ئەو یاسایانە ناهێڵێت. هەر ئەوە موعجیزەی سەر سوڕهێنەرمان نیشاندەدات، تا بونی خۆی بیری ئەو کەسانە بخاتەوە کە لە بیریان کردووە. یەزدان ئەو کارانە بۆیە دەکات، تا بیسەلمێنێت سەروەری تاک و تەنهای گەردونە و ئێرادەشی تاکە دەسەلاتە جڵەوی سستمی جیهان دەکات)[23]. بەلاّم "سپینۆزا" هەرگیز بونی خوای ڕەتنەکردۆتەوە. ئەو تەنها دەیووت: (خوا لە ڕێگەی یاساکانی سروشتەوە دەردەکەوێت و پێویستی بە ئینکارکردنی نییە، بۆ ئەوەی بوونی بسەلمێنێت). بەمجۆرە دوو تێڕوانینی جیاواز لە بەرامبەر یەکدا وەستان: یەکەمیان ڕەگوڕیشەیەکی داکوتراوی هەیەو لە فێندەمێنتالیزمی مەسیحیدا بەرجەستەیە، دووەمیشیان دیاردەیەکی تازەیەو پشت بە مەرجەعیەتی دیکارتیزم و گورانی زانستی مۆدێرن دەبەستێت. بێگومان لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا تەرازووی هێز، بەلای "بوسویٚ"دا لاسەنگ بوو، نەك بەلای "سپینۆزا"دا. بەلاّم تێڕوانینی تازە بۆ ئایین، گاف گاف دەهاتە پێش، تا سەرەنجام سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

ئەم شەڕو ململانێیە وەکو هەندێك پێیان وایە، لە نێوان ئیمان و بێباوەڕیدا نییە، بەڵکو لە نێوان ئیمانی تەقلیدی و ئیمانی مۆدێرندایە. شەڕی نێوان ئیمانێکی کوێرانە و ئیمانێکە کە لەسەر ئەقڵ و زانست و تێفکرین دامەزراوە. هەر لەبەرئەمەش "بوسویٚ" ئەو ئایینە نوێیەی بە هەڕەشەیەك دەزانی، بۆ سەر پێگەی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی. لەمبارەیەوە دەڵێت: (چەند لەو فەیلەسوفانە داخ لەدڵم کە پلان و ڕێو شوێنی گرتنە بەری یەزدان لە گەردوندا، بە ئارەزووی فیکری خۆیان پێوانە دەکەن)[24]. ئەو لەم شالاّوەیدا، تەنانەت قەشە "مالبرانش"یش هەڵنابوێرێت، ئەگەرچی ئەویش وەك خۆی پیاوێکی ئایینیە و دەڵێت: (هەرچەندە مالبرانش کەسێکی خاکی و نیەت پاکە، بەلاّم هەوادارانی ڕاستەوخۆ بەرەو گومڕایی دەچن. بۆچی؟ لەبەرئەوەی پەیڕەوی میتۆدی دیکارت دەکات و تەفسیری ئەقلاّنی بۆ شتەکان دەکات و موعجیزەکان بە ڕاست نازانێت). دواجار "بوسویٚ" دەگاتە "دیکارت" خۆشی کە مامۆستای تەواوی ئەو قوتابخانەیەو دەڵێت: (من لە فەلسەفەکەیدا سیٚ شت بەدی دەکەم: یەکەم، هەندێك بەڵگەی ئەقلاّنیە کە دەشێت بۆ بەگژا چوونەوەی گومڕاو بێبڕواکان بەکار بهێنرێت. ئەمەش تاکە شتێکی ئیجابیە لە فەلسەفەکەی ئەودا.

دووەم، هەندێك تیۆریای فیزیای هەیە کە دەتوانین پەیڕەویان بکەین یان نا. بەهەرحالْ ئەمە گرنگیەکی ئەوتۆی نییە، لەبەرئەوەی دوور و نزیك پەیوەندی بە ئایینەوە نییە. بەلاّم سێیەم شت لە فەلسەفەکەیدا ترسناکە، لەبەرئەوەی هەڕەشەیە بۆ سەر ئیمان. بەم پێیە لە هەناوی ئەم فەلسەفەیەوە کە لەسەر گومان دروست بووە، بیٚ بڕوایی سەرهەڵدەدات. ئەمەش مانای وایە کاردانەوەی خراپی بۆ سەر ئەو بیروباوەڕانە دەبێت کە لە باب و باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە. فەلسەفەی دیکارتیزم لەسەر ڕەخنە و شەن و کەوکردنێکی زۆر توند دامەزراوە و سنوری بۆ نییە و ڕەنگە بگاتە ئایینیش. مەترسی گەورەش لێرەدایە). ڕاستیەکەی نابێت ئەو مەترسیانەی "بوسویٚ" تەواو فەرامۆش بکەین. چونکە

ڕەنگە هەندێك لە شوێن كەوتوانی فەلسەفەی دیكارتیزم، زیاد لە پێویست بە ئەقڵ و زانست لە خۆبایی بووبن و كەوتبنە سوكایەتی پێكردن و فەرامۆشكردنی ئایین. دواتر هەرواش كەوتەوە، كاتێك ئاقارێكی بێباوەڕی – مادی پەتی دروست بوو. ئەو كات قسەكەی "لویس پاستۆر"ی زانا هاتەدی كە دەڵێت: (تۆزێك لە زانست لە خوا دورمان دەخاتەوە زانستی زۆر دەمانگێڕێتەوە بۆ لای). دواجار ئەوەی بەردەوام بوو ئاقاری ئیمانداری مۆدێرن بوو، نەك تەنها ئاقاری بێ باوەڕی.. كەواتە ئەوەی هەڕەشەیە بۆ سەر فێندەمێنتالیزمی دۆگما، ئیلحاد و بێباوەڕی نییە، بەڵكو بیروبڕوای كراوەیە كە لەسەر زانستێكی پتەو دروست بووبێت.

قەیرانی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی و تەواوی فێندەمێنتالیستەكانی دیكە، ئەوەیە خۆیان و یەزدان، وەك یەك شت سەیر دەكەن و خۆیان بە تاكە ڕێگایەك دەزانن بۆ گەیشتن بە خوا. ئەوانە ناتوانن لەوە تێبگەن كە دەشێت ڕێگایەكی دیكە بۆ ئیمانداری و تێگەیشتن و تەئویلكردنی دەق هەبێت. لە مبارەیەوە بیریاری هاوچەرخی فەرەنسی "جۆرج گۆسدۆرف" دەڵێت: (لە سستمی تەقلیدی مەسیحیدا، كڵێسا تاكە شوێنێك بوو بۆ دروستكردنی پەیوەندی لە نێوان مرۆڤ و یەزداندا. دەشبوو ئەم پەیوەندییە بەشێوەیەكی ناچاری و لە ڕێی سستمی هیراركی كڵێساوە بەرجەستە بێت. واتە كڵێسا ئامرازی گەیشتن بوو بە بڵندەگی، بەڵام دواتر بۆ خۆی بووە ئامانجێك. بەمجۆرە قودسیەتی دا بە خۆی و وەك یەكیەكی لە نێوان خۆی و حەقیقەتی ئیلاهیدا دروستكرد، ئەگەر چی لە خۆیدا دامەزراوەیەكی ئینسانییە. ئیتر كار گەیشتە ئەوەی جیاوازی لە نێوان خزمەتكردن بە خواو خزمەتكردن بە كڵێسا، بوو بە كارێكی مەحاڵ. تا ئەوەی پیاوانی ئایینی حەزوو ئارەزووە تایبەتیەكانی خۆیان تێكەڵ بە پیرۆزی یەزدان دەكرد)[25].

ئەم فێڵە بەسەر زۆربەی زۆری خەڵكدا تێپەڕیو نەیاندەتوانی جیاوازی لە نێوان ئایین و پیاوانی ئایینیدا بكەن.. پیاوی ئایینی ڕەنگە كەسێكی پاك و سەر ڕاست بێت و بنەما سەرەكیەكانی ئایین وەك خۆی جێبەجێ بكات، بەڵام لەوانەیە كەسێكی هەلپەرست و چاوچنۆكیش بێت، كە تەنها بیر لە تێركردنی حەزو بەرژەوەندیە تایبەتیەكانی خۆی بكاتەوە. هەرچۆنێك بێت دەبێت لە چوارچێوەی گشتی بەرەو پێشچونی مێژویدا، لە شكست و پاشەكشەی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی لە خۆرئاوا، تێبگەین. لەم پرۆسەی شكست و پاشەكشێیەدا، چەند هۆكارێك هەبوو، لەوانە: دادگا بەدناوەكانی پشكنین، كە بە درێژایی چەندین سەدە كەوتە ڕاوەدونان و شار بەدەركردنی زانایان و فەیلەسوفان، لەگەڵ سوتاندنی كتێبەكانیان یاخود تۆماركردنیان لە لیستی كتێبە قەدەغەكراوەكاندا. دادگاكانی پشكنینی وڵاتی ئیسپانیا بە تەنها، لە نێوان ساڵانی 1480 و 1834دا، سەد هەزار كەسیان سوتاند!.. هەروەها شەڕی مەزهەبی نێوان كاتۆلیك و پرۆتستانتەكان، بە درێژایی سەدەی شانزەو حەڤدە كە ملیۆنەها مرۆڤی لە ئەڵەمانیاو فەرەنسا و ئینكلتەراو سەرتاسەری ئەوروپادا كردە قوربانی، ڕۆڵی لە شكست پێهێنانی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی لەو كیشوەرەدا هەبوو. ئەم جەنگانە بوونە مایەی بێزاربوونی خەڵك لە فێندەمێنتالستە توندڕەوەكان، ئەوانەی كۆیان لەوە نەدەكرد بانگەواز بۆ تیرۆر و كوشتن و بڕین بكەن. دەرهەق بەم كارەش لە دوایدا كڵێسای مەسیحی باجێكی قورسیدا، چونكە خەڵك تەكیەوە و ڕوی وەرگێڕاو پاشان دەستەدەستە بڕوایان بە زانست و ئەقڵانییەت هێناو داخڵ بە سەردەمی مۆدێرنەبوون. لە پاڵ ئەو دوو هۆكارەشدا هۆكاری سێیەمیشمان

هەیە کە ناتوانین چاوپۆشی لێبکەین، ئەویش: هاتنە ئارای شارستانیەتێکی پیشەسازی و زانستی بوو لە سەدەی هەژدەهەمدا و گەشە و هەڵکشانی خێرای بوو لەو ساتە وەختەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ. ئەم شارستانیەتە بووە مایەی فۆرمەلە بوونی کەلتورێکی دنیاگەرایی – زانستی کەبووە ڕکابەری ئەو کەلتوری کڵێسایەی، بە درێژایی چەندین سەدە مێشکی خەڵکی داگیر کردبوو. ئەم کەلتوورە مۆدێرنە، کەم تا زۆر بووە مایەی پاشەکشە پێکردنی فێندەمێنتالیزم، تا وای لێهات بە تەواوەتی نەما. هاوشان بەم پرۆسەیەش لێکدانەوەیەکی تازە بۆ ئایین سەریهەڵدا کە لەسەر ڕوناکی ئەقڵ و متمانەکردن بە زانست و توانستەکانی مرۆڤ دامەزرابوو. ئەمەش بووە مایەی دارمانی ئەو لێکدانەوە فێندەمێنتالیزمەی، پایەکانی ترس و تۆقاندن بوو. بەمجۆرە ئەو کۆدێتا بنەڕەتیە ڕویدا کە ئەوروپا دوای ژان و گێنگڵێکی سەخت، پێیگەیشت. دواجار ئەوروپا گەیشتە مۆدێلی ئیماندارییەك کە لەسەر ئازادی و خۆشەویستی و باوەشکردن بە ژیاندا دامەزراوە، بەمەش شوێنی ئەو ئیمانداریییەی سەدەکانی ناوەڕاستی گرتەوە کە لەسەر زەبر و زۆر و تەرێزکردن لە زیندەگی دروستبوو بوو.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

1-بڕوانە: رینێیە دیکارت، وتارێك دەربارەی میتۆد

*Rene Descsrtes، Discours dela methode، op. cit.، p. 51.*

2-بڕوانە: ڕۆلان مۆرتیێ، دڵ و ئەقڵ

*Roland Mortier، Le caure et La raison. Recueil detudes sur Le XvIIIe siecle، Voltaire foundation، 2000.*

3-بڕوانە کتێبەکەی "کاسیرەر": فەلسەفەی ڕۆشنگەری

*Ernst Cassirer، La Philosophie des Lumieres. Fayard، paris، 1970، pp. 39-40.*

*4-Descartes، Discours de Lamethode، op. cit.، p.51.*

5-بڕوانە تێکستەکەی "پاسکال" لە:

*De La Renaissance alaube des Lum ieres، seuil، paris، 1997، p. 277.*

6-بڕوانە کتێبەکەی "کانت":

*Kant، Critique de la raison pure، Aubier، paris، 1997، p. 65.*

7-ڕۆشنبیرانی ئێمە خۆیان لەم مەسەلەیە دەدزنەوەو پێیان وایە بەبێ ڕەخنەکردنی کەلەپوور، ڕۆشنگەری مەیسەر دەبێت.

8-بڕوانە کتێبی:

*P. Hasard، La crise de la conscience europeenne، op. cit.، p.9.*

9-"بایل" بە بیریارێکی ڕۆشنگەری ناونوس دەکرێت، هەرچەندە لە سەردەمی ئەودا هێشتا سەردەمی ڕۆشنگەری دەستی پێنەکردبوو. لەبەرئەوە دواتر "ڤۆڵتێر" و "ڕۆسۆ" و بیریارانی دیکە، پشتی پێ دەبەستن. "بایل" داوای ئازادی ویژدان و بیرو باوەڕی دەکرد، واتە پێیوابوو نابێت مرۆڤ بە هیچ ناچار بکرێت ئەگەر خواست و ویستی خۆیی لەگەڵدا نەبێت. ئەم داواکاریەشی لەسەردەمی توندڕەوی و دەمارگیری مەسیحیدا بوو. لە گرنگترین کتێبەکانی: فەرهەنگی مێژوویی و ڕەخنەیی.

*10-Ibid.، p.93.*

*11-Ibid.، p.76.*

12-لە سەدەی شازدەدا ئۆفیسێکی تایبەت بۆ قەدەغەکردنی کتێب لەناو ڤاتیکاندا دروستکرا و ئەم ئۆفیسەش بەردەوام بوو تا لە ساڵی 1965 داخرا. ئەمە مانای وایە ڤاتیکان نەیدەهێشت مەسیحیەکان ئەو

کتێبانە بخوێننەوە کە پێیوابوو زیان بە ئەقڵ دەگەیەنن و مەترسین بۆ سەر بیر و باوەڕ. زۆربەی زۆری کتێبە فەلسەفی و زانستیەکان لە لیستی کتێبە یاساغەکاندا بوون. بەڵام دوای سەرکەوتنی سەردەمە نوێیەکان ئەو سانسۆرە نەما.

13-زۆر گرنگە ئاگاداری کتێبەکانی ئەم مێژوونووسە ناسراوە بین. چونکە وێنەیەکمان دەربارەی چۆنیەتی قەدەغەکردنی کتێب لە ئەوروپا نیشان دەدات. بڕوانە:

*Robert Darnton، Edition et Sediti on: lunivers dela literature clandes tine au XVIIIe siecle، Gallimard، Paris، 1991.*

14-یۆحەناهۆس (1273-1415): قەشەیەکی لە خواترس و ریفۆرمیستێکی ئایینی چیکیە. بە هەڵگەڕانەوە لە ئایین تاوانبار کراو لە ڕێی دادگاکانی پشکنینەوە سوتێنرا. سەد ساڵێك بەر لە "لوتەر" داوای چاکسازی ئایینی کردووە، بەڵام وەکو دەڵێن پێشوەخت هات، بۆیە نشوستی هێناو کوژرا. هەرچی "لوتەر" لە کاتی خۆیدا هات، بۆیە سەرکەوتوو بوو. پەیوەندیەکی نزیك لە نێوان بۆچونە چاکسازی و ڕادیکالیەکانی هەردووکیاندا هەیە.

15-بڕوانە ل 123-128، ئەم کتێبە.

16-هـ.س.پ، ل 218-219.

17-بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جاکلین مارتان باجنودیز: دادگاکانی پشکنین، ئەفسانەو حەقیقەت.

*Inquisition: mythes et realites، paris، 1992، pp. 97.*

18-مارتن لوتەر (1483-1546): ڕابەری بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینیە لە ئەڵەمانیا و سەرتاسەری ئەوروپادا. توانی ستەمکاری مەسیحی لەق بکات و ئاسۆی ئاینێکی نوێ بکاتەوە، ئاینێك کە شایستەی سەردەمە نوێکان بێت. لەبەرئەوە ئەڵەمانەکان بە گرنگترین کارەکتەری مێژووی خۆیانی دەزانن. "لۆتەر" توانی ئایینزایەکی نوێ دروست بکات کە ئاینزای پرۆتستانیەتە.

19-دەربارەی ئیراسموس (1469-1536)، بڕوانە نەسکی دووەمی ئەم کتێبە، ل 99-123.

20-ئەلفرید لوازی (1857-1940): ڕابەری تەفسیری ئایینی نوێ بوو لە فەرەنسا و مامۆستای لێکدانەوەی ئینجیل بوو لە پەیمانگای کاتۆلیکی لە پاریس. بەڵام بە تۆمەتی زەندیقی لە پۆستەکەی لابرا. دوای ئەوە کرایە مامۆستای مێژووی ئایینەکان لە کۆلێژ دی فرانس، کە باڵاترین دەزگای زانستیە لە فەرەنسادا (تەنانەت لە سۆربۆنیش باڵاترە).

21-بوسوێ (1627-1704): تەواو پێچەوانەی "بایل"ەو لە هەمان سەردەم و ڕۆژگاری ئەودا ژیاوە. سەرسەخترین دوژمنی پرۆتستانتەکان بووە و لەوانە بووە داوای شاربەدەرکردنی کردوون لە فەرەنسا. لە "لویسی چواردە"ەوە نزیك بووە. دژی ئەوە بووە میتۆدی مێژویی بەسەر ئینجیلدا پراکتیزە بکرێت.

22-بڕوانە کتێبەکەی جۆرج گوسدرۆف

*Georges Gusdorf، Dieu، Lanature، Lhomme au siecle des Lumieres، payot، paris، 1972، p. 42.*

23-بڕوانە کتێبەکەی پۆل هازار:

*Paul Hazard، La crice de La Conscience europeenne، op. cit.، p. 194.*

24-*Ibid.، p. 195.*

25-بڕوانە جۆرج غۆسدۆرف، هـ. س. پ:

*Dieu، La nature…، op. cit.، p.43.*

## سەرچاوە

هاشم صالح: مدخل الی التنویر الاوروبي – دار الطلیعة، بیروت – الطبعة الاولی، 2005.

# مۆدێرنەو فەلسەفەی ئەخلاق

بابەکی ئەحمەدی

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

-1-

لــە ڕۆژی 18 شــەهریوری 1376دا کچــێکی هەشت ساڵە لە نەخۆشخانەی مناڵانەی موفیدی تاران، کۆچی دواییکرد، ناوی ئارین گوڵشەنی بوو ڕۆژی پێشوو بە سەد حاڵەتی شکاندی ئێسقان و برینی قوڵ لە لەشیدا – نیشانەی لێدان و برینداریو سوتان لە حاڵەتی بێهۆشی تەواودا بۆ نەخۆشخانەکە هێنرا. کێشی تەنها 15 کیلۆ بوو و پەرەسەندنی ئێسکەکانیش لە سنوری مناڵێکی 4 ساڵەدا ڕاوەستابوو. کچەکە پاش جیابونەوەی دایکو باوکی، بە باوك و ژنە تازەکەی سپێردرا بوو، هەر هەموو ئەشکەنجەکانیشی لە خێزانی باوکدا بینیبوو. پێشتر ئارین دوابەدوای جیابوونەوەی دایك و باوکی بە حوکمی دادگا، نەك بە دایکە بەرپرسیار و تەندروستەکەی، بەڵکو بە باوکی سپێررا بوو کە پێشتر رابردوی تاوانکاری هەبووە و ئەمڕۆش تاوانبارە بە "لێدان و بریندارکردنی زیاد لە سنور (سنورەکەی چ کەسێك دیاریدەکات؟) و شکاندنی هەردوو باڵی منداڵەکە". ئەم پەروەندە تاوانکاریە بۆتە هۆی ئەوەی دەنگی ژنانێك کە ڕەخنەیان لە نادادپەروەرانە بوونی یاسا هەبووەکانو بەتایبەتی ڕێساکانی "حەزانەت" هەیە، ببیسترێت. لە ڕاستیدا کەموکوڕی یاساکانی بەرگری لە مناڵان ئاشکرا بووە. بابەتی لێکۆڵینەوەی دادگا پرسیاری جدی یان باشتر بڵێین مەترسیگەلێکی لە بارەی واقعیەتی تاڵی ژیانی کۆمەڵایەتیەوە، وروژاندووە. مناڵانی ئێرانی تا چ سنورێك لە خێزانەکانی خۆیاندا خاوەن ماف و حورمەت و ئازادین؟ ژمارەی مناڵە ئەشکەنجەدراوەکانی دی کە هێشتا کارەساتەکانیان ئاشکرا نەبووە، چییە؟ ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە و بڕاوە، ڕێگری لە "لێدانو بریندار کردنی" مناڵان لە لایەن سەرپەرشتیارانەوە دەکەن، کامانەن و تا چ سنورێك کاراییان هەیە؟ لێرەدا ناتوانم بچمە ناو باسێکی سیاسی و یاساییەوە، ئەگەرچی گرنگیەکی زۆری هەیە.

کاتێك هەواڵی مردنی ئارین گوڵشەنیم بیست، لەناو پیاچونەوە بە یاداشتەکانی ئەم نوسینەدا بووم و لەبەر هۆیەك هەواڵەکەم لە سەرەتای ئەم نوسینەدا دانا: دەنگی ئەشکەنجە دیدەی ئارینی

بچوك لە ژیانێكی كورت و پڕ ئازاردا كە بەسەری برد، ئاوای ناڵەكانی كە لە دڵی دۆزەخێكەوە دەهات كــە تیــای دەژیــا، تەنانــەت بێدەنگیەكــەی لــە ساتەوەختی ئـەو مردنـە ترسـناكەی كـە هـەیبوو، دەنگـی نوسـەرێكی گـەورەی سـەدەی نۆزدەهـەمی دەهێنایـەوە یـاد كـە پێشتر دەمویست وتارەكـە بـە قسەكانی ئەو دەست پێبكەم.

لە فەسڵی چوارەمی كتێبی پێنجەمی بەشی دووی رۆمـانی برایـانی كارمازۆفـدا كــە نوسـینی فئــۆدر دۆستۆڤیســكیە، لــەو بەشــەدا كــە نــاوی "یاخیبوونـە"، ئیڤـان كارمـازۆف لەگـەڵ ئالیوشـای برایدا كە قەشەیەكی جوان و دڵپاكە، وتوێژ دەكات و هەوڵـدەدات وەڵامــی ئـەو پرسـیارەی بداتــەوە كــە لەبەرچـی قبـوڵی دنیـا ناكـات. ئیڤـان دەڵێـت رقـی لەوەیە وا پیشانبدەیت كە باشیت، " بە بڕوای من عەشـقی مەسـیحیانە بـۆ مرۆڤـەكان، لەسـەر زەوی مۆجیزیــەكی مەحاڵــە.. وا وێنــای بكــە كــە مــن بێئەندازە ئازار ئەبینم، بەڵام كەسێكی دی ناتوانێت هەرگیز تێبگات كە من چەند لە ئازاردام. چونكە ئەو كەســێكی دیــە و مــن نیــە". مــرۆڤ دەتوانێــت دراوسێكانی بەشێوەیەكی ئەبستراكت خۆشبوێت، لە دوورەوە خوشویستنیان شتێكی مومكین، بەڵام لـە نزیكـەوە مەحاڵـە. ئیڤـان دەڵێـت وای بـە بـاش دەزانێـت كـە لـە بـری باسـكردنی ئـازار بـە مانـای هەمـەكی و مرۆڤانـە، باسـی ئـازاری منـاڵان بكـات. منـاڵان بێگونـاهن و ئـەو ئازارەی دەیبیـنن بـە هـیچ لۆژیكێك قابیلی رەوایـەتی پێدان نیە. بـەڵام منـاڵان توشـی گـەورەترین ئازارەكـان دەبـن. ئیڤـان باسـی پیـاوێكی خوێنـدەوار و رۆشـنبیر دەكات كـە لەگـەڵ هاوسەرەكەیدا بەداری درەختی غان لە مناڵە حەوت ساڵەكەیان دەدەن. هەرچی زیاتر لە مناڵەكەی دەدا، شەهوەتی لێدان تیایدا زیادی دەكرد. یەك دەقیقە، پێــنج دەقیقــە و دە دەقیقــە لێیــدەدا و بــەردەوام دڕندەتر دەبوو. مناڵە ئەینالاند و دەیگوت "بابە.. بابـە". بەرێكـەوت كـاری كـابرا بـە دادگـا دەگـات و پارێزەرەكــەی بــە رەخنەگرتنــەوە گــوتی "ئەمــە مەسەلەیەكی سادەیە، رووداوێكـی سـادەی خێزانیـە، باوكێــك خەریكــە مناڵەكــەی پــەروەردە دەكــات. جێگەی شەرمە كارەكەی بە دادگا بگات".

ئیڤـان بـەردەوام دەبێـت: "بـەڵام گێڕانـەوەی باشتر لەمەشم لەسەر مناڵان لایە". باوك و دایكێك كچە پێنج ساڵەكەی خۆیـان ئەشكەنجە دەكـرد. ئـەم ئەشكەنجەدەرانە كاریان بەسـەر خـەڵكی دیـەوە نیـە، دڕنـدەیی ئـەوان لـە بەرامبـەر مناڵانـدا دەردەكـەوێت: بەوردی ئەوە بێ بەرگریبوونی مناڵە كە وەسوەسەی ئەشـكەنجەدەر دەكـات. دڵنیـایی فریشـتە ئاسـای منــاڵان كــە پەنایــەكیان نیــە، خــوێنی پیســی ئەشكەنجەدەر دەهێنێتـە جـۆش. لـە هـەر مرۆڤێكـدا جانەوەرێكی دڕندە هەیە". باوك و دایكەكە قامچیان لە كچەكە دەدا، جەستەیان دەئاوسان، لـە سـەرما و سـەهۆڵبەنداندا لـە ئاودەستێكدا زینـدانیان دەكـرد، پاشـەڕۆییان دەكـرد بـە دەموچـاویدا و ناچـاریان دەكـرد لێـی بخـوات. مناڵەكـە "لـەو جێگـە تاریـك، پـیس‌و سـاردەدا بـە مسـتە بچـوكەكانی سـنگی دەردنــاكی دەكوتــا و فرمێســكە بــێ رقــەكانی ئاراسـتەی خوداوەنـدی ئـازیز و میهرەبـان دەكـرد، تـاكو پارێزگـاری لێبكـات". ئیڤـان باسـی منـاڵێكی لادێیشـی كـرد كـە رۆژێـك لەبـەرخاتری یـاریكردن و لـەرووی بـێ فكرییـەوە، بـەردێكی هاویشـت و سـەگی راوی ئاغاكـەی برینـدار كـرد. ئاغـا روتـی كـردەوە و فــەرمانی بەســەگەكانی دا تــا دوای بكــەون و لــە بەرامبــەر چـاوی دایكیـدا، پارچـە پارچـەی بكـەن. ئیڤـان دەپرسـێت "باشـە ئاغـا شایسـتەی چیـە؟" و ئەلیوشـا لـە ژێـر لێـوەوە دەڵێـت "لـە سـێدارەدان".

هەرچەند قەشە دڵپاکەکە خێرا لە قسەکەی خۆی پاشگەز دەبێتەوە، بەلام بۆ ساتێك توانی بووی ببێتە هاودەردی دایکی کوڕەکە و لە توندوتیژیەکدا کە وەلامدانەوەی توندوتیژیەکی دیە، تێزەکەی مەسیحی لەبیر بچێتەوە و گوناهکار، نەبەخشێت.

ئیڤان بەردەوام دوبارەی دەکاتەوە کە دەیەوێت "لە راستیەکان جیا نەبێتەوە" و راستی خراپەکاری مرۆڤ، واتە ئەو خاڵەی مرۆڤەکان خراپە هەڵدەبژێرن و ستەم لە هاورەگەزەکانی خۆیان دەکەن، دەهێنێتە پێشێ. ئەو دەڵێت ناتوانێت دەستنیشانی بکات "بۆچی جیهان بەم شێوەیەی کە هەیە، شکڵی وەرگرتووە". بەلام هەستدەکات مرۆڤەکان لەبەرئەوەی مەیلیان بەلای خراپەدا هەیە، شایستەی سەرزەنشتن. لەلایەکی دیەوە دەبینێت لە راستیدا ئەوان سوچێکیان نیە، ئاوەها دەژین، لەبەرئەوەی ئاوەها دروستبوون. ئیڤان بە تەشەردان لە زانست باوەڕی سەردەمی خۆی دەڵێت "بە تێگەیشتنی ئەقلیدیسیە ناسك و زەمینیەکەم، هەموو ئەو شتەی دەیزانن ئەوەیە کە ئازار بوونی هەیە و هیچ کەسێکیش خەتای لەمەدا نیە". بە "پۆخڵەواتی ئەقلیدیسیش" لە بارەی هۆ و هۆکارەوە، مەسەلەکە چارەسەر ناکرێت. ئیڤان ئارەزووی ئەوە دەکات سزایەك لە ئارادا بێت، نەك لە ئایندەیەکی دوردا، بەڵکو لەسەر زەوی. ئەو ئازار و دەردەی منالان دەیچێژن، لەسەرو تێگەیشتنەوەیە. مرۆڤەکان بەهۆی بەشداریان لە گوناهدا، بۆ جێبەجێکردنی بەشی خۆیان لە هاوئاهەنگی ئەبەدیدا، بەهەر هۆیەکی عیرفانی و دینی بێ، گوناهکارن و دەبێ سزا بدرێن. بەلام منالان بۆچی؟ ئەوان خۆ بێگوناهن و بڕیارە مەلەکوتی ئاسمان بۆ ئەوان بێت. لەسەرو تێگەیشتنەوەیە منالان ئازار ببینن. بابڵێین ئەشکەنجەدارانی منالان لە دۆزەخدا سزا دەدرێن، بەلام ئەی چارەنوسی ئەو کارەسات و ئەشکەنجانەی منالان بینیویانە چی دەبێت؟ من چ کارم بە تۆڵەسەندنەوە لەو فرمێسکانە هەیە؟ "ئەگەر ئازارەکانی منالان، رادەی ئەو ئازارانە زیاد بکات کە مرۆڤ پێویستە بۆ هەقیقەت بیبەخشێت، ئەو کاتە من ناڕەزایی دەردەبڕم و دەڵێم کە هەقیقەت شایەنی ئەم بەهایە نیە.. لام باشترە لەگەڵ ئازارێکی سزا نەدراو و تورەییەك کە خۆی خواردۆتەوە بمێنمەوە. تەنانەت گەر لەسەر هەقیش نەبووبم. جگە لەمە داوای چ بەهایەکی گران بۆ هاوئاهەنگی، دەکرێت. بەخشینی ئەم بەهایە لەسەرو توانای ئێمەوەیە. ناکرێت بۆچونە ناو هاوئاهەنگیەوە، بەهایەکی لەو چەشنە بدەین. لێرەوەیە کە من وازدەهێنم و بلیتی چونەژورەوەی خۆم دەگەڕێنمەوە. ئەگەر مرۆڤێکی بەشەرەف بم، ئەرکی منە هەرچی زوتر بیگەڕێنمەوە. ئەمەش ئەو کارەیە کە من دەیکەم. ئەلیوشا وانیە کە من خودا قبوڵناکەم، بەڵکو من تەنها بە ئەدەبێکی تەواوەوە، بلیتەکەی بۆ دەگەڕێنمەوە". ئەلیوشا کە تەماشای کۆتایی دەکرد، گوتی "ئەمە یاخیبوونە".

بێگومان یاخیبوون سەرچاوەیەکی ئەخلاقی هەیە. ئیدی ئەم خاڵە پاش دۆستۆڤیسکی و ئەلبێر کامۆ، روونە. لە بەشی چوارهەمی تاعونی نوسینی کامۆدا، پارچەیەك هەیە لە مردنی منالێك بەهۆی تاعونەوە. لەم پارچە کورتەدا کە رونکردنەوەی گیاندانی بێئەندازە دەردناکی منالێکە و لەرووی تیورەی ئەدەبیەوە، یەکێك لە جوانترین نوسینە ئەدەبیەکانی سەدەی بیستەمە، دکتۆر ریو و قەشە پانلو بە ئازار و نابڕوای و ترسەوە لە پاڵیدا وەسفدەکرێن: "بەلام لەناکاو نەخۆشەکانی دی خامۆش بوون. ئەو کاتە دکتۆر تێگەیشت کە دەنگی

منداڵەکە لاواز بووە، دیسان لاوازتر بووەو بێدەنگ بووە. لە دەوروبەری ئەودا ئاه و ناڵە دەستی پێدەکردەوە، بەڵام هێواشتر و وەك دەنگدانەوەیەکی دووردەستی ئەم نەبەردە کە کۆتایی پێهاتبوو. چونکە نەبەردەکە کۆتایی پێهاتبوو". ریو بەلای قەشەدا دەڕوات: "قەشەکە قوڵی هێنایە پێشێ بۆ ئەوەی ڕێگەی لێبگرێت و پێی گووت: "سەبرکە دکتۆر!" ریو بە هەمان جوڵەی توڕەییەوە گەڕایەوەو بە توندوتیژیەوە قیژاندی بەسەریا: "ئاخ! ئێوە خۆتان باش دەزانن کە لایەنیکەم ئەم یەکەیان بێگوناهە". هاواری دکتۆرەکە، دەنگدانەوەی دەنگی ئیڤانە. ماڵەکە بەهۆی چارەنوسی شومەوە ئەشکەنجە دەبینێت و دەمرێت. ئەمجارە مرۆڤێك ئەشکەنجەی ناکات، بەڵام پێدەچێت کە چارەنوسە تاڵەکەی بێ هیچ بەزەییەك، مەرگێکی ئەشکەنجەئاسای لە چارەنوسی نوسیوە. ریو دەچێتە حەوشە و لە روناکی بەربەیاندا لە ژێر درەختە کورتە تۆزاویەکاندا، دادەنیشێت. قەشەکە دەگاتە لای: "بۆ بەو توندوتیژیە قسەی لەگەڵم کرد؟ بۆ منیش ئەو دیمەنە قابیلی تەحەمولکردن نەبوو". ریو بەلای پانلۆدا گەڕایەوە و گوتی: "راستە. بمبورە. بەڵام هیلاکی جۆرێك شێتیە. لەم شارەدا چەندان کاتژمێر هەیە کە من تیایدا جگە لە یاخیبوون هیچ هەستێکی دیم نیە". ئەو کاتەی قەشە دەڵێت کە راستە، ئەم هەلومەرجە یاخیبوون ئاسایە، چونکە لە پێوەرەکانی ئێمەی تێپەڕاندووە، بەڵام رەنگە پێویست بەوە بکات ئەو شتەمان خۆشبوێت کە تێیناگەین، ریو لە وەڵامیدا دەڵێت: "نا، من تێگەیشتنێکی دیم بۆ عەشق هەیە و تا مردن سیستەمێك کە منالآن ئەشکەنجەی تیا دەبینن، رەد دەکەمەوە". لەم یاخیبونەوە بە موفارەقەکەی ئیڤان کارمازۆف دەگەین کە

هەستدەکەم گرنگترین موفارەقەی ئەخلاقیە کە تا هەنوکە هێنراوەتە ئارا و تیورە ئەخلاقیەکانیش وەڵامێکیان بۆی پێ نییە.

"ئیڤان بە حاڵەتێکی جدیەوە وتی یاخیبوون؟ بەداخەوە کە تۆ ناوی یاخیبونی لێدەنێیت. خەڵکی بە زەحمەت دەتوانن لە یاخیبووندا بژین و منیش دەمەوێت بژیم. بەڵام خۆت وەڵامم بدەرەوە. تەماشاکە! تەحەدات دەکەم، وەڵام بدەرەوە. وا بزانە سەرقاڵی بونیادنانی چارەنوسی مرۆڤی، ئامانجیشت ئەوەیە مرۆڤ خۆشبەخت بکەیت و دواجار ئارامی و ئاشتیان پێ ببەخشی. بەڵام بۆ ئەمکارە پێویست و ناچاریە تەنها بونەوەرێکی لاوازو بچوك.. هەمان ئەو منالەی سنگی خۆی دەکوتی.. تا دەمی مەرگ، ئەشکەنجە بکەیت و ئەو بینای خۆشبەختیە لەسەر بناغەی فرمێسکە سزانەدراوەکەی ئەو بینا بکەیت. ئایا قەبوڵی دەکەیت بەو مەرجە ئەندازیاری ئەو بینایە بیت؟ پێمبڵێ و راستیش بڵێ. ئەلیوشا بە ئارامی گوتی نا، من قەبوڵی ناکەم. (ئیڤان گوتی) ئایا دەتوانی بڕوا بەو خاڵە بکەیت کە ئەو مرۆڤانەی دەتەوێت بیناکەیان بۆ دروست بکەیت، رێکبکەون کە خۆشبەختی خۆیان لەسەر بناغەی خوێنی سزانەدراوی، قوربانیەکی بچوك، قەبوڵبکەن؟ بە قبوڵکردنیشی بۆ هەمیشە خۆشبەخت بمێننەوە؟". ئیڤان لە درێژەی ئەم موفارەقەیەدا چیرۆکێك بۆ ئەلیوشا دەگێڕێتەوە کە خۆی نوسیوێتی. رەنگە ئەم پارچەیە بەناوبانگترین پارچە لە ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدەهەمی روسیادا بێت: "موفەتیشی مەزن". ئیڤان چیرۆکی گەڕانەوەی مەسیح بۆ زەوی، بۆ سۆیل لەسەردەمی پشکنینی بیروڕادا دەگێڕێتەوە: "موفەتیشی مەزن کە مەسیح دەستگیر دەکات لێی دەپرسێت: "بۆچی گەڕایتەوە؟". پاشان

وێنەیەك لە ژیانی مرۆڤەكان پێشكەش دەكات كە بەشێوەیەكی سەرسوڕهێنەرو سەیر، لە روسیای سەدەی دوایی، واتە سەردەمی ستالین، ئۆردوگاكانو حكومەتی كۆمنیستیەوە نزیكە. بە ناوی یەكسانی و دادپەروەریەوە، بە پارچە نانێك تەنها ئەوەندە تێر دەبن كە كار بكەن و جێگەیەك بۆ دادپەروەری راستەقینەو باشی ئەخلاقی نامێنێتەوە.

هەرچەندە دەكرێ بە سادەیی لەو وێنەیەدا كە موفەتیشی مەزن دروستی دەكات، روسیای سەدەی بیستەم ببینرێت، بەڵام ئەمە تەنها بەشێكە لە واقعی ژیانی مرۆڤی مۆدێرن لەسەردەمی ئێمەدا. لە راستیدا موفەتیش باسی مۆدێرنەو رۆژگاری مۆدێرن دەكات. باسی ئۆردوگاگەلێك دەكات كە لەولاتانی جگە لە روسیاش، بەرپاكران. باسی رەنجی منالانێك كە لە سەرتاسەری ئەم ئەستێرەیەدا ژیان و رەنجگەلێك كە ناتوانرێ هۆیەكیان بۆ بدۆزرێتەوە. ئەگەر ئەخلاقی پێش مۆدێرن دەیتوانی هەموو شتێك ببەستێتەوە بە چارەنوسێكی بالاتر لە ئیرادەو عەقڵی مرۆڤەوە، رۆژگاری مۆدێرن كە بە بانگەشەی سالاری عەقڵی مرۆڤەوە هاتۆتە مەیدانەوە، چۆن دەتوانێت ئەم هەموو كارەساتە ئاراستە بكات؟ پرسیاری ئیڤان لەبارەی بیناكردنی خۆشبەختی گشتییەوە، بە بەهای نادادپەروەری لە بەرامبەر لاوازترینو بێگوناهترین تاكەكان، بە ناچار لە مێژووی ئەخلاقدا وەڵام نادۆزێتەوە. ئەرستۆ بە وێناكەی خۆیەوە بۆ خۆشبەختی وەلامێكی پێ نییە. كانتیش زیاتر سەرقاڵی كاملبوونی روكەشی حوكمە تراسندنتالەكانی خۆیەتی، نەك بیر لەوەلام بكاتەوە. ئەم كێشەیە لە ژیانی مۆدێرنەوە سەرچاوەی گرتووەو دەبێت لەناو دەروونی ئەم ژیانەشەوە بەدوای چارەسەریدا بگەڕێین، ئەگەر چارەسەرێك هەبێت.

## -2-

پرسیاری سەرەكی ئەخلاق، لەڕوانگەی زۆرێك لە نوسەرانی ئەمڕۆوە ئەوەیە: ئێمە دەبێت چۆن بژین؟ هەندێك پرسیارەكە بەم شێوەیە دادەڕێژن: ئایا دروستترین شێوەی ژیان كردن، بوونی هەیە؟ وە ئەگەر هەیە، ئایا دەستمان پێی رادەگات؟ بە بڕوای بیریارانی پۆستمۆدێرن یەك شێوەی دروستی ژیان، ناتوانێ لەبەردەم هەموواندا بێت. حەكایەتی یەك ئەخلاقیش وەك حەكایەتە مەنەلۆگەكانی تری مۆدێرنە، كۆتایی پێ هاتووە. بەپێچەوانەوە رۆشنگەرانو كانت بۆ ئەم پرسیارە وەلامێكی پۆزەتیڤیان هەبوو. لە هەنگاوی یەكەمدا ئەوەیان قبوڵ دەكرد كە شێوەیەكی دروستی ژیان دەبێت لەبەردەم هەمواندا هەبێت و بەڵگەیان دەهێنایەوە كە ئەم شێوەیە پشت ئەستوورە بە عەقڵی مرۆڤ و گەڕانی عەقڵانی دەتوانێت هەموو مرۆڤەكان بە یەك دەرئەنجام بگەیەنێت. ئەوان پاش قبوڵكردنی بوونی شێوەیەكی دروستی ژیان، لە هەنگاوی دواییدا باسی ئەوەیان دەكرد كە ئەم شێوەیە چییە؟ زۆربەی بیریارانی رۆشنگەری بەر لە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی وەلام و لە راستیدا بە ئاڕاستەی وەلام، سەرەتا بە پێویستیان دەزانی تیورەیەك لە بارەی سروشت و ماهیەتی مرۆڤەوە، پێشكەشبكەن، تا هەنوكەش هەندێك بیریار هەروا دەكەن. ئەلیسۆن جەگر لە كتێبی "سیاسەتی فەمەنیستی و ماهیەتی مرۆڤ" دا هەوڵیداوە لایەنە جیاوازەكانی دەستپێكردن لەمجۆرە پێناسەیەوە، رونبكاتەوە.

كاتێك وەك مرۆڤێكی مۆدێرن دەپرسین: "من چۆن دەبێت بژیم؟ لەگەڵ ئەوەشدا كە راناوی

یەکەمی تاکەکەس بەکار دەهێنین، بەلاّم لە راستیدا مەسەلەیەکی سەروتر لە تاکەکەس دەهێنینە پێشیّ. هاوکات لەگەلّ ئەم پرسیارەدا، رێنماییەك بۆ کەسانی دی (بەشێوەیەکی شاراوە) خۆی حەشارداوە. ئەگەر من بزانم چۆن دەبێت بژیم تێگەیشتووم کە دەبێت چۆن ژیان بکرێت. دۆزینەوەکەی من خۆی لە خۆیدا پیشانیدەدات کە کەسانی دیش دەبێت وەك من بژین. من لە رێگەیەکی عەقلاّنییەوە بە ئەنجامێکی عاقلاّنە گەیشتووم و ئەم دەرئەنجامەش دەبێت بۆ هەمووان، راست بێت. بەلاّم لە راستیدا رێگاکە بە پێچەوانەوەیە. عەقلاّنیبوون و راستی شێوەی ژیانی من، کاتێك دەسەلمێنرێت کە بتوانێت وەك نمونەیەك لە بەردەم کەسانی دیدا رابوەستێت. کێشەکە لەوەدایە کە لە رۆژگاری مۆدێرندا و سەرەرای عەقلّباوەرییە بەهێزەکەی، رادەی لایەنی گەردوونی یان هەمەکی ئەو دەرئەنجامەی من پێی گەیشتووم، بەوردی روون نیە. کانت دەیگوت ئەوەی بۆ من لە رووی ئەخلاقییەوە راستە، بەشێوەیەکی لۆژیکی دەبێت بۆ هەموو کەسێك راست بێت، بەلاّم بە ئاسانی دەکرێت هاورای ئەو بیریارانە بین کە بازنەی دروستی ئەو دەرئەنجامە سنوردار دەکەن بۆ چەند گروپێکی مرۆڤ. کەسانێك کە لەگەلّ مندا لە هەلومەرجی کۆمەلاّیەتی، کلتوری، چینایەتی، نەتەوەیی، و ئیمانیدا.. هاوبەش و هاوڕان.

کێشەکە لەوەدایە کە "ئێمە" شتێکی براوە و پێدراوێك نیە بۆ یەکجار و بۆ هەمیشە دەستنیشان بکرێت. من ئەندامی گروپی جیاوازم. دەتوانم بیّ خێزان یان خێزاندار بم، لە رێگەی پیشە یان رادەی خوێندەواریەوە سەر بە چین و گروپی کۆمەلاّیەتی بم، لە رووی بروای سیاسییەوە لەگەلّ کەسانێکدا هاوریّ و لە رووی بروای مەزهەبی یان بیّ باوەرییەوە، لەگەلّ کەسانی دیدا هاوبەش بم. ئەندامی "ئێمە"یەکم کە لە هەندێك مەسەلەدا لەگەلّ ئەندامەکانی دیدا، هاوبەشم. بەلاّم لە هەمانکاتدا رۆلّی کۆمەلاّیەتی دی قبولّدەکەم کە یەکسەر دەمکات بە ئەندامی گروپی جیاواز، و لە "من"، "ئێمە"یەکی دی دروستدەکات. زۆر ئەوە دێتە پێشیّ کە بنەمایەکی ئەخلاقی لە یەکێك لەم گروپانە قبولّکراوە و لە گروپێکی دیدا رەدکراوەتەوە. ئەو شێوە ژیانەش کە لە نێوان ئەندامانی ئەم گروپەدا خواستراو و جێی بایەخە، لەلای ئەندامانی گروپەکەی دی قبولّکراو نیە و دەبێت شێوازی جیاواز لەوە بگرێتە بەر. خودی ئەم راستیە پیشانیدەدات کە "من" ئەو سوبژێکتە تاکانەیەی کە لە فەلسەفەی دیکارت یان ئەخلاقی کالڤینیدا بە گریمانە وەردەگیرێت، نیم. لە مۆدێرنەدا "ئێمە" بەردەوام کێشە ئامێز بووە. ئەو هەموو هەولّە بۆ چارەسەر و لە زۆربەی جاردا بۆ شاردنەوەی مەسەلەکە، سەرکەوتوو نەبووە. هەنوکە لەسەردەمی پۆستمۆدێرندا سەردەمی یەك رێگەچارە بۆ هەمووان، بەسەرچووە. چیدی ناکرێت بەشێوەی دلّنیایی عەقلّباوەران، زۆربەی مارکسیەکان و زۆرێك لە مەزهەبەکان، باسی یەك رێگە چارەی هەمەکی کە بۆ هەموو کەس دروست بێت و وەلاّمی هەموو مەسەلەکان بداتەوە، بکرێت.

ئێمە بەپێی سەرمەشقگەلێك، نمۆنەگەلێك بەراست دەزانین، بەپێی ئاسۆی هوشیاریەکی تایبەت، هەقیقەت دروست دەکەین یان وێنا دەکەین. دیدی کرێکار و خاوەنکار، پیاو و ژن، بڕوادار و بێبڕوا بۆ مەسەلەکان جیاوازە چونکە پێش خەیالّەکانی ئەوان لەیەك جیاوازە. شێوەی ژیان، نەخشەکێشان بۆ ژیان، جۆری ناسین، و

راڤەکردنیان جیاوازە. زۆری رەگەزە جیاواز و ناکۆکەکان دەبێتە هۆی ئەوەی نەتوانین تەنانەت باسی ئاراستە چونیەکەکانی تاکەکانی گروپێکیش بکەین. زۆربەی خەڵکی دەژین بێ ئەوەی بۆ ساتێکیش لە خۆیان بپرسن کە کام شێوەیە "دروستترە". بەڵام گەر ئەوە بە گریمانە وەربگرین کە لەبەر هەر هۆیەك بووە بیر لەم مەسەلەیە دەکەنەوە، ئەوا ئێمە رووبەرووی هەمەرەنگی بێ سنوری وەڵامەکان دەبینەوە. پرسیاری ئەوەی کە "من چۆن دەبێت بژیم؟" دەبێ لە ژێر سێبەری پرسیارێکی دیدا بێت: چ کەسێك و لەبەرچی ئەم پرسیارە دەهێنێتە پێشێ؟ چ شتێك لە پەیوەندی هەقیقەت بە ئاراستە وەرگرتن بەرەو ژیان، واتە لە پەیوەندی بوون بە نەخشەرێژی بۆ خود وەك بونەوەرێك، تێدەگات؟ لەگەڵ پرسیاری لەم چەشنەدا کە چۆن دەبێ ژیان بکرێت، هەلومەرجی فەلسەفی، مێژوویی و کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە کە رێگە لە وەڵامێکی تاکانە و بڕاوە و دوا وەڵام دەگرێت.

لە مۆدێرنەدا لەلایەکەوە دژواری و پێداویستیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، بەردەوام پێویستی بیرکردنەوەی ئەخلاقی دەهێنێتە پێشێ و لە لایەکی دیشەوە بەشێوەیەکی بەردەوام لە ئەگەری پێشکەشکردنی وەڵامێکی تاکانە بۆ هەر پرسیارێکی تایبەت، کەمدەکاتەوە. هەمەڕەنگی و فرەیی ژیانەکان، ئەخلاقی تاکانەیان خستۆتە لاوە. سەرنج بدەین کە نوسەرانی ئەمڕۆ تا چ رادەیەك لە بارەی مەسەلەی سەرەکی ئەخلاقەوە، لە یەکدی جیاوازن. هەندێك هاوڕێیەتی بە گرنگترین مەسەلەی ئەخلاقی دادەنێن، هەندێك هاودەردی، هەندێك دڵنیایی و هەندێك بە دایکبوون، یەکێك باسی ئەخلاقی تیمارکاری دەکات و ئەوی دی تاکە مەسەلەی ئەخلاقی بە خۆکوشتن دادەنێت. ئەم بیروڕا جیاوازانە رێگەی باسی فەلسەفیان نەگرتووە، بەڵام بەرهەمی ئەم باسە بەردەوام ئەو دەرئەنجامەی بەهێز کردووە کە ئەخلاقی تاکانە و بڕاوە و دوا ئەخلاق بوونی نیە، بە هەمان شێوەش ناکرێ لە بوونی مەسەلەیەکی ئەخلاقی سەرەکی، دڵنیابین. مومکین نیە "کە ناوەڕۆکی سەرەکی ئەخلاق" وەك خاڵی ئەرشمیدس لە دەرەوەی ئەم جیهانە وێنا بکەین و بە تاکە پشتی سەرەکی دابنێین.

ئەم رەهەندە رێژەگەریە لە زۆر حاڵەتی گرنگ و زیندوودا لە بەرامبەر پێویستی ژیانی مۆدێرن بۆ بوونی پێوەرێکی ئەخلاقی کە پشتی بە تیورەیەکی ئەخلاقی یەکتا بەستووە یان لایەنیکەم قبوڵکراو لەلایەن زۆرینەی خەڵکەوە، رادەوەستێت. لەلایەکەوە مەسەلەی ئێمە لەسەر ئەم هەسارەدا مەسەلەی مەرگ و ژیانە (ئەو دژواریانەی پەیوەندیان بە قەیرانی ژینگەوە هەیە، دەرکەوتنی نەخۆشیگەلێکی وەك ئایدز، چاودێریکردنی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، چەکە کۆکوژەکان و کیمیاییەکان و گەلێك مەسەلەی دی) لەلایەکی دیشەوە تەوەرەی عەقڵباوەڕیانەی ئەخلاقی یەکتا لەناوچووە، یان بەخێرایی رەوایەتی خۆی لە دەستدەدات. کاتێك فینگشتاین لە کۆنفرانسێکدا لە بارەی ئەخلاقەوە رایدەگەیاند: "من تەنها دەتوانم هەستی خۆم لە رێگەی خوازەیەکەوە رابگەیەنم. ئەگەر کەسێك کتێبێك لە بارەی ئەخلاقەوە بنوسێت کە بەڕاستی کتێبێك بێت لە بارەی ئەخلاقەوە، ئەم کتێبە دەیتوانی وەك تەقینەوەیەك هەموو کتێبەکانی دی لە دنیادا وێرانبکات"، دەیویست جەخت لەسەر رەهەندی ناوەندی پێویستی دیدی ئەخلاقی بکات. ئەو لە هەمانکاتدا دودڵبوو لەوەی

کەسێك بتوانێت "کتێبێك لە بارەی ئەخلاقەوە بنوسێت کە بەڕاستی لە بارەی ئەخلاقەوە بێت". وەرگرتنی شێوەیەکی ئەخلاقی دروست یان تەنانەت شێوەی دروستتر لەوەی هەنوکە لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی مۆدێرندا قبوڵکراوە، پەیوەندی بە مەسەلەی سەرەکی مانەوەی مرۆڤەوە هەیە، بەڵام هەر رۆژێك زیاتر ئەوە روون دەبێتەوە کە شێوەیەکی وا بونیادی، قابیلی دۆزینەوە نیە.

عەقڵباوەڕی مۆدێرن بە وتەی ئیچ. جی. ویڵز لە بری دروشمی کلاسیکی "دەبێ مرۆڤ ئەرکی خۆی بزانێت و کاری پێبکات"، دروشمی "مرۆڤ دەبێ تێبگات و بەپێی تێگەیشتنی خۆی کار بکات"ی دانا. لە مۆدێرنەدا تێگەیشتنی عەقڵانی زۆر لە هەر ئەرکێکی ئەخلاقی و ئاینی و دینی دی، سەرنجڕاکێشتر بوو. بەڵام فەلسەفەی عەقڵباوەر و مۆدێرن دواجار ئەرکێکی تازەی دەخستە ئەستۆی مرۆڤ. ئەرکێکی ئەخلاقی کە لە هەمان "مرۆڤ دەبێت تێبگات" وە دەستی پێدەکرد. لە هەلومەرجی پۆستمۆدێرندا جارێکی دی، مەسەلەی سەرەکی ئەرك کە لە راستیدا لە گریمانەی ئیمکانی شێوەی دروستی ژیانەوە بۆ هەمووانەوە سەرچاوە دەگرێت، خراوەتەلاوە. دیارە لە روودانی پەرەسەندنی مۆدێرنەشدا بەشێوەیەکی روو لە زیاد، شێوەی دروست کەم بایەخ دەبوو، وە تێگەیشتن لە شێوەی ئاساتر، کەم خەرجتر، لەبەردەستاتر، لەبری ئەو دادەنیشت. ئەمە بە مانای جێگرتنی عەقڵی پراکتیك بە مانای لایبنیتزی و کانتیەکەی لە بری شتێك بوو کە ماکس فیبەر ناوی نابوو عەقڵئامێری. عەقڵێك کە سروشت بە سەرچاوەی کەرەسە و سود دەبینێت و رەوایەتی بە بەهرەکێشی مرۆڤ لە مرۆڤ دەدات.

دەکرێت تیورە ئەخلاقیەکان لە رەهەندی جیاوازەوە پۆلێن بکەین. لە دەیەکانی دواییدا هەمەڕەنگی ئەم پۆلێنکردنانە بۆتە هۆی نوسینی کتێبگەلێکی گرنگ لە مێژووی ئەخلاقدا. یەکێك لە گرنگترین ئەم پۆلێنکردنانە دوالیزمی فکری فەلسەفی لە مەسەلەی ئەخلاقدا پیشاندەدات. جیاوازی لە نێوان دیدی تیولۆجیانە و دیۆنتۆلۆجیانەدایە. تیورە تیولۆجیەکان لەسەر بناغەی ئەو پێشگریمانەیە دامەزراون کە هەم راستی و هەڵە و هەم سروشتی ئەخلاقی یان نائەخلاقی کردارەکان، دیدەکان و تیورە تایبەتیەکان بەستراوە بەو دەرئەنجامانەوە کە دەیخەنەوە. دەبێ سەرنج بدەین کە هەر کردارێك چی بەرهەمدێنێت، ئایا بە ئامانجێك دەگات یان ناگات، تا بتوانین لە رووی ئەخلاقیەوە هەڵیسەنگێنین. دیارە ئەو ئامانج و دەرئەنجامانەی کە بە پێوەرەکانی هەڵسەنگاندن دەژمێررێن، جیاوازن و فەیلەسوفان لە بارەیەوە هاوڕا نین. هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی چەندان تیورەی ئەخلاقی تیۆلۆجیانە دروستبن. لای ئەرستۆ ئامانجی ژیانی مرۆڤ بریتیە لە *eudaimonia* یان "خۆشبەختی". بە بڕوای هیوم و میل، ئەم ئامانجە سەرەکیە لەزەت، شادی و سود وەرگرتن لە نیعمەتەکانە. تیورە تیۆلۆجیەکان بەدەر لەو جیاوازیانەی کە لە بارەی ئامانج و دەرئەنجامەوە لە نێوانیاندا هەیە، لەیەك خاڵدا هاوڕان: هەر حوکمێکی ئەخلاقی دروستی خۆی لە رادەی نزیکیەوە لە ئامانجەوە بەدەست دێنێت. لەبەرامبەر ئەمەدا تیوڕە گەلێکی دی هەن کە ناومان نان دیۆنتۆلۆجی. ئەو تیورانەی لەسەر ئەم بناغەیە دامەزراون رایدەگەیەنن کە کردارە مرۆییەکان یان لە خۆیاندا راستن یان هەڵەن و ناکرێت بە پێی ئەو دەرئەنجامانەی دروستیدەکەن،

بەراست یان هەڵەیان دابنێیت. دزی بە هەر جۆرێك بێت کارێکی ناڕاست و نا ئەخلاقیە، تەنانەت ئەگەر دز بەمکارەی بیەوێت ببێتە هۆی خۆشبەختی کەسێکی دی. "دەکالۆگ" یان دەفەرمانە بە ناوبانگەکەی کتێبی پیرۆز، نمونەیەك لە کۆمەڵێك حوکمی بڕاوەن کە رونیدەکەنەوە چ کارێك بە دروست بژمێرێت و چ کارێك بە هەڵە. هەوڵی کانت بونیادنانی میتافیزکیای ئەخلاق، بۆ دەستگەیشتن بە حوکمی بڕاوە و کۆتایی بوو کە بە پێی حوکمی عەقڵ، لە هەر قۆناغێکی مێژوویدا و بۆ هەر کەسێك، راستە و پێویستە جێبەجێ بکرێت. حوکمە دیۆنتۆلۆجیەکان، پێویستی کردارگەلێك روندەکەنەوە و هاوئاهەنگن لەگەڵ یاساکان و رێسا بڕاوەکاندا: یاساکانی خوداوەند، یاساکانی ئەخلاق، یاساکانی سروشت و ئەوانی دیدا.

دەکرێت پۆلێنکردنی دیش بدۆزینەوە. یەکێك لەوانە جیاوازی نێوان دیدی خودی و دیدی بابەتیە. لایەنگرانی دیدی یەکەم لە راستیدا هەمان وتەی بەناوبانگی هامپیتی دامپتی لە "ئالیس لەسەر زەمینی سەیر و سەمەرە"دا دوبارە دەکەنەوە کە "کاتێك من وشەیەك بەکاردێنم، رێك ئەو مانایەی هەیە کە من بۆم هەڵبژاردووە، نە زۆرتر نە کەمتر". خودگەر جیهان بە پێی پێوەرەکانی خۆی دەناسێت، راڤە دەکات و لە بارەیەوە حوکمدەدات. ئەو بڕوایەی بەوە هەیە کە بڕواکانی خۆی پێوەری کۆتایی و ستانداردی دروستی و ناتەندروستی کردارەکان، تیورەکان و حوکمە ئەخلاقیەکانە. ئەوە هەستی کەسایەتی ئەو و نەخوازراوەکانی ئەو و پێویستی و نا پێویستیەکانی جێی قبوڵکردنی ئەوە کە دەستنیشانکەری دروست و نادروست و ئەخلاقی و نا ئەخلاقیە. لە راستیدا دیدەکانی ئەمڕۆی ئەخلاق کە لەسەر بناغەی رەدکردنەوەی بڕاوەی حوکمە دیۆنتۆلۆجیەکان دامەزراون، وەك کاردانەوەیەك لە بەرامبەر عەقڵباوەڕی مۆدێرندا دروستبوون، دەکرێت تا رادەیەك بە خودگەر ناوببرێن. دیارە بەو مەرجەی کە تاکی خودگەر بازنەی راستی ئەو دەرئەنجامە ئەخلاقیانەی بەدەستیهێناوە، تەنها بە کردارەکانی خۆی سنوردار بکات و بە زاراوە "زیهنیگەرێکی رادیکال" بێت.

لە بەرامبەر ئەمەدا دیدی بابەتگەر هەیە کە بڕوای بە ستانداردە ئەخلاقیەکان و جۆرێك ژیانی ئەخلاقیە کە لە خواستە فەردی و کەسێتی و زیهنیەکان، سەربەخۆیە. بابەتگەری مەترسی دیدی خودگەری لە ئاژاوەی ئەخلاقیدا دەبینێت و بەڵگە دێنێتەوە کە ئەگەر هەر کەس رێگەی هەبێت چی دەیەوێت بیکات، ئەو کات لە بەردەم مەترسی کەوتنە ناو نیهیلیزمەوەین. دۆستۆڤیسکی بە سەرنجدان لەم مەترسیە بوو کە دەیگووت هەر کاتێك وتەی کافرەکان قبوڵبکەین و بڵێین خوداوەند، ئەم بالاترین هێزە دروستکەرەی پێویستە بابەتیانەی ئەخلاق، بوونی نیە، ئەو کات رێگەمان دەبێت هەموو کارێك بکەین. بابەتگەر جەخت لەوە دەکات کە بە پێچەوانەی دیدی زیهنیگەرەکانەوە، کارە تایبەتیەکان ناتوانن باش دروست بن (بۆ نمونە کوشتنی کەسێکی دی، دزی، دەستدرێژیکردنی جنسی) و ئەمەش حوکمێکی بڕاوەیە. وەك هەقیقەتێکی بابەتیە کە بەشێوەی فەرمان، حوکم یان یاسا دێت و هەموان دەبێت لە کرداردا جێبەجێی بکەن. لە راستیدا لە نێوان بابەتگەری و دیۆنتۆلۆجیدا نزیکیەکی لۆژیکی هەیە. هەردووکیان لە یەك سەرەتاوە دەستپێدەکەن. بەڵام لە نێوان زیهنیگەری رادیکالانە کە بڕوای بە رەسەنایەتی هەمەڕەنگی رەوایەتیە ئەخلاقیەکان هەیە، لەگەڵ دیدی تیۆلۆجیدا، ناتوانرێ هیچ

هاوئاهەنگیەك بدۆزرێتەوە. چونكە یەك ئامانجی دوایی و قابلی قبوڵی هەمووان لە دیدی زیهنیگەری رادیكاڵدا بوونی نییە.

تیورەی خودگەری رادیكاڵ رێگە بۆ دیدی رێژەگەریانە دەكاتەوە. لە بەرامبەردا بابەتگەری بە گشتی بە حوكمە دیۆنتۆلۆجیەكان واتە یاسا ئەخلاقیە یەكتاكان دەگات. دیارە دەشێت تیورەیەك هەم بابەتگەر بێت و هەم رێژەگەر. كۆمەڵگا و یاسا، دروستی یان نادروستی كرداری كوشتنی كەسێكی دی دیاریدەكەن. بەپێی هەلومەرجە كۆمەڵایەتیە - كلتوریە جیاوازەكان یاساكان جیاواز دەبن، بەڵام بەهەر شێوەیەك بووە جێبەجێكردنی یاساكان پێویستە. بە مانایەكی دی بە پێی هەلومەرجەكان و مەرجە تایبەتیەكان و لەسەر بناغەی دیدی رێژەگەریانە دەكرێت یاساگەلێكی بابەتی و رەها دابڕێژرێ كە چیدی ملكەچی خودگەری و رێژەگەری نەبن و جێبەجێكردنیان، بەشێوەیەكی رەها پێویست بێت.

لێرەدا مەسەلەیەكی ئاڵۆز دێتە پێشێ. گریمان كردارێك بەپێی یاسا رێگە پێدراو یان پێویستە. كوشتنی كەسێكی دی لە پێناوی بەرگریكردن لە خود، لە خێزانی خود و تەنانەت لە پێناوی بەرگریكردن لە بێگوناهان، لە یاساكانی زوربەی وڵاتەكاندا رێگەپێدراوە. هەر بەمشێوەیە كوشتنی سەربازی دوژمن لەسەر بناغەی ئاراستەكردنی سیاسی، كۆمەڵایەتی و سەربازی (ئەوەی كە من لە پێناوی بەرگریكردن لە وڵاتدا بەو كارە هەڵساوم) بە شێوەیەكی گشتی رێگەپێدراوە. ئایا كاری ئەو كۆمەڵە سەربازە ئەمریكییەی كە بەشداریان لە جەنگی ڤێتنامدا نەكرد و كۆچكردن و زیندانكردنیان لە كوشتنی خەڵكی بێگوناه پێباشتر بوو، كارێك كە بەپێی دیدی رەهاگەری و دیۆنتۆلۆجیانە رەوا نییە، لە رووی ئەخلاقییەوە كارێكی نادروست بوو؟ ئایا سەرپێچیكردن لە حوكمگەلێكی وەك: "تۆ دەبێت لە كاتی جەنگدا خزمەت بە وڵاتەكەت بكەیت؟"، "تۆ دەبێت یارمەتی سەركەوتنی سوپاكەی خۆت لە جەنگدا بدەیت"، "تۆ دەبێت سەربازی دوژمن بكوژی"، لە نمونەی ئەو سەربازانەی كە بەشداریان لە جەنگی ڤێتنامدا نەكرد، ئاژاوەیەكی ئەخلاقییە؟.

جگە لەمە ئایا هەمان ئەو حوكمە هەمەكی و رەها و دیۆنتۆلۆجیانە، وەك حوكمی یاسا مەدەنیەكان لە رێگەی راڤەكردنە شەخسیەكانەوە، واتە بەپێی تاوتوێكردنی ئەگەرە پراكتیكیەكانی بەدیهاتنی پێشگریمانەكانی ئێمەوە نیە كە دەرك دەكرێت و جێبەجێ دەكرێت؟ چەمكی بەرگری لە خود كە دەكرێ رەوایەتی بە كوشتنی مرۆڤێكی دیش بدات، تەنها لەسەر بناغەی راڤەكردنێكی تایبەت دەتوانێت لە بارەی جەنگەوە بەكار بهێنرێت؟ سەربازێكی ئیسرائیلی بڕوای وایە كوشتنی كەسێكی ناڕازی فەلەستینی، لە پێناوی بەرگریكردن لە ئیسرائیل و هاوڵاتیانی ئیسرائیلدایە. ئایا ئێمە ناچارین بۆ داوەریكردن لە بارەی كاری بەرجەستەی ئەو سەربازەوە، واتە كوشتنی لاوێكی بێگوناه، بە راڤەكردنی ئەو بۆ "بنەمای" بەرگریكردن لە خود، وازبهێنین؟ لە راستیدا دیدی زیهنیگەری رادیكال و رێژەگەر دەریدەخات كە سەرسەخترین حوكمە دیۆنتۆلۆجی و رەهاكانیش، كۆمەڵێك حوكمی راڤەیین. نوسینەكەی هانائارنێت "ئایشمان لە ئۆرشەلیم"دا و پرۆژەی ئەو لە بارەی "داڕزانی خراپەوە"، ئەم لایەنە روندەكاتەوە. هەر كەسێك بەپێی تەسلیمبوون بە حوكمە ئەخلاقیە رەهاكان (لە راستیشدا بەپێی راڤەكردنەكانی بۆ ئەو حوكمانە كە دەكرێت

راڤەکردنێك بن لە خزمەتی تاواندا)، دەکەونە هەڵوێستی هەڵبژاردنی خراپەوە. لە هەلومەرجی ئەخلاقی دیۆنتۆلۆجیانەدا، بە پێچەوانەی روکەش زانستی و رەهاگەرانەی حوکمەکانیەوە، کرداری راڤەکردن بەردەوام دەبێت. هەر کەسێك دەتوانێت رەوایەتی بۆ کارەکانی خۆی بدۆزێتەوە، و هەموانیش هەروا دەکەن.

بناغەی بڕوای ئەو کەسانەی لە وتوێژە ئەخلاقیەکاندا، "سروشتگەرن"، واتە ئەو بابەتگەرانەی کە بڕوایان وایە داوەریە ئەخلاقیەکان، دەرخەی "کۆمەڵێك راستین" لە بارەی جیهانەوە، بەهۆی دیدی هێرمۆنتیکی سەرەوە، دەچیتە ژێر پرسیارەوە. سەربازێك کە دێهاتیەکی بێگوناه ناکوژێت، لەسەر راڤەکردنێك بۆ باشە و دیارە بۆ ئەنجامدانی ئەرك، خزمەتکردن بە وڵات و ئەمجۆرە شتانە، وا رەفتار دەکات. ئەم راڤەکردنانە ناگەڕێنەوە بۆ مەسەلە سروشتیەکان، بەڵکو دەگەڕێنەوە بۆ راڤەکردنی دی.دواجار هەڵسەنگاندنی ئێمە لە بارەی دروستی و نادروستی کاری سەربازە ئیسرائیلەکەوە کە فەڵەستینیەکە و سەربازە ئەمریکیەکە کە ڤێتنامیەکە و فەرمانبەری ئاشڤێتز کە یەهودیەکە دەکوژێت، بۆ راڤەکردنی ئێمە بۆ کوشتن و بۆ کاری تایبەتی ئەو سەربازانە و بۆ ئەو راڤەکردنانەی بۆ رەوایەتیدان بە کارەکەیان کردویانە، دەگەڕێتەوە، نەك بۆ مەسەلە سروشتیەکان. ناڕازیبوونی من بۆ سزادانی لە سێدارەدان، دەکرێت لە بەرئەوە بێت کە توانای گەڕاندنەوەی نیە. واتە لەسەر بناغەی ئەو تێڕوانینە یان راڤەکردنەی من راوەستا بێت کە ئەنجامدانی کارێکی کە نەتوانین بۆی بگەڕێینەوە و چاکی بکەین، راست نیە. ئەگەر کەسێك لە سێدارە بدرێت و پاش مردنەکەی دەرکەوێت بێگوناه بووە، رێگەیەك بۆ گێڕانەوەی ژیان بۆ ئەو مرۆڤە نیە. لەسەر بناغەی ئەم تێڕوانینە، من حوکمێکی ئەخلاقی بۆ دژایەتیکردنی حوکمی لە سێدارەدان دەدەم.

## سەرچاوە:

بەشێك لە فەسڵی دوهەمی ئەم کتێبە: "بابك احمدی: معمای مدرنیته. تهران. نشر مرکز. چاپ اول . 1377".

# مێژوی پەرەسەندنی هوشیاریی دیموکراتی مۆدێرن

ئالان تۆرین
لەعەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

## (بەشی یەکەم)
### کۆماریخوازەکان و لیبرالەکان

دوو جۆر لێکدانەوە سەبارەت بەگەشەی رژێمە دیموکراتـەکان خراونەتـە ڕوو: یەکـەمیان، پێیوایـە دیموکراسـی هاوشـانی بـەرفراوانبوونی مـافی دەنگدان و کەمکردنـەوەی تەمـەنی یاسایی بۆ ئـەو کەسانەی مافی دەنگدانیان هەیە پەرەی سەندووە، کـە چـەندین توێـژی نـوێی پیـاوان پاشـان ژنـان پێڕەویانکردووە. لەلایەکی ترەوە هەمان لێکدانـەوە پێیوایـە هاوکـات لەگـەڵ ئـەو شـتەی نـاونراوە دیموکراسیی ئابووری‌و پیشەسازی کەدواجار چەند فۆرمێکی دیموکراتیی بەخشییە بوارگەلێکی ژیانی کۆمەڵایەتی، دیموکراسیش زیاتر بڵاوبۆتـەوە. بەڵام لێکدانـەوەی دووەم، بەپێچـەوانەوە، نیگەرانـە لەئاست کەمبوونەوەی سەربەخۆیی کایـەی سیاسـی لـەو کۆمەڵگانـەدا، کـە وردە.. وردە، چـوونەتە ژێـر کۆنترۆڵی بەرژەوەندییە ئابووریـەکان یـان کۆنترۆڵی دەزگـا کارگێڕیـەکانی دەوڵـەت. بـەمجۆرە، هـەروەك کەسـانێکی زۆر پێیانوایـە، مـرۆڤ لـە مەلـەکوتی سیاسـەتەوە گواسـتوویەتیەوە بـۆ مەلـەکوتی ئـابووری، لـەبری ئـەوەی بـەدوای ئازادیـدا بگـەڕێ خەمی دابینکردنی پێداویستیەکانێتی. لێکدانەوەی یەکـەم بەئەندازەیـەك گەشـبین و سـاویلکانەیە کـە توانـای قەناعـەت پێهێنـانی لەدەسـتداوە. بـەڵام لێکدانـەوەی دووەمـیش تـا ئاسـتێکی زۆر هەڵەیـە، چـونکە ئـەوەی لـە ئـەوروپا لـەڕووی تیـۆریی و پراکتیکییـەوە، لەناوەڕاستی سـەدەی حەڤـدەوە تـا ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەیـەم بەرهـەم هـاتووە، دەوڵەتی دیموکراتی نەبووە بەڵکو دەوڵەتی مۆدێرن بـووە وەك زادەی ئـەقڵ، وەك هـەوڵێك بـۆ ئـەوەی

(ئـیرادەی گشـتی) جێگـەی هـەرەمی پلەوپایـەو ئیمتیازەکـانی کۆمەڵگـەی نـەریتپارێز بگرێتـەوە. داهێنانی کایەی سیاسی لـە ماکیاڤیللی و بودانـەوە تـا هـۆبس، لـە هۆبسیشـەوە بـۆ رۆسـۆ، تـا گـەورە لیبراڵەکانی سەرەتای سەدەی نۆزدە، سـەرباری ئـەو فۆرمە ئۆلیگارشییەی هەندێ جار بەخۆوەی بینیوە یـان هەنـدێجار وەك هاوشـێوەی دەسـەڵاتی شانشینی رەها دەرکـەوتووە، هـەڵگری رەهەنـدێکی دیمـوکراتیش بـووە. دەکـرێ ئاوەڵنـاوی کۆمـاری بخەینە پاڵ ئەو جۆرە دەوڵەتە مۆدێرنە، ئەگەرچی زۆرجار میرێك یان پادشایەك سەرۆکایەتی کردووە، چـونکە ئـەو دەوڵەتـە بایـەخی زیـاتری بـە بەبنەماگـەلێکی نـوێی مەرجـەکانی فـەرمانڕەوایی داوە بەرلەوەی بایەخ بەسیفەتی نوێنەرایـەتیکردنی کەسی فەرمانڕەوا بدا. کاتێ ئەو دەوڵەتە باس لە میللەت دەکا —چ جای باس کردنی نەتەوە— وتەزای کۆمەڵایـەتی بـەکارناهێنێ، بـەڵکو وتـەزای سیاسـی بەکاردێنێ کە گوزارشت لەخڕبوونەوەی بەکۆمەڵی سیاسـی دەکـا نـەك گردبوونـەوەی کۆمەڵایـەتی کـە دەشێ دەستکورت بێ لەبواری سیاسیدا.

بـەڵام دروسـتبوونی بیرۆکـەی دیموکراسـی "مـۆدێرن" لەگـەڵ ئـەو پشـێوییەدا یەکدێتـەوە کـە دەوڵـەتی کۆمـاریی مـۆدێرن وێنـەی پێوەگرتـووە، هـەروەها لەگـەڵ دەرکـەوتنی بیرۆکـەی نوێنەرایەتیکردنـدا یەکدێتـەوە کـە بایـەخێکی بـەردەوامی هەیـە. ئـەو ناکۆکییـە کلاسـیکییەی لـەنێوان دیموکراسـیی راسـتەوخۆو بـەڕێوەبردنی سیاسـیی زاتی‌ـو رژێمـەکانی نوێنەرایەتیکردنـدا هەیە، پاساوی خۆی هەیەو لەسەر چەند بنەمایـەکی واقعـی دامـەزراوە.. چـونکە حـوکمی میللـی راسـتەوخۆ، هـەروەك رۆسـۆ وێنـای کـرد، لەگـەڵ فەلسەفەی رۆشنگەریدا دەگونجا. پرنسیپی ئـەو حوکمـە بریتی‌بـوو لـە بەئـەقڵانیکردنی سیاسـی، بەئـەقڵانیکردنی بەرژەوەندیـەکانی تاکەکـەس بەرامبـەر بەئـەقڵانیکردن و کـامڵکردنی کۆمـەڵ بەگشتی، واتە دامەزراندنی دەوڵـەتێکی هاوشوناس لەگـەڵ کۆمەڵگـەدا. ئەمـە لەکاتێکـدا بیرۆکـەی نوێنەرایـەتیکردن جیاکـاریی خسـتە نێـوان نوێنـەرەکان و نوێنەرایـەتیکراوەکان، ئـەو جیاکارییـەی کـە دەبـوو وەك جیاکـاریی نێـوان خواسـتن و خسـتنەڕوودا (الطلـب والعـرض) بخرێتـەڕوو، کـە لەهـەر بـازاڕێکی سیاسیدا هەیـە. ئەمـە ئـەو چوارچـێوەیە بـوو کـە "بێرنـار مانـەن" پێیوابـوو بێسـوودو نابووتـە، بـەڵام خـۆی لەخۆیـدا چوارچـێوەیەکە بـۆ چەسـپاندنی رێچـکەیەکی سەنتراڵ، کە زادەی پرۆسەی جیاکارییەوە لەنێوان داواکارییـە کۆمەڵایـەتی‌و کولتوریـەکان وئەرکـەکانی فەرمانڕەواییـدا. پرۆسـەی دەنگـدانی گشـتی‌و هەڵچـوونی داواکـاریی کرێکـاران دوو هۆکـار بـوون بـەرەو گواسـتنەوە لـە رژێمـە کۆماریەکانـەوە، کـە زۆرجـار کەسـانێکی لیـبراڵ حوکمیانـدەکرد، بـۆ ئـەو رژێمـە دیموکراتانـەی کـە هەنـدێ کـەس ئاوەڵنـاوی بۆرجوازییـان دەخسـتنەپاڵ، کـە زۆرجـار بـەرەو سیسـتمی دیمـوکراتی پیشەسـازی یـان سۆشیالیسـتی— دیمـوکراتی، بەتایبـەتی لـە ئەوروپای باکور، هەنگاویان دەنا.

ئیـدی ئـەوکات ئـەو پارتـە جەماوەریانـە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا کە رۆڵیان بریتی بوو لە دۆزینـەوەی پێکـەوەگونجان لـەنێوان بەرژەوەندیگـەلێکی کۆمەڵایـەتی تایبـەت و بەرنامەگەلێکی فەرمانڕەوایی دیاریکراو. بەڵام ئەو سەرکەوتنە سەرکەوتنێکی بێ‌سەروبەر بوو کە هەر

زوو پـەكی كـەوت، چـونكە لكانـدنی لـەو جـۆرەی بواری سیاسـی بـەبواری كۆمەڵایەتییـەوە دەسـەڵاتی سیاسـیی لاوازكـرد كـە خـەڵكانێكی زۆر پێیـانوابوو بـەرەو لەناوچـوونی كۆتـایی دەڕوا. ئـەو دۆخـە دەرفـەتی لەبـەردەم ناسیۆنالیسـتەكانی دەوڵەتـە پیشەسازییە پێگەیشتوەكان رەخساند كـە خۆیـان بسـەپێنن بەسـەر سیسـتامێكی سیاسـیی لەبەریەكهەڵوەشاودا.

بـەخۆماڵیكردنی ئـابوری و كولتـور، كـە ئـەو دەمـە پـاش كۆتاییهـاتنی سـەردەمی پیشەسـازیی جـەنگ هاتـەگۆڕێ، وەك پرۆسـەیەك كـە لـە وڵاتـە دەوڵەمەندەكانـدا هاوكـات بـوو لەگـەڵ گەشـەكردنی خێـرای بـەرخۆری (ئیسـتهلاك)و پەیوەندییـە جەماوەریـەكان.. بووەهـۆی تەقینـەوەی زیـاتری نمونـەی كۆماریخوازی كە زاڵ بوو بەسـەر "پرسـی كۆمەڵایـەتی"دا، ئـەو نمونەیـەی كـە لەسـەدەی نۆزدەوەو لە ئەوروپا برەوی پەیداكرد. لەو دەمەوە سیسـتامی بەرهـەمهێنانی نێونەتـەوەیی كـە لـەژێر ڕكێفـی بـازاڕە جیهانیەكانـدا بـوو لـە سیسـتامە سیاسـییە نەتەوەوییـەكان جیـابۆوە، ئەمـە پـاش ئـەوەی داواكـاری كۆمەڵایـەتیو كولتـوری بـەدەر لـە بەرنامـەی دەسـەڵات بەسـەر ئـەو سییسـتمانەدا زاڵ بـوو، چـونكە داواكارییـەكان بایـەخیان بەكێشـەی كۆمەڵە تایبەتـەكان و تاكەكان دەدا وەك كەسانێكی چالاك، وەك هێزگـەلێكی بكـەر كـە بـوونی تایبـەتی خۆیـان دەسـەلماند. "بێرنـار مانـەن" ئـەوەی ڕوونكـردەوە كـە قـەیرانی سیسـتمی حیزبایـەتی پەیوەندیی بەقەیرانێكی گشتییەوە نەبوو سەبارەت بـە نوێنەرایـەتیكردن یـان سـەركەوتنی سیاسـەتی خۆنمایشكردن، بەڵكو پێویستە وا لێكبدرێتـەوە كە جۆرێـك بـوو لـە وەرچـەرخان لـە فـۆرمێكی نوێنەرایـەتیكردنی سیاسـییەوە بـۆ فـۆرمێكی تـر. بگـرە مـرۆڤ دەتوانـێ سـەركەوتنی دیموكراسـی لـەو قەیرانـەوە ببینـێ، چـونكە گوزارشـتێكی تونـدو هەمـەجۆرە لـە داخوازییـە كۆمەڵایـەتی و رۆشـنبیریەكان، یـان بەمانایـەكی گشـتی تـر ئـەو قەیرانە خەسڵەتێكی جیاوازترو زیـاتری بەخشییە هەریـەك لـە دەوڵـەت و سیسـتەمی سیاسـیو كۆمەڵگەی مەدەنی.

## زەینیەتی كۆماری:

بیرۆكـەی سـەروەری میللـی ئـەو پنتـە بـوو كـە فیكـری دیموكراسـیی لەسـەر دامـەزرا. تـا دەسـەڵات شەرعیەتی خۆی زیاتر لە نەریتەكاندا بدۆزێتەوەوە، یـان زیـاتر بەشـوێن مـافی داگیركـاریو بەزانـدنی سنورەكاندا بگەڕێ، یان خۆی بەنوێنـەری خواسـتی یـەزدانی بزانـێ، ئـەوا ئەقڵیـەتی دیموكراسـی (ئەگەرێكی) نائامادەیە. دیموكراسی نایەتەبوون تـا خـاوەن دەسـەڵات نوێنـەرو جێبەجێكـەری فەرمانـەكانی ئـەو گەلـە نـەبێ كـە تاقـە خـاوەنی سەروەرییە. ئەم بیرۆكەیە لەدایكبوونی مۆدێرنیتەی سیاسـیی لـەخۆگرت، ئـەو وەرچـەرخانەی كـە دەسـەڵاتی كـردە ئیـدیۆمی خواسـتی مرۆیـی، نـەك خواستێك كـە فـەرمانی یـەزدانی دەیسـەپێنێ، یـان بـەپێی نـەریت و ترادسـیۆن و سروشـتی دۆزەكـان دێتـەبوون. هەرچـەندە جاڕنامـەی مافـەكانی مرۆڤـی ئینگلیزی، كە شوباتی 1698 دەرچوو، راشكاوانە باسـی لـە سـەروەریی میللـی نـەكرد، بـەڵكو بەپلـەی یەكەم بانگەوازی بۆ كۆمۆنەو لۆردە نەریتپارێزەكان كرد..، بەڵام هـەردوو شۆڕشـی ئـەمریكیو فەرەنسـی بانگـەوازیان بـۆ پرنسـیپی سـەروەری گـەل كـردو

سیستمی پادشایەتییان لەبەینبرد کە ڕێگر بوو لەبەردەم ئەو پرنسیپەدا. ئەو بڕیارانە، کە دامەزرێنەر بوون، دوا وێستگەی فیکری سیاسیی لیبراڵ بوون، دوای ئەوەی هۆبس و ڕۆسۆو لۆك.. جەختیان لەسەر مۆرکی (دامەزراندن) کردەوە کە پێویستە هەر داهێنانێکی ئارەزومەندانەی هاوبەندیی کۆمەڵایەتی لەخۆی بگرێ. هۆبس ئەو هاوبەندییە ناودەنێ پەیمان و گرێبەند، لۆك ناویدەنێ متمانە، هەرچی ڕۆسۆ-یە ناوی لێدەنێ پەیمانی کۆمەڵایەتیی.

بەبێ بیرۆکەی سەروەریی میللی دیموکراسی هیچ جۆرە بوونێکی نییە. بەڵام ئایا دەشێ شوناسگۆڕکێ لەنێوان یەکەم و دووەمدا ئەنجامبدەین؟ ئایا دەتوانین سەروەری گەل بە پێناسەی تەواوی دیموکراسی لەقەڵەمبدەین؟ ئەمە جۆرێکە لەڕۆچوون بەرەو ئاقارێك دوور لە ئاقارێکی تر. بەهەرحاڵ ناتوانین هۆبس بە کەسێکی دیموکرات لەقەڵەمبدەین، لەکاتێکدا ئەو بە تیۆرسازی حوکمی ڕەها لەقەڵەم دەدرێ..، بەهەمان شێوە ڕۆسۆ کە کەسێکی کۆماری بوو، بڕوای بە دیموکراسی نەبوو تەنها لەسنوری کۆمەڵە بچووکەکاندا نەبێ. بەڵام ئەو شتەی کە ڕۆسۆ ناوینابوو ئیرادەی گشتی، کە لەیەك کاتدا هاوبەندیی کۆمەڵایەتی ئارەزومەندانەو هاوبەندیی پابەندکەری دەخولقاند، ناتوانین تێکەڵی بکەین لەگەڵ ئیرادەی زۆرینەدا، ئەڵبەتە ڕۆسۆ خۆیشی هەمان ڕای هەبوو. چونکە بیرۆکەی کۆماریخوازی و بیرۆکەی سەروەریی میللی کە بیرۆکەی یەکەمیانی لەسەر دادەمەزرێ، دوو بیرۆکەن سنوری (دەوڵەتی ماف) دەبەزێنن، کە مۆنتسکیۆ مەیلی ئەوەی دەکرد بیکاتە هاوشوناسی حوکمی شانشینی، چونکە بەڕای وی دژی ستەمگەری بوو، بەو پێیەی پادشا بەگوێرەی یاسا ڕەفتار دەکا نەك بەگوێرەی ئارەزووەکانی. بەڵام ئەو دوو بیرۆکەیە (کۆماریخوازی و سەروەریی میللی) نەگەیشتنە ئاستێك کە بتوانن سنوری دەسەڵاتی نوێنەرایەتی دەستنیشان بکەن. چونکە بیرۆکەی کۆماریخوازی لەسەر بنەمای سەربەخۆیی بەرکەوتی سیاسی دادەمەزرێ، کە مەرج نیە بنەمایەکی خاوەن مۆرکی دیموکراسی بێ. ئایا بیرۆکەی کۆماریخوازی، کە لەسەرەتای شۆڕشی فەرەنسیو پێش ڕوخاندنی حوکمی شانشینیش لەئارادابوو، ئەو بیرۆکەیە نەبوو کە دەسەڵاتی ڕەهای لێکەوتەوە، کە لەسەر دەستی کۆنڤۆسیۆنەکان و یانەو کۆمیتەکانی ڕزگاریی‌و ئاسایشی گشتی پێڕەوکراو هێندەی نەبرد بووە حوکمی تیرۆرو تۆقاندن؟ ئایا شۆڕشەکان بەگشتی بانگەوازیان بۆ سەروەریی میللی نەکرد، بەڵام پاش ڕوخاندنی ڕژێمە کۆنەکان لەبری ئەوەی ڕژێمی دیموکراتییان لێبکەوێتەوە ڕژێمی دەسەڵاتگەریان خستەوە؟ ڕاستە ئەمانە هۆکاری ئەوە نەبوون کە شۆڕشی فەرەنسی لەبری ئەوەی بانگەواز بۆ دیموکراسی بکا، دروشمی نەتەوەو هاوڵاتی‌و زەینییەتی کۆماریی بەرزکردەوە، (ئەو خاڵەی کە پییەر ڕۆزانڤالۆن لەکتێبی هەڵوێستەکانی دیموکراسی-دا دەیخاتەوە یادمان)، چونکە وشەی دیموکراسی، تا ئەو سەردەمەو تا ساڵی 1848یش، زیاتر جۆرێك بوو لە ئاماژە بۆ نمونە کۆنەکانی دەسەڵات کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو دەستەجەمعی لەلایەن گەلەوە پێڕەوکراوە. بەڵام لە واقعدا دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات لەلایەن گەلەوە، کە بەناوی کۆماریخوازییەوە پیرۆزکراو کرایە ئامرازی

لەناوبردنی سیستمی کۆن، (لەهەمان کاتدا) بۆنابارتیزم و تۆقاندنی لێکەوتەوە.

بیرۆکەی هاوبەندیی کۆمەڵایەتی ئارەزومەندانە دەبێتە هاوواتای بیرۆکەی هاوڵاتیبوون گەر بڕوا بەوە بێنین کە پەسەندکردنی هاوبەندییەك لە هاوبەندیەکان پەسەندکردنێکی ئارەزومەندانە نیە گەر ملکەچی نوێبوونەوە، یان هەڵپەساردن، یان دروستکردنەوە نەبێ بە شێوەیەکی ئازاد، بەڵام شوناسگۆڕینەوەی دەستەجەمعی لەگەڵ سەرۆکێکدا، یان نەتەوەیەکدا، واتە لەدەستدانی ئیرادەی فەردیو توانەوەی ئەو ئیرادەیە لە بۆتەی ئەزمونێکی دەستەجەمعی باڵادا کە کەس بەهیچ شێوەیەك نەتوانێ بەرەنگاری ببێتەوە. هەرە ئەمەش ئەو هۆیە بوو بیریارانی سەرەوەریی میللی ناچارکرد مافی بەرەنگاری حوکمی داپڵۆسێنەر بسەلمێنن، کاتێ (چەمکی) سەرەوەریی میللییان دەستنیشانکرد بەوەی سەروەرییەکە ناچێتەوە سەر هیچ شتێك جگە لە خۆی.

تەنانەت نەهێشتنی ئیمتیازەکان، کە وەك "سێیس" پێیوایە، مانایان بەخشی بە تاکگەریی دیموکراتی، ئەو مانایەی کە لەلایەن "جان دی برۆدان"و "پییێر رۆزانڤالۆن"وە لە کتێبێکدا، کە بەم دواییانە دەرچوو، شیکراوەتەوە. بەڵام نەهێشتنی پلەبەندیو ئیمتیازەکان بەس نیە بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی سیاسیی مۆدێرن. چونکە رەنگە ببێتەهۆی قەیرانێکی سەخت، لەکاتێکدا دەستورناسان پێیانوایە دەشێ ئەفراندنی کۆمەڵگەیەکی نوێی لێبکەوێتەوە. بۆیە دەبێ هاوڕای "پییێر رۆزانڤالۆن" بین، کە بەدرێژایی کتێبە نایابەکەی لەژێر ناونیشانی "خەملاندنی هاوڵاتی"، جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە دەستورناسان بەنیازی گواستنەوەی سەروەری بوون لە پادشاوە بۆ گەل، هەر لەو پێناوەشدا "پێویستە مامەڵە لەگەڵ ئەو پادشایەدا بکرێ وەك (رەمزی) بەرجەستەکردنی تەواوی کۆمەڵگا، بەو مانایەی پێویستە ببێتە هاوشوناسی نەتەوە"(ل60). لە بەرامبەر تێگەیشتنی ئینگلیزیدا بۆ دیموکراسی، کە لەسەدەی هەژدەوە لەژێر کاریگەریی فیکری سوودگەریدا بووە..، تێگەیشتنی فەرەنسی بۆ ئەو چەمکە مەحکوم بووە بە بیرۆکەی سەروەریو یەکسانی هەموان لەبەردەم دەسەڵاتی رەهای یاسادا کە سیستمی شانشینی دەیسەپێنێ، کە ئەوەش لەگەڵ شیکردنەوەی کلاسیکیدا یەکدێتەوە وەك تۆکڤێل باسی لێوە دەکا. بەمجۆرە رۆزانڤالۆن دەڵێ: "کەواتە مافە سیاسیەکان هەڵقوڵاوی رێچکەیەکی دیاریکراوی نوێنەرایەتیکردن نین، کە جیاوازیو هەمەجۆری لەکۆمەڵگەدا دەسەلمێنێو حسابی بۆ دەکا، بەڵکو هەڵقوڵاوی بیرۆکەی بەشدارییە لەسەروەریدا"(ل71). پاشان لە کۆتایی کتێبەکەیدا دەربارەی مافی دەنگدان دەڵێ: "بەشدارییەکی گەوهەریی دەکا، وە ك جۆرێك لە ئینتمای رەمزی بۆ کۆمەڵگا، وەك شێوەیەك لە پەسەندکردنی دەستەجەمعی کە تازەدەبێتەوە، (هاوشێوەی) دەسەڵاتی شانشینی کۆن"(ل452).

تێگەیشتنی سەروەری بەمجۆرە لەسەر بیرۆکەیەکی ئەقڵانی دادەمەزرێ، یان وەك بڵێین بیرۆکەیەکی وەزیفییە، بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیی: چونکە تاك خۆی دروستدەکاو کۆنترۆڵی هەواو ئارەزوو و بەرژەوەندیەکانی دەکاو دەتوانی بەئەقڵ رەفتار بکا، بەپێی بەشداریکردنی لە بەرهەمێکی هاوبەشدا کە لە جەستەی کۆمەڵگاوە سەرچاوەدەگرێ. لە کتێبی "رەخنە لە

مۆدێرنیتــــە"دا ئامـــاژەم بـــەوە داوە کـــە ئـــەو تێگەیشتنەی، لە ماکیاڤیلیو بودانەوە تا تالکوت و پارســۆنز، بـاڵی بەســەر فیکــری کۆمەڵایەتییــدا کێشابوو، سـەرباری نـەیاریی ژمارەیـەکی دیـار لـە بیریـــاران، تـــاکبوون و تاکگـــەریی کردبـــووە هاوشوناســی پێگەیشــتنی کۆمەڵایــەتی. هەربۆیــە بانگەشە بۆ جۆرێك لـە پـەروەردە دەکرا کـە لەیـەك کاتـــدا زانســـتیو نیشـــتمانییش بـــێ، هـــەروەها تاکگەریی دیموکراتی، بەگوێرەی دیدی "کانت"، لەگەڵ ملکەچی بۆ فەرمانە یەکلاکەرەوەکانی ئەقڵو یاسـا، بەیــەك گەیشــتنەوە. چــونکە ئــەو فیکــرە کۆمارییـە بـاوەڕێکی تونـدی هەیـە، هـەروەك بـاوەڕی دوا بەیاننامـەی پاپـا "لێبێرتـاتیس سـپلاندۆر"[1]، بـەوەی دەبـێ ئـازادی پاشـکۆی حەقیقـەتی هـەبێ، چونکە تـەنها لەڕێگـەی حەقیقەتـەوە ئـازادی کەشـف دەبێو ڕێزی لێدەگیردرێ.

ئەڵبەتــە لــە ســەردەمی شۆڕشــی فەرەنســیدا جیاکردنـەوەی هاوڵاتییـە چـالاکەکان لـە هاوڵاتییـە تەمبەڵەکان نەبووە هۆی بچووکبوونەوەی جەسـتەی هەڵبژاردن، بەوەی ببێتە کەمینەیەکی بچووك وەك لە سەردەمی ڕستۆراسیۆن-دا دەرکەوت، بەڵکو مانـای ئەوە بوو کە بیرۆکەی دەنگدانی هەموان پشتئەستور بــوو بــە تاکگــەریی ســەبارەت بــە بــەڕێوەبردنی کاروباری گشتی لەلایـەن ئـەو کەسانەوە کە خـاوەن ڕەفتــاری ئــازاد بــوون و کۆششــیان دەکــرد بــۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ئەقڵانی. ئەمـەش بووەهــۆی جیاکردنــەوەی تــەواو لــەنێوان ژیــانی گشتیو ژیانی تایبـەتی، لـەنێوان تـاك (وەك خـۆی)و وەك کــوڕی تایەفــە (کۆمیــونیتی بچــووك)، ئــەو جیاکردنەوەیــە بنەمایــەك نــەبوو لــە بنــەماکانی دیموکراســـی، بـــەڵکو بەپێچـــەوانەوە بنـــەمای قووڵکردنــەوەی جیـــاوازی بـــوو لـــەنێوان ئـــەو توێژانـەدا کـە بڕیـاردرا ئـەقڵانیین و ئـەو توێژانـەی بڕیـاردرا بەسـەریاندا کـە نائـەقڵانین، جائەگـەر ئـەو نائەقڵانیانــە شــێتەکان بگرێتــەوە یــان ژنــان بەشێوەیەکی تایبەتی. ئەوە سیاسەتی کۆماری بوو، بووەهـۆی پەرەسـەندنی پرۆسـەی دوورخستنەوەی (چـەندین توێـژ) لـە ژیـانی گشـتی. لێـرەوە لـەوە دەگـەین کــە بۆچــی نزیکــەی ســەدەیەك بەســەر فەرەنسـادا تێپـەڕی ئینجـا بڕیـاری ئـەوە درا کـە دەنگـــدانی گشـــتی ژنـــانیش بگرێتـــەوە (1945-1848).

ژیـانی سیاسـی لـە فەرەنسا، ئێستاشـی پێـوە بێ، ملکەچـی ئـەو تێگەیشتنەی دیموکراسـییە کـە هێــزە سیاســییە چـالاکەکان دەکاتــە پاشــکۆی پێداویسـتیەکانی کۆمــەڵگا -نەتــەوە-و پاشـکۆی هوشـیاریی دەسـتەجەمعیو ئـەو بەرژەوەندیانـەی ئـەقڵ بڕیاریـان لەسـەر دەدا. ئـەوە تێگەیشـتنێکی پـەتیو سـاکارە کاتـێ دەوڵـەت دەبێتـە دەزگایـەکی لاوازو تـــەنها وەك جەســـتەیەك دەردەکـــەوێ کـــە کـارێکی دوو جەمسـەر دەکـا: ڕەتکردنـەوەی ئـاین و ڕەتکردنـــەوەی بزاوتـــە میللیــــەکان. بــــەڵام دەبێتـــە دەزگایـــەکی خەتـــەرناکتر کاتـــێ دەوڵـەت پێشـکەوتنی کۆمەڵایـەتیو سەرخسـتنی بزاوتی پیشەنگەکان پێکەوە گرێدەدا، ئەو بزاوتـەی کـە دیکتاتۆریـەتی خـۆی، لەڕێگـەی ئەقڵـەوە یـان لەڕێگـەی ڕەوتـی مێژووییـەوە، بەسـەر کۆمەڵگـەی مەدەنیـدا دەسـەپێنێ، ئـەو کۆمەڵگەیـەی گوایـا - بـەڕای وان- بەرژەوەنـدیی تایبـەت و نەریتـەکان گەندەڵیکردوون.

هەر ئـەو تێگەیشتنە کۆمارییە بوو کاریگـەری قورسی لەسەر رای گشتی لە ئەمریکا دروستکردو،

تـــا ماوەیـــەکی درێـــژیش ئـــەو وڵاتـــە دژی خۆتازەکردنەوەو کەمینە کولتوریەکان بوو.

بگـرە بیرۆکـەی سـەروەریی میللـی، بیرۆکـەی کۆمـاریی، بنەمایـەکی پتـەو دادەڕێـژێ بـۆ کـۆروم (نصاب) سیاسی بەو پێیەی پێویستی بە بەرکەوتی مـافی سروشـتی هەیـە، کـە ڕۆسـۆ لـەڕووی لۆجیکییـەوە دژی بـوو. چـونکە گـەر سـەروەری بـۆ گەل بێ ئەوا ئەو دەسەڵاتەی ڕەوایەتی پێدەبەخشێ پابەنـدی هـیچ قەیدومـەرجێکی پێشـوەخت نابـێ، بـــەڵکو دەبێتـــە دەســـەڵاتێکی ڕەهـــا. بیرۆکـــەی کۆمـاریخوازی، لـەدۆخێکی وادا، دەچـێتەوە سـەر تێگەیشـــتنی (تیۆرســـازە) کۆنـــەکان، نـــەك تازەگـەرەکان. ئـەوەی تازەیـە تـەنها ئەوەیـە کـە چوارچـێوەی بەشـداری لـە ژیـانی نیشـتمانییدا بەرفراوانتر دەبێ، کە کاتی خۆی لە (ئەسینا) تەنها بـۆ کەمینەیـەك لـە هاوڵاتیـان قـۆرخ کرابـوو، تـا زۆرینەیـەك لـە دانیشـتوانی وڵاتێکـی دیـاریکراو بگرێتـەوە. ئـەم چـەمکە کلاسـیکیە تازەکراوەیـەی ئـازادی پشتئەسـتور نیـە بـە بیرۆکـەی ئـازادی یـان بیرۆکەی مافی تاك. چونکە گەر دژبوونێك بسازێنین لـەنێوان دوو کەلـەپوری فیکـری مۆدێرنـدا، کـە یـەکێکیان بـەرگری لـە ئـەقڵ دەکـا دژی نـەریت و ئیمتیازەکـان، ئـەوی تریشـیان بانگـەواز بـۆ ئـازادیی تاك دەکا..، ئەوا بیرۆکـەی کۆمـاریی تـەواو ئینتمـای بـۆ کەلـەپووری یەکـەم هەیـەو تـەواو گوزارشـتی سیاســـیی ئـــەوە. چـــونکە نەتـــەوە لای وی بوونـــەوەرێکی دەســـتەجەمعی نیـــە، بـــەڵکو گوزارشتێکە لە ئیرادەی ڕێکخستنی ئەقڵانی، (بەم مانایە) خۆی لە هەرپرنسیپێك قوتار دەکا سەبارەت بـە ئـازادی هەڵبـژاردن...، تـەنها بـەو پاسـاوەی کـە ئەقڵ ئاراستەکەریەتی. بانگەواز بۆ ئیرادەی گشتیو

بانگـەواز بـۆ پـەنابردن بـۆ ئـەقڵ دوو بانگـەوازی یەکتەواوکار نین، بەڵکو هـەردوکیان یـەك بانگـەوازن بـۆ ئـەوەی کـە ئـەقڵ جیاکـەرەوەی مرۆڤـە لـە بوونـەوەرەکانی تـر. لێـرەوە پێویسـتدەکا کایـەی سیاسـی زیـاتر لـە کایـەی زانسـتەوەو نزیـك بـێ، کـە پێگەیـەکی تایبـەت ببەخشـێ بـە زانایـان و مامۆسـتایان لـە کۆمـاردا، پاسـاویش ببەخشـێ بـەو میتۆدانـەی پـەروەردە کـە کـار بـۆ زاڵکردنـی بیرکردنـەوەی ئـەقڵی دەکـەن بەسـەر هەسـت و سـۆزو ئـارەزووە تایبـەتەکانـدا. هەربۆیـە ئـەو تێگەیشـتنەی باسکرا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەو فۆرمانـەی کـە سـەردەمانێکە تـا ئاسـتێکی زۆر لـە هـەموو وڵاتـە مۆدێرنەکانـدا لەیـەك دەچـن. ئـەو تێگەیشـتنە بەهـەموو نێوەنـدەکانی فێرکردنـدا بڵاوبۆتـەوە.. لـە قوتابخانـەی یەسـوعیەکان و پرۆتسـانتەکانەوە، تـا قوتابخانـە فەرمیـەکان، کـە ژمارەیـەکی زۆر لـە فێرخـواز لـەخۆدەگرن. بەئـەقڵانیکردن و زەینیـەتی نیشتمانیو ئلیتی کۆماری.. هەموویان وشـەگەلێکن دەکـرێ شـایەنی سەرسـامکردن یـان ڕەخنـەلێگرتن بـن، بـەڵام هـیچ لـەو وشـانە پەیوەندییـەکی یەکتـەواریان بـە زەینیـەتی دیموکراسـی، یـان گفتوگۆی ئازادنـە، یـان یاسـای زۆرینـەوە نیـە. بگـرە دەشێ بەهەمان ئەو ئەندازەیەی پاساودەری حوکمی دیموکراتییـە، کـە بێبـەری نیـە لـە سازشـکاریو گروپـەکانی بەرژەوەنـدی، بەئاسانییش پاسـاودەری سـتەمی تـاکڕەوی (ڕۆشـنگەر) بـێ. ئێسـتا ئـەقڵ لـە دڵـی کەسـانێکی زۆر لـە کۆماریخوازەکـان بۆتـە جێنشـینی یـەزدان، لانـی کـەم لـەو وڵاتانـەی کـە لـە کەلـەپوری سـەردەمی دژە–ڕیفـۆرمی کاسـۆلیکی یاخی بوون، بەڵام توندڕەویی ئەو ئەقڵە لە جەبری یەزدان و لە توندڕەوی بەئەقڵانیکردنی پیشەسازی

کەمتر نەبوو. چونکە فیکری کۆماریی دەسەڵاتی کەلەپور ناگۆڕێ بۆ دەسەڵاتی دیالۆگ، بەڵکو بۆ دەسەڵاتی حەقیقەت و پاشان دەسەڵاتی زانست.

لەلایەکی ترەوە بیرۆکەی کۆماریی دوورە لە بیرۆکەی مافەکانی مرۆڤەوە، کە ریشەیان راستەوخۆ دەگەڕێتەوە سەر مەسیحیەت. ئەو کێشەیە چارەسەرنەکرا، تەنها پاش خەباتی پێشەنگانی بیرۆکەی کۆماریخوازی نەبێ لەپێناو ئەو ئازادیانەدا، کە پارێزەرانی نەریتە مەسیحیەکان تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم، لە زۆربەی وڵاتاندا، دژایەتییان دەکرد لەژێر بەیداخی پاپاییدا کە سیللابۆس[2]ی پاپا بیتۆسی نۆیەم رابەرایەتی دەکرد. بەڵام نابێ ئەم کۆدژییە ئاشکرایە گومڕامان بکا، چونکە بۆرجوازیەتی لیبراڵو تەنانەت بزاوتی کۆماریخوازیش، بڕوایان بە رۆڵی خۆیان هەیە وەك رێبەری مرۆڤایەتی، بەوەی رۆشنگەریی ئەقڵ ئەوانیشی کردۆتە رۆشنگەر. ئەم متمانەیە شتێکە کە گەورە بیریاران و پێغەمبەران و بڵندگۆکانی مرۆڤایەتی کۆدەکاتەوە، کە بەناوی ئەقڵو ئازادییەوە بەرەنگاری دەسەڵاتەکان بوونەتەوە، قسەیان کردووە بۆ بەرگریکردن لەو کەسانەی، کە بەهۆی کەمیی تواناو کەمیی رۆشنبیریانەوە، بێدەرەتان و داماو بوون. بیرۆکەی کۆماریخوازی لە هەناویدا بیرۆکەی پێشەنگایەتیی هەڵگرتووە، کە لای لینینیستەکان بۆتە هاوتای بیرۆکەی شۆڕش، کە پاش کەڵەکەبوونی کلۆڵیو غەدر دەتەقێتەوە، بۆ رزگاربوون لەو شێوازانەی دەسەڵات، کە تەنها دوور نەبوون لە ئەقڵ، بەڵکو زاڵم و ستەمگەریش بوون، هەروەها بۆ واڵاکردنی دەرگاکانی ئایندە لەبەردەم ئەو پیاوە رۆشنبیرە قارەمانانەدا کە دەبوو رابەرایەتی گەل بکەن و گەل ببەن بە رێگای راستی خۆیدا. (لە راستیدا) شۆڕش دیموکراسی دەکا بە ئەگەرێك، بەڵام لەهەمان کاتیشدا رێگەدەکاتەوە بۆ هاتنەسەرکاری ستەمگەرێکی رۆشنگەر بۆ سەر دەسەڵات، جت ئیتر ئەو ستەمگەرە تاکەکەسێك بێ یان میرێك بێ یان حزبێك. مێژوو ئەم ئالۆزییەی خەستتر کردۆتەوە، بەجۆرێك ئەمڕۆ زۆر سەختە لە وشەی (پێشکەوتوخواز) بگەین کە سیاسیو بیریارە خاوەن زەینیەتە جاکۆبییەکان کەرەم دەکەن و بەکاریدێنن.

### ستەمی زۆرینە:

بیریاران و خەڵکانی دەوڵەتی لیبراڵ قەناعەتیان بە مەترسیەکانی دیموکراسی هەبوو. لای بیریارە ئەمریکیەکان، کە بیریان لە سیستمێك دەکردەوە زادەی شۆڕشەکەیان بێ (یان راستتر زادەی شەڕەکەیان بێ لەپێناو سەربەخۆییدا)، مەسەلەی ستەمی زۆرینە ئامادەییەکی زۆر بەرفراوانی هەبوو. رۆبێرت دال لە کتێبی "نامە فیدراڵیەکان"دا ئاماژە بۆ بایەخی ئەو مەسەلە مەرکەزییە لە فیکری موحافیزکاری مادیسۆن و هاملتۆن-دا دەکا، بەهەمان شێوە لە فیکری دیموکراتیی جیفرسۆن-دا. ئەو مەسەلەیە وەك پنتێکی سەنتراڵ لای روێر کۆلار، گیزۆ و تۆکڤێل-یش دەمێنێتەوە، کە دەربارەی شۆڕشی فەرەنسی بیریانکردۆتەوەو نوسیویانە. بەڵام چۆن کار بکرێ تا بڕیارەکانی زۆرینە نەبنە هۆی سەندنەوەی حوکم لە توێژێکی دیاریکراو *Sanior pars*؟ چۆن کار بکرێ تا لاوازیی ئەقڵیەتی میللی بەئاقاری حوکمی ئەقڵانیدا بڕوا نەك حکومەتی میللی و تیرۆریست، ئەو حاڵەتەی کە بەسەر "جاکسۆن"دا هات لە ئەمریکاو "تۆکڤێل"ی نیگەران کرد، یان ئەو

حاڵەتەی لە شۆڕشی فەرەنسیدا دەرکەوت؟ لێرەوە دەبینین کارکردن بۆ سنووردارکردنی گەیشتن بەدەسەڵات بۆتە خولیای سەرەکیی ئەوانەی کە بە دیموکرات ناسراون. ئێستا ئازادی هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایان لەلایەن خەڵکییەوە هەڵگری دەلالەتێکە کە لە هەموو کات زیاتر بەرتەسکتر بۆتەوە: ئێستا پێویستە لەسەر گەل بەئازادی گروپێکی سیاسی یان بەرنامەیەکی فەرمانڕەوایی پەسەند بکا، کە مەرج نیە ئەو گروپە یان ئەو بەرنامەیە هەڵقولاوی خودی گەل بن، بەڵکو زادەی نێوەندە رۆشنبیرییەکانن کە بەرپرس و بایەخدارن لەئاست بەرژەوەندیی گشتیدا، لەو نێوەندانەشدا پرۆژە ئەقڵانییەکان گەڵاڵە دەکرێن و بەیەکدی بەراورد دەکرێن. ئەم تێگەیشتنە نوخبەوییەی دیموکراسی سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، بەتایبەتی لە بەریتانیای مەزن، کە لەلایەن گەورە دەستورناسەکانی وەك باجیهۆت-ەوە بەرگری زۆری، بەبەڵگەوە، لێکراوە. خاڵێکی تر کە ئەو دۆخە لەو وڵاتانەدا پتەودەکا پەیوەندی بەوەوە هەیە کە حوکمی ئۆرۆستۆکراتی لەو شوێنانە لەڕێگەی شۆڕشی میللییەوە نەڕوخێندراوە، بەڵکو خودی ئۆرۆستۆکراتەکان رۆڵێکی گرنگیان بینیوە لە ناوبردنی سیستمی شانشینی رەهادا. ئەمەش ئەوە تەفسیردەکا کە ئەو وڵاتانەی لەدایکبوونی بیرۆکەی دیموکراسییان بەخۆیانەوە بینی تەنها بەم دواییانە مافی دەنگدانیان بەخشی بەو توێژانەی کە خاوەن لێهاتوویی نزمن، هەر لەو وڵاتانەدا سیستمی نوێنەرایەتیکردن بەهۆی لێکترازاندنی بازنەکانی هەڵبژاردنەوە شێوێندرا. بۆنمونە هەردوو باڵی ریفۆرمخوازی (ویگس و تۆریس)[3]،هەروەك موحافیزکارو لیبراڵەکانی ئەمریکای لاتین، سەرەتا دوو باڵی دەزگایەك بوون کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندییە ناکۆکەکانی نەدەکرد، بەڵکو زیاتر هەوڵی دەستنیشانکردنی سنوری مشتومڕی سیاسیی دەدا لە نێوەندەکانی نوخبەی سەرکردایەتیدا.

وڵاتە دیموکراتەکانی تریش، لای خۆیانەوە، کاریان بۆ سنووردارکردنی گەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسیی کردووە. سەردەمانێکی درێژ بوو هەڵبژاردنی نوخبەکان لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە بازنەیەکی قۆرخکراودا مابۆوە. ئەو هەڵبژاردنانە بەزۆری لەلایەن دەرچووانی پەیمانگاکانی ئیڤی لیگی-وە بەڕێوەدەبرا، هەروەها بنەماڵەو نەریتی بۆماوەیی رۆڵێکی گرنگیان لەوبارەیەوە هەبوو. بەڵام لە فەرەنسا ئیلیتی کۆماریخوازان ئەو ئەرکەیان بە گراند ئیکۆڵ (قوتابخانە باڵاکان) سپارد. ئەو ئیلیتە، (نوخبە)یە، تا ئاستێکی زۆر توانی پرۆسەی نوێکردنەوەی ئیلیتە سیاسیەکان پێڕەوبکا، بەهەمان شێوە پرۆسەی جیاکردنەوە لەنێوان ئەو ئیلیتە لەلایەك و لەنێوان ئەو توێژانەی کە بەرگرییان لە نەریتە ئاینیی و نەتەوەیی و ئابوریەکان دەکرد ئەنجامدرا. ئەم شێوازە قۆرخکراوانەی کاری سیاسی وەك خۆیان مانەوە، لە دەرەوەی مەیدانی دەنگدان کە تایبەت کرابوو بەوانەی دەبوو باج بدەن، بەڵام لەبەردەم فشاری میللیدا بەرگەیان نەگرت. بەهەمان شێوە لە ئەمریکا کۆیلەکان لەدەرەوەی بەشداری سیاسی مانەوە، بەڵام لەوێش قۆرخکردنەکە بەرگەی نەگرت و زۆر توند هەرەسی پێهێنرا.

پاش دەستورناسە ئینگلیزەکان بەماوەیەکی درێژ، جۆزیف شمپیوتر بیرۆکەیەکی گەڵاڵەکرد سەبارەت بەوەی یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی

دیموکراسی لە بەریتانیا دەگەڕێتەوە بۆ بوونی چەند نێوەندێکی سیاسی کە لە کۆماری ڤایمار بوونیان نەبوو. ئەم قسەیەی شمپیوتەر پەیوەندیی بەتیۆرەیەکی گشتییەوە هەیە دەربارەی دیموکراسی زۆر دژی ئەو بیرۆکە کلاسیکییەیە کە پێیوایە بڕیارەکان لەلایەن زۆرینەی هاوڵاتیانەوە، بەشێوەیەکە تەواو ئازادانە، دەنگی لەسەر دەدرێ. شمپیوتەر بڕوای بەوە نیە کە تاکەکان دەرفەتی دۆزینەوەی ڕێگەچارەی ئەقڵییان هەبێ‌و ئاگادارین سەبارەت بە کێشەکان و بەشداربن لە بایەخدان بە بەرژەوەندیی گشتی، بەڵکو ئەو هەمان ئەو پێناسەیەی دیموکراسی یاددێنێتەوە کە پێی‌وابوو بریتیە لە هەڵبژاردنی ئازادانە بۆ تیمێك لە تیمەکانی فەرمانڕەوایی. لێرەوە دیموکراسی، لای شمپیوتەر، "بریتیە لەو سیستمە سیاسییەی کە تاکەکان دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە ئاگاداری بڕیارە سیاسیەکان بن، (بەڵام) پاش ململانێ‌و کێبڕکێی لایەنە سیاسیەکان سەبارەت بەوەی کە ئایا گەل دەنگ بۆ چی دەدا"(سەرمایەداری، سوشیالیزم و دیموکراسی، ل403)، ئەمەش وێنەیەك دەبەخشێ بە حیزبە سیاسیەکان کە لە سیفەتی نوێنەرایەتیکردن دووریان دەخاتەوەو: "حزب گروپێکە ئەندامەکانی پابەندن بەوەی پێکەوە کار بکەن لە ململانێ‌و کێبڕکێدا بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات"(هـ.س، ل422). ئەم پێناسەیە زیاتر لە سیستمی ئۆلیگارشییەوە نزیکەو سەروەریی میللی لە لاوازترین ڕۆڵدا کورتدەکاتەوە. بەڵام لایەنە پۆزەتیڤەکەی لەوەدایە روونیدەکاتەوە کە هەندێ جار ترس لە گەل (پرسکردنی راستەخۆ بە گەل) دەگاتە ئاستێکی سەیر، لە کاتێکدا خودی ئەو گەلە بنەمای بیرۆکەی دیموکراسییە! باشتر وایە پاش ئەم

تێگەیشتنە پەڕگیرەی کە هەموو ناوەرۆکێکی فیعلی لە دیموکراسیدا بەتاڵدەکاتەوە، مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ بیرکردنەوەی لیبراڵیەکان کە لەزیادەڕۆییدا بەتەواوی پێچەوانەی ئەم دەستپێوەگرتنەی شمپیوتەرن.

لەمبارەیەوە هیچ بیریارێکی سیاسی نابینینەوە کە وەك ئەلیکسیس دی تۆکڤێل قووڵ بێ، کە لە یەك کاتدا باس لە بایەخ و مەترسی ئەو زەینیەتە دەکا کە باشترە ناوبنرێ زەینیەتی کۆماریی، چونکە ئیزدواجیەتێك لە هەڵوێستی ئەو نوسەرەدا هەیە دەربارەی دیموکراسی. بیرۆکەی مەرکەزیی فیکری تۆکڤێل دەربارەی ئەمریکا لەوەدا کورتدەبێتەوە کە کۆمەڵگە مۆدێرنەکان بەرەو لەناوبردنی ئیمتیازە تایبەتەکان و پلەبەندییەکان (*Stand* بەئەڵمانی) هەنگاودەنێن و لە مرۆڤ لە (هۆمۆ ئیرارکیکیۆس)ەوە دەبێتە (هۆمۆ ئاکوالیس)[4]، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە مرۆڤەکان لە واقعدا یەکسانن، بەڵکو لە مافەکاندا یەکسانن، ئەو یەکسانییەش دەبێتە هۆی لێکنزیکبوونەی بارودۆخی مرۆڤەکان، یان وەك "لۆرد برێس" لە لێکۆڵینەوەیەکدا دەربارەی سیستمی سیاسی لە ئەمریکا دەڵێ: یەکسانی هەموان لە مافەکاندا دەبێتەهۆی کزبوونی لووتبەرزی‌و فەخفەخەی خاوەن سەروەت و سامانەکان و کەمبوونەوەی زیادەمەسرەفی‌و بەرخۆری ناشرین کە "تۆرستین ڤبلن" باسی لێدەکا. بەڵام ئەم مەسەلەیە لای تۆکڤێل وەرچەرخانێکی سیاسی نیە بەڵکو گەشەیەکی کۆمەڵایەتییە کە هەندێ‌جار ئاشتیخوازانەو هەندێ‌جاریش هەڵگری توندوتیژی بووە. تۆکڤێل بێ‌چەندوچوون بڕوای وابوو شۆڕشی فەرەنسی کاریگەریی زۆری لەپاش خۆی

جێهێشــتووه. هەرچــەندە رەخنــەی لــە کــارە نالەبارەکانی دەسەڵاتی ئەو شۆڕشە گرتووە، بەڵام پێیوابوو تۆقاندن لە سەردەمی ناپلیۆن و ئەو بڕیارە پارلەمانیانــەی لــە ســاڵی 1789دا دەرچــوون، پێداویســتیی مێــژوویی بــوون بــۆ دامەزرانــدنی کۆمەڵگــەی یەکسـانیو لـەناوبردنی ئـەو لەمپــەرە پڕوپوچانەی ، کە پێشتر بەپێی نەریت و زەمانەتە دەســــتوریو کولتوریــــەکان نایەکســــانییان دروستکردبوو، وەك دەنگدان بەگوێرەی پێگــە لــە ئەنجومەنە گشتییەکاندا.

ئەم باوەڕە سەبارەت بە پێداویستیی مێژوویی، دەرفەتی بەخشی بە تۆکڤێل تا بەوردیو بەفیعلی بیر لـە کێشـە سیاسـیەکان بکاتـەوە، لـەو کێشـانە: پـاش لـەناوبردنی پلەبەنـدیی نـەریتپارێز لـەنێوان توێژەکاندا، چۆن رێگەبگیردرێ لە ستەمی زۆرینە تا رەوتـەیکی کۆمەڵایـەتی دژ بەئـەقڵ دانەمـەزرێنێ؟ چونکە تۆکڤێل–یش هەروەك فیدراڵیەکان پێیوایە مەترسـیی سـەرەکی کـە هەڕەشـە لـە سیسـتمە دیموکراتەکان دەکا بریتیە لە سەرکەوتنی جەماوەر، یـان سـەردەمی سـەرکەوتنی بەکۆمـەڵ هـەروەك سـێرج مۆسکۆڤیچـی ناوینـا. تۆکڤێـل تـەنها بانگـەواز بـۆ مافـە سروشـتیەکان ناکـا، چـونکە شۆڕشـی فەرەنسـی بـە نمونـە وەردەگـرێو پێیوایـە تــەواوی جیهــانی مــۆدێرن دەکەوێتــە کــۆروم (نصـاب)ی مافـە دانراوەکـان (نـەك سروشـتیەکان)، پرنسیپەکانیش ناتوانن هەڵمەتی بەکۆمەڵی خەڵك یـان (میر)و لەشکرەکان رابگرن. تۆکڤێل پێیباشە لەبری ئەوەی باس لە مافی سروشتی بکرێ، باشترە بـاس لـە بەرژەوەنـدیی تاکـەکان بکـرێ، بـەڵام ئەمـە مانـای ئـەوە نیـە کـە لـە بـەرەی سـودگەرەکاندایە. چــونکە ئــەو دوژمنێکــی گــەورەی تاکگەرییــەو لیبراڵیزمــی سیاســی لای وی پەیوەنــدیی بــە لیبراڵیزمی ئابورییەوە نیە.

چـەمکی ئـازادی لای تۆکڤێـل زیـاتر لـە هـی بیریـارە کۆنەکانـەوە نزیکـە تـا تازەگـەرەکان. ئـەو پێـدادەگرێ لەسـەر ئـەوەی کـە پێویسـتە رەوتـی کۆمەڵایەتی لەسەر دادپەروەریی دامەزرا بێ. بەڵام رێگــرتن لــەوەی دادپــەروەریی لــە رێزگرتنــی بەرژەوەندیــــەکان و مافــــە شەخســــیەکاندا بەرجەستەببێ وەك ئەو دۆخە وایە کە مۆنتسکیو ناوینــابوو چــاکەخوازیو کردبوویــە بزوێنــەری سیســتمە کۆماریــەکان، یــان بزوێنــەری هەســتی نیشــتمانی کــە زادەی رێزگرتنــە لــە هاوبەنــدیی کۆمەڵایــەتیو ئــەو یاســایانەی ســنورێك بــۆ ئارەزوەکـانی مـرۆۆ دادەنـێن، چونکە تۆکڤێل–یش هـەروەك هـۆبس، رۆسـۆو پاشـان دۆرکـایم، پێیوایـە ئارەزوەکـانی مـرۆۆ بێسـنوورن و رەنگـە دەرەنجـامی ترسـناکیان لێبکەوێتــەوە. دیموکراســی لای ئــەو تێکەڵێکــە لــە رۆحــی ئـاینیو رۆحـی نیشـتمانی. چونکە ئەو ئاینـەی لە ئینگلتەرای نوێ کاریگـەری پەیـداکرد، ئـاینێکی مـەدەنیو هـەڵگری رەوتێکـی کۆمەڵایـەتی بـوو، نـەك ئـاینێکی باڵاخوازو دوور لـە کۆمەڵگا. تۆکڤێل بـەر لـەوەی بڕوای بە مرۆۆ هـەبێ بڕوای بە هـاوڵاتی هەیـە. مەسیحیەتی کۆمەڵایـەتی لای تۆکڤێـل لـەژێر کاریگـەری پرسـی یـەکێتی کۆمەڵایەتییدایــە کــە لــە کۆتاییــەکانی ســەدەی نۆزدەیەمــدا وەك جۆرێــك هاوکــاریی هاوبــەش سەریهەڵدا، دۆرکایم لە سەرەتای ژیانیدا بایەخێکی زۆر دەدا بــەو جــۆرە هاوکارییــە بەمەبەســتی تێپەڕانــدنی قەیرانــەکانی کۆمەڵگــەی مــۆدێرن. تۆکڤێل دژی ئـەو دژبوونـە سـاکارەیە کـە لـەنێوان "ماجورپارس"و "سانیۆرپارس"[5]دا، واتە لەنێوان

زۆرینەو کەمینەدا، هەیە. بەڵکو هەروەك لەکتێبێکی (ئەنتوان رۆدێیە: دەربارەی قسەکانی توکڤێل، پاریس، 1925) هاتووە، تۆکڤێل پێیوایە ئەو لەنێوان دوو ئاراستەی پێچەوانەدایە: "من بەحوکمی بیردنەوەم لەگەڵ دامودەزگای دیموکراتیدام، بەڵام بەحوکمی غەریزە من کەسێکی ئۆرۆستۆکراتم، واتە من دژی عەوامی خەڵکم و لێیاندەترسم. من شەیدای ئازادیو یەکسانیو رێزگرتنی مافەکانم، بەڵام من دیموکراسیم خۆش ناوێ. ئەمە حەقیقەتی منە لەناخەوە". بەڵام مەسەلەکە تەنها پەیوەندیی بە ریشەی کۆمەڵایەتی ئەوەوە نیە کە دژی یەکسانیی دیموکراتییە. بەڵکو ترسی ئەو لەوەدایە یەکسانی ببێتەهۆی ستەمکاری کە شۆڕش دەرگاکانی بۆ والادەکا. کەواتە دەبێ سنورێك لەئارادا بێ بۆ سەلماندنی دادپەروەری بەگوێرەی بەرژەوەندیی هاوڵاتیان. لێرەدا کەلێنێك دەکەوێتە نێوان تۆکڤێل و بنیانمین کۆنستان، یان نێوان ئەو و ئەو کەسانەی بەرگری لە بەرژەوەندیی تاکەکەس دەکەن.

تۆکڤێل کەسێکی دیموکراتی دژ بە شۆڕشە، بەڵام ئایا راستتر نیە پێناسەی بکەین بەوەی کەسێکە لە لیبراڵیزمەوە نزیکترە تا دیموکراسی، چونکە دیموکراسی بەڕای ئەو دۆخێکی کۆمەڵایەتی دیاریدەکا زیاتر لەوەی سیستمێکی سیاسی دەستنیشانبکا. لە راستیدا ئەو دژی مۆرکی رەهای سەروەریی میللییە. رەنگە گەر قسەیەکیشی هەبوایە دەربارەی پێناسەکەی "لنکۆلن" بۆ دیموکراسی، ئەوا ئەو پێناسەیەشی رەتدەکردەوە. لێرەوە کۆتایی بە بەشی یەکەمی کتێبەکەی دێنێ بەوەی دەڵێ: "تەنانەت زۆرینەش خاوەن دەسەڵاتی تەواو نیە. چونکە لە جیهانی مەعنەویدا، مرۆڤایەتیو دادپەروەریو ئەقڵ لەسەروو زۆرینەوەن. هەروەك چۆن لەجیهانی سیاسیدا مافە بەدەستهاتووەکان (مکتسب) لەسەرو ئەوەوەن". ئەم هەڵوێستە زیاتر لە هەڵوێستی بەریتانیەکانەوە نزیکە تا هەڵوێستی ئەمریکیەکان، بەڵام لەهەمان کاتدا تۆکڤێل مەسەلەی فیدراڵیزم و مەسەلەی دەسەڵاتە لۆکاڵیەکان، کە مەسەلەگەلێکی تەواو ئەمریکین، دەخاتە پاڵ ئەو هەڵوێستە. سەرەکیترین دەسەڵاتی لۆکاڵی بریتیە لە شارەوانی، شارەوانی دەزگایەکە تاك دەپارێزێ لە دەوڵەت. بەڵام مەرج نیە ئەو دەزگایە گوزارشتێکی تەواو لە دیموکراسیەتی نوێنەرایەتیکردن بکا بەو شێوەیەی جۆن ستیوارت میل بەرگری لێکرد، بەڵکو زیاتر لە کۆسپێك دەچێ لەبەردەم هێزی گشتگیری دەوڵەتدا، وەك مۆنتسکیۆ لێی تێگەیشتبوو کاتێ باسی لە جیاکاریی نێوان دەسەڵاتەکان کرد. هەرچەندە تۆکڤێل بایەخێکی زۆر دەدا بە رۆحی نیشتمانی، بەڵام لەهەمان کاتدا نیگەرانیی خۆی ناشارێتەوە، بەتایبەتی لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا (دەربارەی دیموکراسی لە ئەمریکا، 1840)، سەبارەت بەو فشارانەی رای گشتی دەیسەپێنێ بەسەر فیکرو تێگەیشتن لە رووداوەکان و ملکەچبوون لەئاستیاندا.

بەڵام ئەم نیگەرانییە وای لە تۆکڤێل نەکرد لەسەر پرۆژە مەرکەزیەکەی بەردەوام نەبێ: ئاشتبوونەوەی ئاین لەگەڵ پرنسیپەکانی ساڵی 89. ئەو ئاشتبوونەوەی کە تۆکڤێل بەشێوەیەکی جیاواز لە "ئۆگەست کۆنت" وێنای دەکا، هەرچەندە ئەویش وەك کۆنت لەژێر کاریگەری ئەو دیدەدا بوو کە رەنگە هەڵوەشاندنەوەی پلەبەندیی ببێتەهۆی هەڵوەشانەوەو لەناوچوونی کۆمەڵگا.

ئەڵبەتــە تۆکڤێــل کەســێکی "نوێ"یــە، چــونکە پــاش رووداوەکــان لــەو شۆڕشــانە وردبۆتــەوە کــە مۆدێرنەی سیاسییان دامەزراندووە، بەڵام لەهەمان کاتــدا کەســێکی کۆنــە، وەك یــەکێك لــە نوســەرانی ســەدەی هــەژدەو خوێنــەرێکی مۆنتســکیۆو رۆســۆ دەمێنێتەوە، چونکە پێش هــەموو شتێ هەوڵیداوە هاوبەندییــەکی کۆمەڵایــەتی نــوێ بدۆزێتــەوە کــە رێبگــری لــەو شــتەی دۆرکــایم ناوینــا پشــێویو بێســــەروبەری، واتــــە لەبەریــــەك هەڵوەشــانەوەی سیســـتمی زەبتورەبـــت و چـــاودێری کۆمەڵایـــەتی. چونکە ناکۆکی لەنێوان کۆن و نوێیەکاندا جیاوازی نێـوان دوو قۆنـاغ دەردەخـا لـە قۆناغـەکانی فیکـرو کــاری سیاســی. نمونەکــەی دۆرکــایم-یــش ئــەم حاڵەتــە بــەوردی روونەکاتــەوە. ئایــا مەســەلەی هاوبەنــدیی کۆمەڵایــەتی مەســەلەیەکی ســەرەکیی ئەجنـدای کۆتاییــەکانی ســەدەی نۆزدەیــەم نــەبوو هــــەروەك چــــۆن ئێســــتا بەشــــێکە لــــە ئەجنــــدای کۆتاییــەکانی ســەدەی بیســتەم؟ ئایــا بردنــەوەی دیموکراتە چیلییەکان لەو ریفراندۆمەدا کە جەنەراڵ بینوشــێ رێکیخســت مانــای ئــەوە نیــە کــە ئــەوان دەنگیان بۆ ئاشتبوونەوە داوە نەك تۆڵەسەندنەوە؟ واتــە ئــەوانیش هــەروەك ئیســپانیەکانی ســەردەمی گرێبەستی "مانکلوا" رێکەوتن، بەجۆرێك زۆرێك لـە وڵاتــان ئومێــددەخوازن ئــەوانیش وەك ئیســپانیا بوونایــە؟ ئایــا ئێمــە پــاش ئیفلاســی درامــاتیکیی ئــەو ئایدیۆلۆجیانــەی لەســەر بنــەمای ململانێــی چــینایەتی یــان خــەباتی رزگــاریی نیشــتمانی دامــەزرابوون، ســەرلەنوێ لــە فیکــری سیاســیدا ئــەو بیرۆکانــە بەدیناکەینــەوە کــە بــاس لــە دادپــەروەری و یــەکێتی کۆمەڵایــەتیو تەنانــەت برایەتیش دەکەن؟

## لیبراڵەکان و سودگەرەکان[6]:

لیبراڵــەکان پرۆســەیەکی وەرچــەرخانیان لــە (دیدی بیریارە) کۆنەکانەوە بۆ نوێیەکان ئەنجامدا، بەوەی هەوڵیانـدا رۆحـی نیشـتمانپەروەریی تێکەڵ بەرژەوەنـدیی تاکەکەســی بکــەن. ئــەوان بەتــەنها چەمکی ئازادی-یان لای کۆنەکان پەسەند نەبوو کە شوناســی مــرۆڤ و هاوڵاتییــان تێکەڵــدەکرد، یــان ئــازادیو بەشــداریکردنیان لــەکاروباری گشــتیو بەرژەوەنــدیی گشــتیدا پێکەوەگرێــدەدا. بــەڵکو پێیانوابوو نابێ متمانەی بێسنور ببەخشرێ بەهیچ لایــەکیان: نــە بەرژەوەنــدیی تاکەکەســیو نــە ســەروەریی میللیش. بەڵام بەگشتی ئەوان هەر لە کۆنەکانــەوە نــزیکترن تــا تازەکــان، هەرچــی سوودگەرەکانە کە هەوڵدەدەن ئاوێتەبوون بسازێنن لــەنێوان بەرژەوەنــدیی تایبــەت و بەرژەوەنــدیی گشـتیدا، زیـاتر لـە تازەکانـەوە نـزیکترن، چـونکە بایەخێکی زۆر سەنتراڵ دەبەخشن بەگەڕان بەشوێن کامەرانیی تاکەکەسدا.

ئــەوەی مایــەی ســەرنجە لای تۆکڤێــل ئــەو بایەخەیە کە بە توێژە سیاسیەکانی دەبەخشێ، وەك ئەوەی گەشەی کۆمەڵگەی مەدەنی بەرەو یەکسانی تــەنها کێشــە کۆنــەکانی رەتکردبێتــەوە بێئــەوەی رێگەچارەی نوێی پێشکەشکردبێ. ئەو پاش رۆسۆ گوزارشـت لـە نیگـەرانیی خـۆی دەکا سـەبارەت بـە کەمتەرخــەمیی هاوڵاتیــان لەئاســت کاروبــاری نیشـتمانیدا. بـەڵام خوێنـەری تۆکڤێـل هەسـتدەکا نابــێ زۆر پــێ لەســەر ئــەم خاڵــە دابگــرێ، چــونکە تۆکڤێـل بەپێچـەوانەی رۆسـۆوە، بـەردەوام مـافی سروشـتی دەکاتـە بەڵگـە: "ئـەو مرۆڤـەی کـە دەبـوو سروشت بکاتە سەرچاوەی رەفتارە باشەکانی، هەر

لەدایکبوونــەوە خــاوەن مــافێکی سروشــتییە کــە بەسەرچوونی زەمەن لەناویناباء ئەو مافەش بریتیە لــەوەی مــرۆڤ ســەربەخۆیانە بــژیو تــەنها لــەکارە هاوبەشـەکاندا پەیوەنـدیی بەکەسـانی تـرەوە هـەبێ، هەروەها چارەنوسـی خـۆی دیاریبکا بـەو شـێوەیەی خـــۆی دەیـــەوێ". بـــەلاّم ئـــەم قســـەیە نابـــێ بەئاراسـتەیەکی تاکگەرانـە لێکبدرێتـەوە، چـونکە ئـــازادی تاکەکـــەس کۆمەڵگـــەکان ناچـــاردەکا پرنسـیپێکی نـوێی یـەکێتی کۆمەڵایـەتی لـەنێوان ئـازادی تاکەکـەس و بەرژەوەنـدیی دەسـتەجەمعی بسـازێنن. ئەمـە ئـەو بیرۆکەیەیـە کـە سـودگەرەکان باسیدەکەن، هەرچەندە بەرگری ئەوان لە "جێرمی بنتـــام" ئامرازێکـــە بـــۆ پتـــەوکردنی فۆرمـــەکانی رێکخستنی کۆمەڵایەتیو سیاسی کە کامـەرانیی بـۆ زۆرترین ژمارەی خەڵك فەراهەمبێنێ. ئەم هـۆدۆزی، (تعلیل)ـە، هاوشێوەی هۆدۆزیی فرۆیدیەکانە کە لـە رۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا پاسـاو بـۆ بـازاڕ دێننـەوە بـەو پێیـەی سـەرەتایەکە لـە سـەرەتاکانی دابینکردنـی شمـەك، بێئـەوەی هـاوڕای ئەنارشیسـتەکان بـن کـە ستایشی بێسنوری بەرژەوەندیی تاکەکەس دەکەن.

ســوودگەرەکانیش وەك لیبراڵیــەکان نــاکۆکی لـــەنێوان بەرژەوەنـــدیی تاکەکـــەس و یـــەکێتی کۆمەڵایەتیـدا نـابینن. بـەڵکو پێیانوایـە یەکـەمیان (بەرژەوەنـدیی تاکەکـەس) زامـنترین رێگەیـە بـۆ هێنانــەدی دووەم (یــەکێتی کۆمەڵایــەتی). ئــەوان دەستێوەردانی "رێچکەکانی تێگەیشتن لە مرۆڤ" بۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری کۆمەڵایـەتی رەتدەکانـەوە، چـــونکە پێیانوایـــە ئـــەو رێچـــکانە دەمـــارگیریو جیاکـاری دروسـتدەکەن، لەهـەمان کاتـدا پێیانوایـە دەبێ رایەڵـەکانی هاوبەنـدیی کۆمەڵایـەتی پتـەوتر بکـــەن لـــەو کۆمەڵگانـــەدا کـــە رەنگـــە رۆحیـــەتی

خۆپەرسـتی بەسـەریاندا زاڵبـێ، لـەکاتێکی واشـدا دەبــێ دۆخەکــە چارەســەربکرێ بــەوەی رێـــز لــە کامەرانیی خەڵکانی تر بگیردرێو کار بۆ هێنانەدیی بکـــرێ. بـــەلاّم ســـەرباری نزیکایـــەتییان لـــە بیرکردنەوەدا، خاڵەکانی جیاوازی لـەنێوان ئـەو دوو قوتابخانەیەدا زۆرترە لە خاڵەکانی پێکەوەگونجان. ســـودگەرەکان، لەســـەرو هەمووشـــیانەوەو جـــۆن ستیوارت میل، تاکەکەس و ئازادیو داوکاریـەکانی تاکەکەس دەکەنە کرۆکی شیکردنەوەکەیان. ئەوان، بـــەم پێیـــە، لـــەڕووی ئـــەوەی کامیـــان باشـــترە، بەراوردناکـەن لـەنێوان هێـزی کۆمەڵایـەتی چـالاك و سیسـتمی سیاسـی، یـان لـەنێوان دۆخـی ئـابوریو دۆخی دامودەزگاکان. بەلاّم ئەوانـەی بە لیبراڵیەکان ناسراون، بەپێچەوانەوە، ئەو بەراوردو جیاکارییە تا ئەوپــەڕی پەســەنددەکەن. لەکاتێکـدا سـودگەرەکان باس لە خۆشگوزەرانیو هێمنی دەکەن، لیبراڵـەکان هـەموو کۆششـەکان تەرخاندەکەن بۆ خزمـەتکردنی ئـەقڵ. ئـەوان کـار بـۆ سـەربەخۆیی کایـەی گشـتی دەکەن لەپێناو پاراستنیدا لەئاست هـەواوئارەزوو و بەرژەوەندییە تایبەتەکان، پاراستنی ئازادیـەکانیش لای ئـەوان لەڕێگـەی پتـەوکردنی دامودەزگاکانـەوە دابیندەبێ، هەروەها پاراستنی ئازادیی کەمینـەکان لـــە ســـتەم و دیکتاتۆریـــەتی زۆرینـــە. هەربۆیـــە لیبراڵــەکان بانگــەوازیان بــۆ کۆمــاری ئۆلیگارشــی دەکرد، بەلاّم هێندەی نەبرد لـە سـەردەمی کۆمـاری فەرەنسیی سێیەمدا بووە نوخبەویەتی کۆماری.

لیبراڵـــەکان زۆر لـــە هیـــزە کۆمەڵایەتییـــە چـالاکەکان دەترسـن، ئـەو ترسـەیان وایـان لێـدەکا بەشـوێن پرنسـیپێکدا بگـەڕێن بـۆ سـەقامگیرکردنی سیسـتەم کـە جێگـەی ئـاین بگرێتـەوە. هەرچـەندە ئەوان دژی ئاین و پیاوانی ئاینین، بەلاّم لە زەینیاندا

خولیایەکی شاراوە هەیە بۆ گەڕان بەدوای ڕەوتێکی سیستماتیك و ئەقڵییدا کە وەك یاساگەلێك تاکەکان هانبدا بەپێی حوکمی ئەقڵ ڕەفتاربکەن و بەرژەوەندیی خۆشیان بکەنە پاشکۆی ئەو دەزگایانەی کە ڕەوتی گشتی ڕێکدەخەن و دەیانپارێزن. هەرچی سوودگەرەکانە، بەپێچەوانەوە، زیاتر مەیلیان بەلای نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندیەکاندا هەیە. دەکرێ فراوانیی نفوزی ئەوان لە بەریتانیای مەزن، بەبەراورد لەگەڵ فەرەنسادا کە توێژی سیاسی زیاترە تا توێژی کۆمەڵایەتی، تەفسیربکەین بەوەی کە کاری سەندیکایی ودیموکراسیەتی پیشەسازی لە سەردەمێکی کۆنترەوە لە ئینگلتەراوە گەشەیکردووە. فیکری لیبراڵی باڵی کێشاوە بەسەر شێوازی بیرکردنەوەی زۆرێك (لە بیریاران)، لە هۆبسەوە تا ستیوارت میل، هەروەها لای بنیامین کۆنستان و تۆکڤێل-یش، بەلام فیکری سودگەری ئەو فیکرە بوو کە خۆی لە سەدەی نۆزدەیەمی سەرمایەداراندا سەپاند، هەروەها لەگەڵ ۆڵفیر ستێت (دەوڵەتی خۆشگوزەرانی) لەسەدەی بیستەمدا. بەلام کەلێنی نێوان ئەو دوو ڕەوتە فیکرییە هەمیشە کەلێنێکی روون و ئاشکرا نیە، هەرئەم خاڵەشە وا لە "جۆن ستیوارت میل" دەکا لەیەك کاتدا بیریارێکی پڕفیکرو کورتفیکریش بێ، چونکە ئینتمای بۆ هەردوو ڕەوتەکە هەیە. بەلام ئەو کەلێنە فراوانتر بوو (دوو ڕەوتەکە زیاتر لەیەکدی دووركەوتنەوە)، چونکە لیبراڵەکان بڕوایان بە سەربەخۆیی کایەی سیاسی و مەرکەزیەتی ئەو کایەیە هەیە، هەرچی سودگەرەکانە بەرژەوەندیو جێبەجێکردنی داواکارییە تایبەتەکان دەکەنە پاشکۆی ئەو کایەیە. واتە لیبراڵەکان لەگەڵ سیستامدا دەوەستن، بەلام سودگەرەکان لەگەڵ هێزە چالاکەکاندان. هەربۆیە پاش ئەوەی فیکری لیبراڵی وزەو توانای خۆی لەسەر داروپەردووی سیستمی سۆشیالیستی، چ جای کۆمۆنیزم، بەدەستهێنایەوە، کەوتە بیرکردنەوە دەربارەی ڕۆڵی بزاوتە کۆمەڵایەتیو سۆشیال-دیموکراتەکان وەك بەشێك لە کۆروم (نصاب)ی سیاسی. ئەمە بووە مانایەك لە ماناکانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی لای جۆن راوڵز (کاتێ پرسیی): چۆن تێکەڵاوی بکرێ لەنێوان ئازادی تاکەکەس و پرۆسەی یەکخستنی کۆمەڵایەتی کە هەمیشە لەژێر هەڕەشەی نایەکسانیدایە؟ جۆن راوڵز لە بەشی دووەمی نوسنەکەیدا دەربارەی (پرنسیپی دووەم) وەڵامی ئەم پرسیارەی خۆی دەداتەوەو پێیوایە: ئازادی، کە ئەگەری نایەکسانی دەخاتەوە، دەبێ ببێتە پاشکۆی پرۆسەی باشکردنی گوزەرانی هەژاران. ئەمەش پاساوی ئەوە دەدا کە چۆن پێشکەوتنی دەمودەزگای پیشەوەرەکان بووەهۆی کەڵەکەبوونی سەرمایە لەدەستی چینێکی سەرکردەدا، بەلام لەهەمان کاتدا بووەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەم و باشبوونی چارەنوسی کرێگرتەکان کە لەپلەی خوارەوەی پلەبەندیەکەدا بوون. سیاسەتی نرخی بالای فۆردیی، هێمایەکە بۆ ئەم دۆخە. بەمجۆرە ئێمە لەو قسەیەی مۆنتسکیۆ دوورناکەوینەوە کە دەیکاتە دەسپێکی کتێبی (ڕۆحی یاساکان): "مەبەستم لە وشەی چاکەخوازی (فەزیلەت) لە کۆماردا خۆشەویستی نیشتمانە، واتە خۆشەویستی یەکسانی (...). هەربۆیە ئەوینی نیشتمان و یەکسانیم ناوناوە چاکەخوازیی سیاسی".

ئەم بەیەکگەیشتنە لەنێوان بەرژەوەندیی تاك و

بەژەوەندی دەستەجەمعیدا، ئەم تێکەڵاوییە لەنێوان ئازادیو یەکسانیدا ئینتمای بۆ زەینەتی مۆدێرن هەیەو ناکۆکە لەگەڵ بەرگریکردن لە نەریتە کۆنەکانو ئاڵۆزکردنی هەستەوەریی، ئۆرگانی، بۆ مێژو بەو جۆرەی ئەدمۆند بۆرك دژی ئیرادەگەریی شۆڕشی فەرەنسی باسیکرد. بەڵام زۆر سەختە سیفەتی دیموکراتی بخەینەپاڵ دۆخەکە، چونکە هەموو شتێك حەواڵەی ئەو رۆحە نیشتمانییە دەکرێ کە دەستەبژێرە سەرکردایەتیەکان نوێنەرایەتیدەکەن لەپێناو سنورداركردنی ئەو دەرەنجامە نەخوازراوانەی کە لە ئازادی دەکەونەوە. ئەمە فەلسەفەی ئەوانەیە کە بڕوایان بە خۆشەویستی مرۆڤ هەیە، بگرە فەلسەفەی ئەوانەیە کە خەریکی پرۆژەسازین، بەڵام ئێمە ناتوانین هینری فۆرد بە کەسێکی دیموکرات لەقەڵەمبدەین، چونکە لەکاتی رێپێوانی برسێتیدا کە کرێکارانی دیترۆیت لە قەیرانە گەورەکەدا رێکیانخست، فیکرو بۆچوونەکانی زۆر دوور بوون لە دیموکراسییەوە. ئەڵبەتە بەرزکردنەوەی کرێ بەرێژەیەکی زۆر، لە وڵاتێکدا کە سەرباری کۆچی بەلێشاو بۆی، پێویستی بە کرێکاران هەبوو بەمەبەستی بووژاندنەوەی..، سەرکەوتنی رەوتی پیشەسازیی دەرخست نەك دیموکراسی. لێرەدا رەخنە ئاراستەی فیکری لیبراڵی لە سەدەی نۆزدەیەمدا دەکرێ. ئایا مرۆڤ چۆن دەتوانێ قسەبکا دەربارەی دەسەڵاتی گەل، یان دەربارەی ئازادی لەهەڵبژاردنی فەرمانڕەوایاندا بەمەبەستی خۆلادان لە ستەمی زۆرینەو پێشێلکاریەکانی سەروەری میللی، کە رەنگە ببێتەهۆی هاتنەسەرکاری سیستمێکی دەسەڵاتگەر؟ ئایا دەکرێ پاراستنی ئازادیەکان بەتەواوی بسپێرینە ئەخلاقی ویژدانی یان رۆحی نیشتمانپەروەری کە لای چینە رۆشنگەرەکان هەیە؟ ئەڵبەتە تۆکڤیل لەوە تێدەگەیشت کە بۆچی فیدراڵییە ئەمریکیەکان شکستیان خوارد لەکاتێکدا ئەو کەسێکی نزیکیان بوو. ئایا لەدوای شۆڕشی 1848ەوە دەکرا شتێك لە ئەقلانیەتی لیبراڵیی "گیزۆ" بمێنێتەوە؟ ئایا لەخودی بەریتانیای مەزن حزبی کار دانەمەزرا بۆ بەرەنگاریی ئەو دیموکراسیەتە سنوردارەی کە لەلایەن (ویگزو تۆرێن) خرایەڕوو؟ ئایا ئەوە هێزی داخوازیو یاخیبوونە کرێکاریەکان نەبوو کە دەرگای والاکرد لەبەردەم دیموکراسیی پیشەسازیی بزوتنەوەی سۆشیال–دیموکراتدا کە لە کیشوەری ئەوروپا سەریهەڵدا؟ هێزی هزرە لیبراڵو سوودگەرەکان لەوەدایە کە ئەو هزرانە پرسی هاوڵاتیبوون، وەك پرسێك کە بیرۆکەی کۆماریخوازی بەرگریلێکرد، دەخەنەپاڵ پرسی سنورداركردنی دەسەڵات. بەڵام لیبراڵو کۆماریخوازەکان بێتوانا بوون لەوەی تیۆرەیەکی کامڵ دەربارەی دیموکراسی گەڵاڵەبکەن، چونکە ئەوان حسابیان نەکردبوو بۆ نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندیی زۆرینە، یان ئەوانیش هەروەك سوودگەرەکان بەشێوەیەکە ئابوریی بەرتەسك ئەو حسابەیان کردبوو. چونکە زۆر ئاسانە مرۆڤ پەنا بۆ دیدوبۆچوونەکانی ئەوان بەرێ بەمەبەستی پاساوهێنانەوە بۆ سەرکەوتنی سیستمە دەسەڵاتگەرەکان لەو چرکەیەوە کە ئەو سیستمانە دەستیاندایە باشکردنی بارودۆخی ژیانی خەڵك. ئایا ماوەیەکی درێژ، بەپاساوێکی لەمجۆرە، باس لە مۆرکی دیموکراتیی رژێمی فیدڵ کاسترۆ نەدەکرا، بەپاساوی ئەوەی کە ئاستی خوێندن و خزمەتگوزاریی تەندروستی لە کوبا بەرزکردۆتەوە؟ لە واقعدا دەرەنجامێکی لەمجۆرە زۆر

پۆزەتیڤە، بەڵام نابێتە پاساو بۆ قسەکردن سەبارەت بە دیموکراسی لە سیاقی پێناسەکردنی رژێمێکدا کە نەك دەسەڵاتگەری، بەڵکو تۆتالیتاریزمی خۆی، لەکەس ناشارێتەوە.

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە سەردەمی لیبراڵیزم کۆتاییهاتووە، لەو کاتەوەی کە هێزە کارگەرە میللیەکان سازکران و لەلایەن کایەی پیشەسازییەوە لە دەوروبەری شارەکان خڕکرانەوەو کەڵەکەکران، ئەو پرۆسەیەی کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمداو لە چەند وڵاتێکدا، بەتایبەتی لە ئەڵمانیاو ئەمریکیا زۆر بەخێرایی بەڕێوەچوو. گەر ئەم هەموو شتە نەبووبێتە هۆی لەنابردنی هزری لیبراڵی، ئەوا واقعی مێژوویی ئەوەی سەپاند کە بایەخی زیاتر بە نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندیەکانی زۆرینە بدرێ.

## پەراوێزەکان:

(1) *Libertatis splendor* لە دەقەکەدا بە لاتینی هاتووە، واتە: ئازادبوونی بەرجەستە.

(2) *Syllabus* بریتیە لە لیستی ئەو شتە یاساغ و بیرۆکانەی کە بەڕای پۆپ دەبێ بەرەنگاری بکرێن.

(3) *Whigs*و *Tories* بەئینگلیزی واتە: ئەندامانی دوو پارتی بەریتانی، یەکەمیان لەگەڵ ریفۆرمدا بوو (کە پاش جەنگ بووە پارتی ئازادیخوازان)، دووەمیشیان لەدژی ریفۆرم پشتگیریی لە دەسەڵاتی شانشینی دەکرد (ئەوەی کە ئەمڕۆ پێیدەوترێ پارتی پارێزگاران).

(4) *Homo hierarchicus, homo acqualis* لە دەقەکەدا بەلاتینی هاتووە، واتە: مرۆڤ بەگوێرەی پلەبەندیو مرۆڤ بەگوێرەی یەکسانی.

(5) واتە زۆرینەو کەمینە، لە دەقەکەدا بەئینگلیزی هاتووە.

(6) سوودگەری (مذهب المنفعة *Utilitarianism*) رێچکەیەکی فەلسەفییە فەیلەسوفی ئینگلیزی جێرمی بنتام (1748–1832) بە یەکەمین دامەزرێنەری دادەنرێو نزیکایەتی لەگەڵ لیبراڵیزمدا هەیە، هەرچەندە ئالان تۆرین لەم نوسینەیدا جیاکاریی لەنێوانیاندا دەکا. (و.ك)

## سەرچاوە

آلان تورین، ماهي الديموقراطية؟ حكم الأكثرية أم ضمانات الأقلية. ت: حسن قبيسي. ط1، بيروت: دار الساقي، 1995، ص105–120.

# ئیسلام و مۆدێرنەی سیاسی

مۆریس بارییە
لە فارسییەوە: ئاران

وەك بینیمان دەمێك نیە مۆدێرنەی سیاسی لە رۆژئاوادا دەرکەوتووە. لەم نەخشەیەشدا مۆدێرنەی سیاسی بە هەنگاوی هێواش دەچووە پێشێ و تەنانەت هەندێکجار دەگەڕایەوە بۆ دواوە کە بە تایبەتی دەبێت شێوەکانی تۆتالیتاریزم بە دەرئەنجامەکانی ئەم گەڕانەوانە دابنێین.

هەنوکە دەبێت بپرسین ئایا دەکرێت باسی ئامادەبوونی مۆدێرنەی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا بکەین و ئایا ئیسلام بەرێگرێکی هەمیشەیی لەبەردەم مۆدێرنەی سیاسیدا دەژمێرێت؟ لەمڕوەوە بارودۆخی ولأتە ئیسلامیەکان لەبەر دوو هۆی تایبەت شایانی لێکۆڵینەوەیە: یەکەمیان گرنگی هۆکاری دینە لەم ولأتانەدا و لەلایەکی دیەوە گەشەکردن و پەرەسەندنی ئیسلامیزم. لەلایەکەوە لەم ولأتانەدا دین دەورێکی چارەنوسسازی لە دەستنیشانکردنی شوناسی نەتەوەییدا هەیە و پەیوەندیەکی تەنگاوتەنگی بەدەوڵەتەوە هەیە. لێرەوە ئیسلام رەگەزێکی سەرەکی پێکەوەبوونی نەتەوەیی پێکدەهێنێ و بەشێوەیەکی گشتی دینی فەرمی دەوڵەتە. هەنوکە دەبێت لە خۆمان بپرسین بەسەرنجدان لەم هەلومەرجە، ئایا بەدیهاتنی مۆدێرنەی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا، مومکینە؟ وەلأمی ئەم پرسیارە دەگات بە نەبوونی تەواوی مۆدێرنەی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا. لەلایەکی دیەوە لە دوو دەیەی دوایی بەدواوە، شایەتی پەرەسەندنی ئیسلامیزم لە هەندێك ولأتانی ئیسلامیداین و وەك بینیمان ئەم بزوتنەوەیە دەیەوێت سەر لە نوێ گرنگی ئیسلام لە ژیانی سیاسی و کۆمەلأیەتیدا بژێنێتەوە، لەپێشبوونی یاسا ئیسلامیەکان بەرپا بکات و تەنانەت دەوڵەتێکی ئیسلامی بەرپا بکات. ئاشکرایە بۆ تێگەیشتن لەم دیاردە سەرسوڕهێنەرە دەبێت سەرەتا بەوردی تاوتوێی پەیوەندی بە مۆدێرنەی سیاسیەوە بکەین. هەوڵێکی

لەمچەشنە ئەگەری پیشاندانی ناسازگاری جەوهەری مۆدێرنەی سیاسی لەگەڵ ئیسلامیزمدا پێشکەش دەکات.

(1)

## نەبوونی مۆدێرنەی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا

دەزانین مۆدێرنەی سیاسی لە سەدەی هەژدەهەمدا تەنها لە ڕۆژئاوادا گەشە و پەرەیسەندو لە هەمانکاتدا لە جیهانی ئیسلامیدا دەرنەکەوت و لە ئەنجامدا لەم بەشەی جیهاندا بوونی نەبوو. ئەم جیاوازیە، مێژووی جیاوازی ئەم دوو مەسەلەیە بە باشی دەردەخات. لە ڕاستیدا جیهانی ئیسلام لە دوو سەدەی ڕابردودا گۆڕانێکی وەك گۆڕانی ڕۆژئاوای بەسەردا نەهاتووە و بە تایبەتی نە تاکباوەڕی لەم پانایییەدا دەرکەوت و نە جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای تیا ڕوودا. هەرچەندە لە ڕابردودا شێوە سیاسیە جیاوازەکانی جیهانی ئیسلام – پاشایەتی یان ئیمپراتۆڕەکان – لەگەڵ دەوڵەتە پێش مۆدێرنەکانی ڕۆژئاوادا گونجاوبوون، بەڵام ناکرێت دەوڵەتە کۆماریەکانی ئێستای ئەم جیهانە، بە دەوڵەتی مۆدێرن بزانرێت و جگە لەمەش کۆمەڵگای مەدەنی لەم وڵاتانەدا بە پێی پێویست گەشەی نەکردووە و خاوەن ئازادیەکی ڕاستەقینە نیە. لێرەوە دەکرێت بگوترێت جیهانی ئیسلام نائاشنایە بە مۆدێرنەی سیاسی (بەو مانایەی ئێمە مەبەستمانە).

دەکرێ هۆی ئەم بارودۆخە لەناو خودی ئیسلامدا بدۆزینەوە، چونکە دینی ئیسلام بە توندی گرنگی بە لایەنە کۆمەڵایەتیەکەی دەدات. لە ڕاستیدا باوەڕدار بە ڕاگەیاندنی باوەڕی بە ئیسلام، دەچێتە ناو نەتەوەیی ئیسلامیەوە، نەتەوەیەك کە سەروترە لەو و هەموو ژیانی دەستنیشان دەکات. بەمشێوەیە ئینتیمای ئەو بۆ نەتەوە لە چارەنوسی تاکانەیی خۆی گرنگتر دەردەکەوێت و ناکرێ بخرێتە ژێر گومان و دودڵیەوە. ڕێك لەبەرئەمەیە کە موسڵمان نەدەتوانێت دەست لە باوەڕی خۆی هەڵگرێت و نە دەتوانێت دینێکی دی هەڵبژێرێت. ئەگەر چی بڕواداری لە ڕاگەیاندنی باوەڕی خۆیدا بە ئیسلام ئازادە، بەڵام پاش ئیسلامبوون ناتوانێت دەست لە پەیمانەکەی خۆی هەڵگرێت، چونکە کارێکی لەمچەشنە بەئەنجامدانی گوناهێکی گەورە بەرامبەر بە خودا و بەرامبەر بە نەتەوە، دەژمێرێت و لێرەوە ئەنجامدانی گوناهێکی لەمچەشنە سزایەکی توندی هەیە، چونکە سزادانی هەڵگەڕاوە، مەرگە و لەبەرئەوەی ئەو خواوەندی ڕەدکردۆتەوە. نەتەوەش ئەو لە خۆی دەردەکات. لێرەوە ئەگەرچی ڕووکردنە ئیسلام کارێکی ئازادە، بەڵام موسڵمانان ناتوانن لە دینی خۆیان هەڵگەڕێنەوە و لەمڕووەوە خاوەن ئازادی شەخسی نین و لە ڕاستیدا کورت ئەبنەوە بۆ ئەندامانی نەتەوەیەك کە چیدی ناتوانن وازی لێبێنن. ئەم بنەما سەرەکیە کە بە درێژایی سەدەکانی ڕابردوو بە شوناسی ئیسلام دەژمێررا، بەم دواییانە لە مەسەلەکەی سەلمان ڕوشدیدا بەکارهێنانی خۆی پیشاندا. بەو مانایەی کە کفرکردن و هەڵگەڕانەوە تا هەنوکەش دەتوانێت حوکمی مردن بە دوای خۆیدا بهێنێت. هەرچەندە هەڵوێستێکی لەمچەشنە بە قابیلی قبوڵ نازانرێت، بەڵام پەیڕەوی لە لۆژیکێکی قوڵ دەکات.

دیارە ئەم هەڵوێست وەرگرتنە تایبەت بە ئیسلام نیە و دەکرێ لە هەموو دینە گەورەکاندا کە بەجدیەتەوە جەخت لەسەر ڕەهەندە کۆمەڵایەتیەکەیان دەکەن و دەیانەوێت ڕێنمایی

کۆی ژیانی پەیڕەوانی خۆیان بکەن، بدۆزینەوە. لەوانە و بەتایبەتی ئەم هەڵوێست وەرگرتنە لە مەسیحیەتدا (بە تایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا) بە هەمان دەرئەنجامەوە، هەبووە. لەو سەردەمەدا ئەنگزیسێۆن کافران و هەڵگەڕاوەکانی مەحکوم دەکرد و بۆ لە سێدارەدان، دەسپاردن بە دەسەڵاتی زەمینی. بیرخستنەوەی ئەم خاڵە بێبایەخ نیە کە تەنانەت تۆماس ئەکویناسیش رەوایەتی بەمکارە داوە. لە مەسیحیەتیشدا وەك ئیسلام تاك ملکەچی نەتەوەیی دینیە و لە پێناویدا قوربانی دەکرێ. بەڵام ئەگەر ئەم هەلومەرجە لە مەسیحیەتدا چ لە رووی زەمەنی و چ لە رووی شوێنەوە، سنوردارمایەوە، ئەوا لە ئیسلامدا گشتگیریەکی زیاتری هەبوو.بە پێچەوانەی رۆژئاوای مەسیحیەوە، لەمڕووەوە گۆڕانێکی ئەوتۆی قبوڵنەکرد و لە ئەنجامدا لە پێشبوون و گرنگتر بوونی کۆمەڵ بەسەر تاکدا، پارێزرا و ئەم راستیەش رێگەی لە پەیدابوونی تاکباوەڕی کە بۆ مۆدێرنەی سیاسی پێویستە، گرت.

جگە لەمە دەبێت سەرنج لەوە بدرێت کە هەرچەندە ئیسلام مەسەلەی رۆحی لە مەسەلەی دنیایی جیاکردۆتەوە، بەڵام مەسەلەی دینی لە مەسەلەی سیاسی بە جیا نازانێت. دینی ئیسلام خاوەن کۆمەڵێك ناچاری کۆمەڵایەتی و سیاسیە و بە پێی فۆرمی کلاسیکی، هەم دینە و هەم دەوڵەت. لە ئەنجامدا نەتەوەی دینی دەیەوێت بەسەر پێکەوەبوونی سیاسیدا بگونجێت. ئاشکرایە ملکەچی تاك بۆ نەتەوەی دینی بەشێوەیەکی سروشتی دەبێتە هۆی فەرمانبەرداری تاك لە پێکەوەبوونی سیاسی. بە دەربڕینێکی دی لە پێشبوونی و باڵاتربوونی کۆمەڵ بەسەر تاکدا هەم لە بواری سیاسیدا دەردەکەوێت و هەم لە بواری دینیدا. تاکەکەس لەم هەلومەرجەدا ناتوانێت سەربەخۆ بێت لە نەتەوەو کۆمەڵ و ئەم نەتوانینەش رێگە لە مۆدێرنەی سیاسی دەگرێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا گەرچی ئیسلام دەوری لە رێگەگرتن لە مۆدێرنەی سیاسیدا هەبوو، بەڵام دەورێکی چارەنوسسازانەی نەبوو. لێرەوە دەبێت هۆکارە قوڵەکانی هەلومەرجێکی لەم چەشنە لە جێگەیەکی دیدا بدۆزینەوە. لە راستیدا ئەگەرچی لە نێوان ئیسلام و مەسیحیەتدا (بە تایبەتی مەزهەبی کاسۆلیك) سەبارەت بە پەیوەندیەکانی تاك و نەتەوە جیاوازیەکی ئەوتۆ نیە، بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە گۆڕانی وڵاتە ئیسلامیەکان وەك گۆڕانی وڵاتە مەسیحیەکان نەبووە. جیاوازیەکی لەم چەشنە زۆرتر دەگەڕێتەوە بۆ فەزای کۆمەڵایەتی – سیاسی و پەیوەندیەکانی دین بەم فەزایەوە، نەك بۆ خودی دین. لێرەوە دەبێت تاوتوێی خەسڵەتی دەوڵەت لە جیهانی ئیسلام و پەیوەندیەکانی دەوڵەت بە ئیسلامەوە بکەین و لەمڕووەشەوە دەکرێت بەراوردکردنی بەرۆژئاوای مەسیحی، سەرەدەزویەکمان بداتێ.

ئەو وڵاتانەی مەسیحیەت لەناویاندا بڵاوبۆوەو گەشەی تیاکرد، بەشێوەیەکی گشتی بەدوو دەزگای جیایی سیاسی و دینی دەناسرانەوە و هەریەك لەم دەزگایانە توانا و سروشت و مەرجەعیەت و یاسایی تایبەتی خۆیان هەبوو. لە نێوان دەزگای سیاسی و دەزگای دینیدا نەك جیابونەوە، بەڵکو جیاوازی دەبینرا و پەیوەندیان هەندێکجار شێوەی هاوکاری تەنگاوتەنگ و هەندێکجار شێوەی ململانێی ئاشکرای بەخۆیەوە دەگرت. لێرەوە ئەگەرچی بواری دنیایی بەشێوەیەکی گشتی پەیڕەوی لە دەزگای دینی دەکرد، بەڵام ئەوەی کە گرنگە بوونی دوو دەزگای جیاواز بوو کە هەریەکەیان

سەربەخۆییەکی تایبەتیان هەبوو. لەمڕووەوە دەزگای سیاسی دەیتوانی تایبەتمەندی خۆی بپارێزێ و لە دین دورکەوێتەوە و جگە لەمەش تەنانەت دەیتوانی بێ هاوکاری دین و بێ پشتیوانی دین، تەنها بە پشتبەستن بە خۆی بژی. دینیش دەزگای تایبەت بە خۆی، واتە کەنیسەی هەبوو. دەزگای دینیش ئەوەندە بەهێز بوو کە بتوانێت ئەگەری ژیانێکی سەربەخۆ لە بونیادە سیاسیەکان بۆ خۆی دەستەبەر بکات. بە هەر شێوەیەك بووە ئەم دوو شێوەیەی دەزگا لە رۆژئاوادا (کە هەندێکجار کەنیسە بە ڕاگەیاندنی بالأتربوونی خۆی بەسەر دەسەلأتە دنیاییەکاندا، هەندێکجار تا بەرپاکردنی جۆرێك دین سالاری دەڕۆیشت) باشتر لە خۆرهەلأت (کە دەزگای مەزهەبی زۆرتر ملکەچی دەسەلأتی سیاسی بوو وە هەندێکجار جۆرێك سزار – پاپیزمی راستەقینەی قبوڵدەکرد) دابیندەکرا.

لە ئیسلامدا بەهۆی تاکڕەهەندییەکەوە، ئەم دوو شێوە دەزگایە نادۆزرێتەوە. وەك دەزانین پێغەمبەری ئیسلام خۆی بە پەیامە دینیەکەی سنوردار نەکرد، بەڵکو دەزگایەکی کۆمەلأیەتی و سیاسیشی بۆ نەتەوەی باوەڕداران، دەستەبەر کرد. لێرەوە پێغەمبەری ئیسلام نەك بونیادنەری دین، بەڵکو رابەرێکی سیاسی و تەنانەت بەسەرکردەیەکی سەربازیش دەژمێرێت. قورئانیش تەنها کتێبێکی دینی نیە، بەڵکو هەڵگری بڕیارە یاسایەکانیشە. لە ئەنجامدا سەرەڕای جیاوازی دەزگای دینی لە دەزگای سیاسی، ئەم دوانە بە توندی تێکئالأون. بە تایبەتی دەزگای دینی بە بەراورد بە دەزگای سیاسی کەمتر پەرەیسەند و بە گشتی بە دەزگای سیاسیەوە بەسترابۆوە. زۆرێك بەسەر پەیدابوونی ئیسلامدا تێنەپەڕی کە لە سەدەی حەوتەمی میلادیدا درزێك کەوتە ناو مەزهەبی شیعە و سونەوە کە لەو سەردەمەوە بەردەوام گرنگی بەرچاوی خۆی پاراستووە. لە راستیدا جگە لە مەسەلەی جێگری پێغەمبەر، ئەم درزە لە بنەڕەتدا پەیوەندی بە تێگەیشتن بۆ دەسەلأتی خەلیفە و لێرەوە پەیوەندی نێوان مەسەلەی سیاسی و مەسەلەی دینیەوە هەبوو. لە ئەنجامدا جیاوازی یان رووبەڕووبونەوەی شیعە و سونە، سەرەتا زۆرتر مانایەکی سیاسی هەبوو تا مەزهەبی.

سونە هەم دەسەلأتی سیاسی و هەم دەسەلأتی دینی بە خەلیفە دەبەخشی و لە راستیدا بە دامەزراندنی بنەماڵەی ئەمەویەکان، راستەوخۆ مەسەلەی سیاسی بەسەر مەسەلەی دینیدا زاڵبوو. لە ئەنجامدا هێواش هێواش دەزگای سیاسی پەرەی سەند و گەشەیکرد و بوو بە دەزگایەکی ئۆتۆریتەر و لە ڕاستیدا دەزگای سیاسی، دینی لە ناوخۆیدا گونجاند و خستیە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. دەکرێت بگوترێت دەزگای سیاسی پارێزگاری لە دین دەکرد، ڕێنمایی دینی دەکرد و سودی لێدەبینی. ئیسلام لەم هەلومەرجەدا چیدی پێویستی بە دەزگایەکی تایبەت نەبوو و ملکەچی بواری سیاسی مایەوە کە مانەوە و پەرەسەندن و گەشەکردنی زامندەکرد. لێرە بەدواوە ئەم نمونەیە لە هەموو جێگەیەکدا بلأوبۆوە و لە رەوتی سەدەکاندا، بە شوناسی سونەکان ژمێررا و هەنوکەش لە زوربەی ولأتە ئیسلامیەکاندا ئامادەیە. لەم ولأتانەدا دەوڵەت ئیسلام کۆنترۆڵ دەکات و ئیسلام هەم دینی فەرمی دەوڵەت و هەم ئامێرێتی.

بە پێچەوانەوە شیعەگەرێتی بڕوای وابوو خەلیفە دەبێت خۆی بە دەسەلأتی دینی سنوردار بکات، نەك ئەوەی خەریکی بەکارهێنانی دەسەلأتی دنیایی بێت. بەمشێوەیە شیعەگەرێتی بەچاوپۆشین

له هەموو داوایەکی سیاسی، گرنگی زیاتری بە دەزگای دینی داو ئارەزووی ئەوەی دەکرد سەربەخۆی خۆی لە بەرامبەر پاراستنی دەسەلآتی سیاسیدا بپارێزێت. هەوڵێکی لەمچەشنە بووە هۆی دروستبوونی پلە و پایەیەکی مەزهەبی شیعەکانی، بەشێوەیەکی سەربەخۆ، لە ئەستۆ گرت. ئەم نمونەیە جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ هەلومەرجی کەنیسە لە رۆژئاوای مەسیحیدا نەبوو. چونکە لەوێش دەسەلآتی رۆحانی لە دەسەلآتی دنیایی جیاواز و لەسەرتر بوو. بەلآم نمونەی شیعەگەرێتی هێندە بلآونەبووەو لە بنەڕەتدا تەنها ئێرانی گرتەوە. لە راستیدا لە شۆڕشی سالّی 1979 ەوە تا هەنوکە نمونەیەکی لەمچەشنە لە ئێراندا کاردەکات. شۆڕش بە پەیوەستکردنی سیاسەت بە دینەوە، رژێمێکی دینسالاری راستەقینەی بەرپاکرد. هەر ئەم نمونەیەش کەمتازۆر ئیلهام بە ئیسلامیزمی هەنوکە دەدات کە دەیەوێت دەوڵەتێکی ئیسلامی بونیاد بنێت کە ملکەچی یاساکانی شەرعە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سونەگەری و شیعەگەری سەرەڕای جیاوازی نێوانیان لە پەیوەندیاندا بە مۆدێرنەی سیاسیەوە — یان باشتر بلێین نەبوونی مۆدێرنەی سیاسیەوە — لە کرداردا بەیەك دەرئەنجام دەگەن. ئیسلام لە ولآتە سونیەکاندا بە پێچەوانەی مەسیحیەتەوە هیچ کاتێك کەنیسەیەکی رێکخراوی سەقامگیری دروستنەکرد. دەزگای دینی هەمیشە لاواز و سنوردار مایەوە و هیچ کاتێك بە دوای دۆزینەوەی دەزگا یان مەرجەعیەتێکدا نەگەڕا و هەوڵی بۆ ململانێکردن لەگەڵ دەسەلآتی سیاسی یان تەنانەت بالآدەست بوون بەسەر دەسەلآتی سیاسیدا نەدا. بەلآم دەزگای سیاسی بە دروستکردنی پاشایەتیەکان و ئیمپراتۆریەکان، بە ئازادانە گەشەیکرد و پەرەیسەند و بۆ پاراستن و بەهێزکردنی خۆی سودی لە دین وەرگرت و بە گۆڕینی ئیسلام بە دینی دەوڵەت، تا ئەندازەیەکی زۆر دینی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. لاوازی دەزگای دینی و بەهێزی دەزگای سیاسی بە رژێمێکی تاکانە گەیشت کە تیایدا مەسەلەی سیاسی، مەسەلەی دینی لە ناوخۆیدا دەگونجێنیٚ. لە کاتێکدا دوالیزمی دەزگایی هەمیشە لە جیهانی مەسیحیدا هەبووە. لێرەوە نەتەوەی دینی لەگەڵ پێکەوەبوونی سیاسیدا چونیەك بوون و یەکێتی نەتەوەی دینی، یەکێتی پێکەوەبونی سیاسی بەهێزدەکرد. لە ئەنجامدا ملکەچی تاك بۆ کۆمەڵ هەم خۆی لە بواری دینیدا پیشاندەدا و هەم لە بواری سیاسیدا. لەم هەلومەرجەدا دەرکەوتنی تاکی سەربەخۆ کە لە بەرامبەر کۆمەڵدا سەربەخۆیە، بەکردەوە ناموکینە و هەر ئەم راستیەش نەبوونی مۆدێرنەی سیاسی لە جیهانی ئیسلامی سونیدا، روندەکاتەوە. هەر ئەوەندەی دەوڵەتی موسڵمان پشت بە دین دەبەستێت و دەیخاتە خزمەتی خۆیەوە، هەر ئەمە رێگە لە دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن دەگرێت. یەکێتی دین و دەوڵەت رێگری جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگایە و لێرەوە دەبیٚ بە رێگری مۆدێرنەی سیاسی.

بەلآم شیعەگەری لایەنیکەم لە رووی بنەماکانەوە لە هەلومەرجێکی جیاواز و تەنانەت دەکریٚ بگوتریٚ پێچەوانەدا راوەستاوە. ئەم مەزهەبە کە هەمیشە سەربەخۆی خۆی لە بواری سیاسی پاراستبوو، زۆرتر دەستیکرد بە پەرە و گەشەسەندنی دەزگای مەزهەبی بە مەرجەعیەت و رۆحانیەتێکی سەقامگیرەوە کە رێك وەك رۆژئاوای مەسیحی بووە هۆی دروستبوونی دوالیزمی دەزگایی — سیاسی و دینی—. گەرچی ئەم راستیە

له رووی تیوریەوە ئەگەری مۆدێرنەی سیاسی مومکین دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مۆدێرنەی سیاسی لەبەر دوو هۆ رووینەدا: یەکەم لەبەرئەوەی جیابونەوەی راستەقینە لە نێوان دەوڵەت و دیندا بوونی نیە و ئیسلامی شیعی رووی لە فۆرمەلەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و رێنمایکردنی دەسەڵاتی سیاسیە. دوهەم دیسان باسی دەوڵەتی پێشمۆدێرنە کە تیایدا بواری گشتی لە بواری تایبەتی جیانەبۆتەوە. بەمشێوەیە شیعەگەری لەگەڵ هەموو جیاوازیەکانیشی لەگەڵ مەزهەبی سونەدا، زیاتر لەو ناچێتە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە. هەلومەرجی هەنوکەیی ئێران ئەم ئەنجامگیریە دەسەلمێنێ. ئیسلامی شیعە پاش شۆرشی 1979 بەدواوە هەوڵیداوە رابەرایەتی دەسەڵاتی سیاسی بکات، دەوڵەت ملکەچی دین بکات و بۆ پێشخستنی دین، سود لە دەوڵەت وەربگرێت. لە راستیدا یەکێتی سیاسەت و دین بە قازانجی دین تەواو بووە و هەر ئەمەش رێگە لە مۆدێرنەی سیاسی دەگرێت. بەمشێوەیە سونەگەری‌و شیعەگەری لە بواری سیاسیدا و لە رێگەی جیاوازەوە، بەهەمان دەرئەنجام دەگەن.

وەك دەزانین جیهانی ئیسلام لە سەدەکانی رابردوودا، مۆدێرنەی سیاسی تاقینەکردۆتەوە. هەنوکەش بارودۆخی وڵاتە موسڵمانەکان چ سونی مەزهەبەکان و چ شیعە مەزهەبەکان، گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە. بەشێوەیەکی گشتی ئەم وڵاتانە بە پاراستنی یەکێتی دەوڵەت و دین دەریدەخەن کە دەوڵەت بەشێوەیەکی کامڵ لە کۆمەڵگا جیانەبۆتەوە. دیارە هەندێك ئاوارتنی دەگمەنیش هەن کە نمونەی ئاشکرای تورکیایە. ئەم وڵاتە لە ساڵەکانی نیوەی دوهەمی سەدەی بیستدا رویکردە عەلمانیەتێکی دەسەڵاتخواز و هەنگاوی بەرەو مۆدێرنەی سیاسی هەڵهێنا. بەڵام لەم حاڵەتەشدا جیابوونەوەی دین و دەوڵەت کامڵ نیە و وەك لە بەشی پێشوودا بینیمان، چەندان ئاماژە هەن دەریدەخەن ئەم وڵاتە هێشتا بە مۆدێرنەی سیاسی نەگەیشتووە. بەهۆی کۆمەڵێك بەڵگەی رونەوە بارودۆخی وڵاتە ئیسلامیەکانی دی کە عەلمانیەتێکی هاوشێوەیان بەدینەهێناوە، بەهەمان شێوەیە. ئەگەرچی لەم ئاراستەیەدا هەندێك هەوڵی دودڵانە لەلایەن تونسەوە دراوە. ئەم وڵاتانە تەنها بە جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت یان لایەنیکەم رزگارکردنی دەوڵەت لە دەسەڵاتی دین دەتوانن، پێ بنێنە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە. پرۆسەیەکی لەمچەشنە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەستی پێنەکردووە و دەوڵەت هەروا بەم مانایە بە موسڵمان ماوەتەوە کە بەشێوەیەکی تەنگاوتەنگ پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەیە. جا چ بۆ کۆنترۆڵکردنی دین و سودوەرگرتن لێی، و چ بۆ فەرمانبەرداری لە دین و ملکەچی بۆ دین و خزمەتکردنی. بەڵام دەبێ سەرنج لەوە بدەین لە راستیدا دوو وڵاتی موسڵمان بە جیاوازیەکی زۆرەوە هەن کە بەشێوەیەکی پێچەوانەی یەکدی رێکخراون و کاردەکەن: هەندێکجار روبەروی ئیسلامی دەوڵەتی دەبینەوە و هەندێکجاریش دەوڵەتی ئیسلامی.

لە حاڵەتی یەکەمدا کە لە دوورەوە بە باوترین شێوەی هەبوو دەردەکەویت و زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکان دەگرێتەوە، دەبێ بگوترێت کە دەوڵەت دەسەڵاتی بەسەر دیندا هەیە و کۆنترۆڵی دەکات و ئەمکارەش بە ئیسلامی دەوڵەتی دەگات. لە راستیدا دەوڵەت دین رێکدەخات، دەیخاتە خزمەت خۆیەوەو پشتیوانی لێدەکات و دواجار بۆ یاسارێژی و چۆنێتی رەفتار و کرداری خۆی، ئیلهام لە دینەوە وەردەگرێت. لەم وڵاتانەدا یاساکانی شەرع بناغەی

سیستەمی یاسایی پێکدەهێنیّ و هەندیّ جار وەك مۆریتانیا بە تاکە سەرچاوە و هەندێکجاریش وەك جەزائیر و میسر، بە سەرچاوەی سەرەکی دەژمێرێتو بە تایبەتی یاساکانی ئەحوالّی شەخسی کە پەیوەندی بە ژیانی خێزانی و میراتەوە هەیە، دیاریدەکات (یاساکانی خێزان لە جەزائیریشدا ئیلهامی لەم یاسایانەوە وەرگرتووە). لێرەوە ئیسلام بووە بە ملکەچی دەولّەت و بووە بە ئامێری سیاسەت.

خالّی گرنگ ئەوەیە ئەم بارودۆخە لە راستیدا کەموکوڕیەکی سیاسی و ناکاملّی دەولّەت پێشاندەدات. لە راستیدا دەولّەت هێشتا خاوەن پلەو پەیکەرێکی سەقامگیر نیە کە بتوانێت لەسەر پێی خۆی بوەستێت بەجێهێشتنی ئازادی تەواو بۆ دین، وازی لێبێنێت. لێرەوە سود لە پشتیوانی دین وەردەگرێت و لەسەربەخۆی دین دەترسێت. لەمڕووەوە لەبەرئەوەی دەولّەت پێویستی بە دینە، جیابونەوەی دین و دەولّەت دەبیّ بە شتێکی نەشیاو. بەمشێوەیە قسە لەسەر مەسەلەی سیاسیە سەبارەت بە دەولّەت، نەك مەسەلەی دینی کە قسە لەسەر ئیسلام دەکات. لە ئەنجامدا دەبیّ نەبوونی مۆدێرنەی سیاسی لە جیهانی ئیسلامدا بگەڕێنینەوە بۆ کەموکوڕی و ناتەواوی دەولّەت، نەك ئیسلام. نەبوونی مۆدێرنەی سیاسی بە باشی پیشانیدەدات کە دەولّەت بەو ئەندازەیە بەهێز نیە کە بتوانێت بەشێوەیەکی سەربەخۆ و بیّ هاوکاری دین بژی، ئەم ئەنجامگیریە بە تایبەتی بۆ تێگەیشتن لە بارودۆخی هەنوکەیی زۆرێك لە دەولّەتە موسولّمانەکان و مەسەلەکانیان، گرنگی خۆی هەیە.

بەلاّم جۆری دووهەم لە ولاّتە ئیسلامیە جیاوازەکانیش هەیە کە تیایدا دەولّەت ملکەچی ئیسلامە و ئیسلام ڕێنمایی دەولّەت دەکات و کۆنترۆلّی دەکات. لەم حالّەتەدا بە پێچەوانەی حالّەتی یەکەمەوە دەولّەت ئامێری دینە و لەمڕووەوە دەکرێت باسی دەولّەتی ئیسلامگەر یان دەولّەتی ئیسلامی بکەین. ئەم بارودۆخە بەشێوەی جیاواز لە چوار ولاّتی عەرەبستانی سعودی، ئێران، سودان و پاکستاندا هەیە. لەم ولاّتانەدا کە ڕژێمەکانیان خەسلّەتێکی دینسالاریانەیان هەیە (یان بە قسەیەکی باشتر شەرع سالارانەیان هەیە)، مەرجەعی دینی بەسەر دەسەلاّتی سیاسیدا زالّە و ڕێنمایی دەکات. لەم ئاراستەیەدا دەتوانین ناوی ئێران و تێزەکانی خومەینی بهێنین. بەشێوەیەکی گشتی یاساکانی شەرع بەرزتر و بالاّترن لە یاساکانی دەستور (وەك سودان و پاکستان) و هەندێکجاریش بە دەستوری ولاّت دەژمێرێن (عەرەبستانی سعودی). یاساکانی شەرع سیستەمی یاسایی و بەتایبەتی یاسا مەدەنی و سزاکان بەجۆرێك ڕێنمای دەکات کە بەها ئیسلامیەکان بپارێزرێن و پەرەبسێنن. بۆ نمونە دەتوانین ئاماژە بۆ دەستنیشانکردنی ڕێساکانی پەیوەندیدار بە ئەحوالّی شەخسیەوە بکەین و پێشبینی سزادانی سەخت لە حالّەتی هەلّگەڕانەوە یان کفرگوتن بکەین. لەم هەلومەرجەدا دەولّەت سەربەخۆیی راستەقینەی نییە و بە تەواوی بەستراوە بە دینەوە. لە ئەنجامدا لەم حالّەتەدا کەموکوڕیە سیاسیەکان لە حالّەتی یەکەم زۆرترە. لە راستیدا لە نێوان دەولّەتو دیندا جیابونەوە نیە و مۆدێرنەی سیاسی بە نامومکین دەردەکەوێت. ئەم بارودۆخە هەم دەسەلاّتی ئیسلام بەسەر دەولّەتدا و هەم لاوازی دەولّەت روندەکاتەوە. هەلومەرجێکی وا بە روونی کەموکوڕی بونیادی دەولّەت و پەیوەستبوونی تەواوی بە دینەوە، نمایشدەکات. لە ڕاستیدا مەسەلەی دینی، مەسەلەی سیاسی لە ناوخۆیدا

گونجاندووە و سودی لێدەبینێ. ئەم ئەنجامگیریە رونکردنەوە و تێگەیشتنی دروستی دیاردەی ئیسلامیزم کە لە دوو دەیەی پێشودا لە ژمارەیەك لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا سەریهەڵداوە، مومکین دەکات.

(2)

## دژایەتی ئیسلامیزم و مۆدێرنەی سیاسی

ئەگەر لە جیهانی موسڵماندا بەهۆی یەکبوونی تەنگاوتەنگی دەوڵەت و دین، مۆدێرنەی سیاسی ونە و تەنانەت بە نامومکین دێتە بەرچاو، ئەوا لە نێوان مۆدێرنەی سیاسی و ئیسلامیزمدا دژایەتیەکی بنەڕەتی هەیە و لە ڕاستیدا ئەم دوانە یەکدی بە شێوەیەکی دولایەنە دەردەکەن. ئیسلامیزم بە مانایەکی ورد بریتیە لە سەلماندن و پەرەسەندنی ئیسلام و بەها ئیسلامیەکان بە سود وەرگرتن لە سیاسەتی دەوڵەت (زاراوەی ئیسلامیزم لە ئسولیەت یان رادیکالیزمی ئیسلامی رەوانترە). لە راستیدا ئیسلامیزم پەیوەندی بە نمونەی دینسالاریەوە هەیە کە دین تیایدا لە رێگەی بە خزمەت وەرگرتنی دەوڵەتەوە، بەسەر سیاسەتدا زاڵ دەبێت و دەستدەکات بە رێنمایکردنی. لەمڕووەوە ئیسلامیزم بانگەشەی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەیەو دەیەوێت زامنی باڵاتربوونی دین بکات، یاساکانی دین جێبەجێ بکات و دەوڵەتێکی ئیسلامی بەرپا بکات. بەمشێوەیە ئیسلامیزم هاوڕێی ئەو خواستە کۆن و قوڵەی ئیسلامە کە لەسەر بناغەی دابینکردنی دەسەڵاتی دین بەسەر کۆی ژیاندا و لەوانە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسی، راوەستاوە. خواستێك کە لە بنەڕەتدا لە شیعەگەرێتیدا نەشونمایکرد. ئیسلامیزم دەرکەوتی گەڕانەوەیەکە بۆ خاڵی دەرچوون و سەرچاوەکانی ئیسلام (لەمڕووەوە بەشێوەیەکی ئسولیەت دەژمێرێت) و هەروەها کاردانەوەیەکە لە بەرامبەر ملکەچی دین بۆ دەوڵەت کە خەسڵەتی سونەگەریە. ئەم بزاوتە دەیەوێت باڵاتر بوون و لە پێشبوونی ئیسلام بەسەر مەسەلەی سیاسیدا بەدیبهێنێت و کۆمەڵگا و دەوڵەت سەر لە نوێ لە ڕێگەی ئیسلامەوە رێکبخاتەوە.

بە گشتی هەوڵدەدەن ئیسلامیزم بە گەڕانەوە بۆ هۆکارە جیاوازە ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی یان کلتوریەکان رونبکەنەوە. دەڵێن مەسەلەی وەك کەموکوڕیەکان و هەروەها شکستی وڵاتە ئیسلامیەکان پاش سەربەخۆی و بەتایبەتی گەشەنەکردنی ئابوری، نا یەکسانی کۆمەڵایەتی، جۆرەکانی نادادپەروەری، ناشایستەی و فەسادی لێپرسراوان، لەدەستچونی شوناسی کلاسیکی، سستبوونی داب و نەریت و نفوز و دەسەڵاتخوازی رۆژئاوا، ئیسلامیزمی بەرهەمهێنا. ئەگەرچی ئەم روونکردنەوانە بە بەڵگەی پڕ بەهای خۆیان هەیە بەڵام بەهیچ شێوەیەك بەس نین و ئەگەری تاوتوێکردن تا قوڵایی مەسەلەکە دەستەبەر ناکەن. کەوابوو دەبێت تەفسیرێکی دی بۆ ئەم دیاردەیە بکەین و لە نێوان ئیسلامیزم و نەبوونی مۆدێرنەی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا، پەیوەندیەك دروستبکەین. ئەم پەیوەندیە بە دوو شێوەی جیاواز خۆی دەردەخات: لەلایەکەوە ئیسلامیزم دەرئەنجامی نەبوونی مۆدێرنەی سیاسیە و لەلایەکی دیەوە وەك رەدکردنەوەی کامڵ مۆدێرنەی سیاسی خۆی دەردەخات.

### ئەلف

### ئیسلامیزم و نەبوونی مۆدێرنەی سیاسی

دەکرێت پەیدابوون و گەشەکردنی ئیسلامیزم بە نەبوونی مۆدێرنەی سیاسی لە وڵاتە

ئیسلامیەکاندا رونبکرێتەوە. وەك پێشتر بینیمان ئەم وڵاتانە بەشێوەیەکی گشتی جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی و جیابونەوەی بواری گشتی لە بواری تایبەتی ناناسن. لە ئەنجامدا جیابونەوەی دین و دەوڵەتیش بوونی نیە. دەوڵەت خەسڵەتێکی دینی هەیە و ئیسلام دینی فەرمیە. کۆمەڵگای هاوڵاتیان و کۆمەڵگای باوەڕداران چونیەکن و ئیسلام بە ڕەگەزێکی گرنگی دەوڵەت دەژمێرێت. بەڵام ئەم هەلومەرجە زۆربەی جار ناهاوسەنگە. بەو شێوەیەی کە دەزگای سیاسی بەسەر دەزگای دینیدا زاڵە و دەوڵەت دین لە ناوخۆیدا دەگونجێنێ، کۆنترۆڵی دەکات و سودی لێدەبینێ. دینیش خۆی بەستراوە بە دەوڵەتەوە، هەم یارمەتی لە دەوڵەت وەردەگرێت و هەم پشتیوانی لێدەکات. ئەم تێکئالآن و هاوکاریە نزیکە، دەورێکی کاریگەر لە کاتی خەباتی وڵاتە ئیسلامیەکاندا بۆ سەربەخۆی، بینی. لە راستیدا سەربەخۆیی هەم بە مانای ئازادی سیاسی لە دەست وەبەرهێنەری رۆژئاوا بوو، هەم جۆرێك سەلماندنی شوناسی دینی بوو لە بەرامبەر جیهانی مەسیحیدا. بەڵام پاش دەستگەیشتن بە سەربەخۆیی، دەوڵەتی سەربەخۆ عەیب و کەموکوڕیەکانی دەرکەوت و بێتوانایی خۆی لە دۆزینەوەی رێگەچارەدا بۆ کێشە جیاوازە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکان دەرخست. ئیسلام کە رووی لە رێنمایکردنی کۆی کۆمەڵگە و باڵاترکردنی بەهاکانێتی، بە هوشیاربوون بەم دۆخە بەدوای چارەسەرێکدا گەڕا. بەمشێوەیە لاوازی و کەموکوڕیەکانی دەوڵەت بوو کە پەرەی بە راپەڕینی ئیسلامی دا و بۆ دەستێوەردان لە مەسەلە سیاسیەکان وروژاندی.

لێرە بە دواوە ئیسلام خۆی بە پشتیوانی کردنی دەوڵەت سنوردار نەکرد، بەڵکو بۆ ئەوەی بوونی خۆی زامن و بەهاکانی سەقامگیر بکات، بانگەشەی جێگرتنەوەی دەوڵەتی کرد. لەمڕووەوە چیدی بەوەی کە دینی فەرمی دەوڵەتە خۆشحاڵ نەبوو، دەیویست بە دەستی خۆی دەوڵەتێکی دینی دروستبکات. ئیسلام توانا سەرەتاییەکانی خۆی بۆ رێکخستن و رێنمای باوەڕداران لەو ڕووەوە بەدەستهێناوە کە هەم دینە و هەم حکومەت. لە ڕاستیدا ئەم بانگەشەیە، ئیسلامی کرد و دەکات بە ئیسلامیزم، بەمشێوەیە ئیسلامیزم دەستیکرد بە ململانێ لەگەڵ دەوڵەتدا و دەیەوێت دەستی بەسەردا بگرێت و تەنانەت وێرانیبکات. دیارە هەلومەرجەکان لەم ئاستەشدا جۆراوجۆرن و پلەی جیاوازیان هەیە. بۆ نمونە ئیسلامیزم هەندێکجار توانیویێتی دەوڵەتی ئیسلامی بەرپا بکات و دەسەڵاتی سیاسی بەکاربهێنێ (وەك ئێران و سودان) هەندێکجاریش بۆ دەستگەیشتن بەم ئامانجە پەنا بۆ توندوتیژی دەبات (وەك جەزائیر، مسر، ئەفغانستان). هەندێکجار لە ئەنجامی هەڵبژاردنەوە دەگاتە پەرلەمان یان تەنانەت حکومەت و بەمشێوەیە بەشداری لە دەسەڵاتی سیاسیدا دەکات (وەك ئەردەن و تورکیا). هەندێکجاریش بەهەندێك کرداری سنوردار وازدەهێنێ کە بەشێوەیەکی راستەقینە هەڕەشە لە دەوڵەت ناکات (وەك مەغریب و تونس). بە پێچەوانەوە لەو وڵاتانەدا کە پێشتر دەوڵەتێکی دینیان هەبووە (عەرەبستانی سعودی) یان خاوەن رژێمگەلێکی کەمتازۆر دیکتاتۆرئاسان (وەك لیبیا، سوریا و عێراق) ئیسلامیزم بەکردەوە بوونی نیە.

بە دەربڕینێکی دی دەکرێ بگوترێ ئیسلامیزم کاتێك پێشدەکەوێت و شانسی سەرکەوتنی هەیە

که دەوڵەت لاواز و ناچالاك بێت. بەشێوەیەکی گشتی لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا، ‌بارودۆخەکە بە پلەی جیاواز بەمشێوەیەیە و لێرەوە هەموویان کەمتازۆر لەبەردەم هەڕەشەی ئیسلامیزمدان. زۆرێك لە وڵاتەکان پێشتر روبەڕوی بونەتەوە و رەنگە درەنگ یان زوو روبکاتە کەسانی دیش. لە دوا شیکردنەوەدا نەبوونی مۆدێرنەی سیاسیە کە پەیدابوون، گەشەکردن و پەرەسەندنی ئیسلامیزم، روندەکاتەوە. لە راستیدا ئیسلامیزم دەرئەنجامی نەبوونی جیابونەوەی مەسەلەی سیاسیە لە مەسەلەی دینی — و تەنانەت لەمەش فراوانتر — دەرئەنجامی نەبوونی جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیە. لە بارودۆخێکی وادا لە حاڵەتی کەموکوڕی و لاوازی دەوڵەتدا، ئیسلام سەربەخۆی خۆی بەدەست دێنێتەوە، بە دوای سەپاندنی سەقامگیری خۆیدا دەڕوات و کردارەکانی خۆی فراوان دەکاتو دواجار دەستدەکات بە دەستەبەرکردنی پرۆژەیەکی سیاسیودروستکردنی دەوڵەتێکی ئیسلامی بۆ خزمەتکردنی دین.

بەسەرنجدان لەم بارودۆخە ململانێی کارا لەگەڵ ئیسلامیزمدا، لە بنەڕەتدا بەستراوە بە سەقامگیری مۆدێرنەی سیاسیەوە، واتە هەم دروستکردنی دەوڵەتێك کە بەرپرسیاری بەرژەوەندیەکان و مەسڵەحەتی گشتی لە ئەستۆ بگرێت و هەم دروستکردنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی کە توانای ئازادبوون بە تاکەکان دەبەخشێت. ئاشکرایە بە ئەنجام گەیاندنی ئەرکێکی لەم چەشنە دوالیزمێکی سەخت و درێژخایەنی دەوێت. لەم ئاستەدا هەم دەبێ دەوڵەت لە دین جیابێتەوە و بێ پشتیوانی دەوڵەت لەسەر پێی خۆی بوەستێت هەم ئیسلامیش لە پلەی دەوڵەتی خۆی وازبهێنێت و تەنها دینی تاکەکان بێت. کەوا بوو ململانێ لەگەڵ ئیسلامیزمدا پێویستی بەوەیە دەوڵەت لە چنگی دین رزگاری بێت و روبەڕووی بانگەشە سیاسیەکانی بێتەوە. سەیر لەوەدایە هەندێك لە دەوڵەتەکان دەیانەوێت بە پاراستنی ئیسلام وەك دینی دەوڵەت و بە گەڕان بەدوای سازشێکی ئاڵۆزدا لەگەڵ ئیسلامیزمەکاندا — کە رۆژ بە رۆژ چاوەڕوانی زیاتریان دەبێت — لەگەڵ ئیسلامیزمدا بجەنگن. بەڵێ دەوڵەتی موسڵمان بە کۆڵێك داواکاریەوە لە دین، لە راستیدا لاوازی زاتی و بێتوانایی لە پشتبەستن بە خۆیدا، دەردەخات. سەقامگیری دەوڵەتی مۆدێرن بە پێچەوانەوە پێویستی بەوەیە کە ئیسلام بە پاراستنی جێگەی خۆی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا، دەست لە پلەی دینی دەوڵەتی هەڵگرێت.

دیارە دەستگەیشتن بە ئامانجێکی وا، زۆر ئەستەمە و ناکرێ خێرا و دەستبەجێ پێیگەیشت و بە ناچار کاتێکی زۆر و کارزانیەکی زۆری دەوێت. جیابونەوەی بەرهەمهێنی دەوڵەت لە ئیسلام ناتوانرێ بە بڕیارێکی سیاسی سادە و یان داڕشتنی هەندێك یاسا و ڕێسا (چ لە دەستور و چ لە یاسارێژیدا) بەدیبێت. لەمڕووەوە ئەم حاڵەتە پێویستی بە پرۆسەیەکی درێژخایەن و ئاڵۆزە کە دەبێت سەبارەت بە هەر وڵاتێك، داهێنەرانە، دابهێنرێت. هەر چەندە ئەگەری ئەوە هەیە لە جیهانی ئیسلامدا قۆناغێکی کەمتازۆر درێژخایەنی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و ئیسلام بمێنێتەوە، بەڵام ئامانجی دوایین هەروا جیابونەوەی کامڵی ئەو دوانەیە بەشێوەیەك کە دەوڵەتێکی مۆدێرنی رزگاربوو لە دین و بێ ئەوەی پێویستی بە دین بێت، دروستببێ.

ئەم روانگەیە دەبێ لە ئێستاوە ئیلهامبەخشی ئاراستەوەرگرتنی دەوڵەت بێت سەبارەت بە ئیسلام

به دوو شێوەی کامڵکەری یەکتر: واتە لەلایەکەوە دەوڵەت بە پشتبەستن بەخۆی و پێشخستنی کرداری خۆی، دەبێ لە نفوزی ئیسلام رزگاری بێتو چاو لە پشتیوانی بپۆشێت و لەلایەکی دیەوە سەرەڕای هێشتنەوەی ئیسلام لە دۆخی ملکەچیداو بەردەوامی کۆنترۆڵکردنی، دەبێت دین بۆ خاوەندارێتی ژیانێکی ئازاد، ئامادە بکات. لەم قۆناغی گواستنەوەیەدا – کە دەتوانێت درێژخایەن بێت– باس باسی دروستکردنی هەنگاو بە هەنگاوو لەسەر خۆی دەوڵەتی سەربەخۆ لە دینە کە رەنگە پێویستی بە بەکارهێنانی ناچارکردن و تەنانەت زۆر بێت. ئەم پەنابردنە بۆ ناچارکردن بۆ دژایەتی ئیسلامیزم کە هەندێکجار بە بەکارهێنانی توندوتیژی دژایەتی ئەم گۆڕانە دەکات، ناچارانە دەردەکەوێت.

لێرەوە ئەوەی خاوەن ئەوەلیەت و لەپێشە، مەسەلەی دەوڵەتە، نەك مەسەلەی دیموکراسی، چونکە ئیسلامیزم دەتوانێت سود لە دیموکراسی بۆ لەناوبردنی دیموکراسی وەربگرێت. ئەم راستیە کە ئەنجامگیری پراکتیکی گرنگی لێوە بەدەست دێت. دەبێ سەرنج لەوە بدرێت بینای دەوڵەتی مۆدێرن پێویستی بە گۆڕانکاری قوڵ و تەنانەت جۆرێك شۆڕشی سیاسیە، واتە دەبێت جیابونەوەی دەوڵەتو کۆمەڵگا بکات بەشتێکی عەمەلی و ئەمەش پرۆسەیەکە بەناچار سەخت و درێژخایەن (کە تەنانەت بە دەیەکان و سەدەکان ئەندازەگیری دەکرێت). ئەم پرۆسەیە خەسڵەتێکی شۆڕشگێرانەی هەیە و هەمیشە پەنا بۆ شێوازە دیموکراتیەکان نابات، و لێرەوە ئەگەر شێوازە دیموکراتیەکان تیا وون بێت، چاوپۆشی لێبکرێت و یان تەنانەت بەسەریدا تێپەڕین، نابێت سەیر و سەمەرە بێت لامان. جگە لەمانەش لەو ڕووەوە کە دەوڵەتی مۆدێرن پێش مەرجی دیموکراتیە، نابێت داوای ڕەچاوکردنی ئەم شێوازانە لە پێش دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرندا، بکەین. بەدەربڕینێکی دی سەقامگیری دەوڵەتی مۆدێرنە کە سەرهەڵدانی دیموکراسی دەکاتە شتێکی شیاو، نەك ئەوەی دیموکراسی دەبێتە سەقامگیری دەوڵەتی مۆدێرن. لە کرداردا بەرپاکردنی هاوکاتی مۆدێرنەی سیاسی و دیموکراسی بە نامومکین دەردەکەوێت. ئەم دوانە تەنها لە پاش یەکدی و بەو شێوەیە دێنەدی کەمۆدێرنەی سیاسی بە لە پێشبوونی دیموکراسی، زەمینەی بۆ دەستەبەر دەکات.

## بێ
## ئیسلامیزم و رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی

هەرچەندە ئیسلامیزم بە نەبوونی مۆدێرنەی سیاسی قابیلی رونکردنەوەیە، بەلاّم بە رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسیش دەناسرێتەوە. لە راستیدا ئیسلامیزم تامەزرۆیەکی قوڵ بۆ دەوڵەتی پێشمۆدێرن پیشاندەدات و هەوڵ بۆ پاراستنی دەدات. بەڵێ ئیسلامیزم دروستبونی دەوڵەتی مۆدێرن کە لە کۆمەڵگای مۆدێرن و لێرەوە لە دین جیابوبێتەوە، قبوڵ ناکات. دەبێ سەرنج لەو خاڵە بدرێت ئیسلامیزم زۆرتر لەو وڵاتانەدا دەردەکەوێت کە هەوڵدەدەن هەنگاو بەرەو مۆدێرنەی سیاسی بنێن (ئێران لە رابردویەکی نەك هێندە دوردا، جەزائیر، میسر و تورکیا لە سەردەمی ئێستادا) و بە توندی و بەهێزەوە دژی ئەم پرۆسەیە رادەوەستن. بە پێچەوانەوە ئیسلامیزم لەو وڵاتانەدا کە لەم یگەیەدا کەمتر پێشکەوتوون، ئامادەییەکی ئەوتۆی نیە (مەغریب، لیبیا، سوریا و عێراق). دەکرێ بە ئاسانی ئەم بارودۆخە رونبکەینەوە: لە

راستیدا ئیسلام بە درێژایی مێژووی خۆی بەشێوەی جیاواز، پەیوەندیەکی تەنگاوتەنگی بە دەوڵەتەوە هەبووە و دیارە وەك پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، بە شێوەیەکی گشتی ملکەچی دەسەلاَتی سیاسی بووەو دەسەلاَتی سیاسی کۆنترۆڵی کردووەو سودی لێ بینیووە. بەمشێوەیە ئیسلام پشتی بە پشتیوانی دەوڵەت بەستبوو، ئەم پشتیوانیەش بۆ پەرەسەندنی و گەشەکردنی بەشتێکی پێویست دەردەکەوت و رێك لەبەرئەمەش ناتوانێت کە ببینێ دەوڵەت لە دین رزگاری بێت و ببێ بە عەلمانی، جگە لەمەش ئیسلامیش وەك دینەکانی دی دەیەوێت رێنمایی کۆی ژیان لە بواری کۆمەلاَیەتی و سیاسیدا بکات و دیارە ئەم بانگەشانەش بەرەو دەوڵەتی مۆدێرن و پێشنیاری دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی دەڕوات.

گوتمان لە جیهانی ئیسلامیدا بە گشتی دەوڵەت خەسڵەتێکی دینی هەیە و ئیسلام دینێکی فەرمیە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم بارودۆخە هەمیشە مایەی خوشنودی دینی ئیسلام نیە. بەتایبەتی دەبێ سەرنج لەوە بدرێت کە هەلومەرجێکی لەمچەشنە لە حاڵەتی گۆڕاندایە و بۆ دین کۆمەڵێك مەترسی هەیە.لەبەرئەمە ئیسلامیزم بەرەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی، بەم دوو شێوەیەی خوارەوە دەتوانێت گەشە بکات و پەرەبسێنێ:

شێوەی یەکەم بریتیە لە رەخنەگرتنی ریشەیی لە دەوڵەتی هەبوو کە رووی لە نکوڵیکردن لە بەهاکان و پێداویستیەکانی ئیسلام و کورتکردنەوەی دینی ئیسلامە بۆ ئامێرێکی سادە لە خزمەت دەسەلاَتدا. بەمشێوەیە ئیسلامیزم دەوڵەت لەبەر غەفڵەتی لە پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندیە مادی و مەعنەویەکانی نەتەوەی موسڵمان و ئاراستە وەرگرتنی بەرەو مۆدێرنەی سیاسی و هەوڵدان بۆ رزگاربوون لە دین، سەرزەنشت دەکات. لەمڕووەوە ئیسلامیزم لەگەڵ خودی مۆدێرنەی سیاسیدا دەست بە دژایەتی دەکات و هەوڵدەدات رێگە هەم لە دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن کە لە ئایندەیەکی نزیکدا دەبێتە عەلمانی، هەم لە دروستبونی کۆمەڵگای مەدەنی کە دین تیایدا ئازاد دەبێت، بگرێت. بەمشێوەیە ئیسلامیزم هەم دەوڵەتی عەلمانی رەد دەکاتەوەو هەم ئازادی دینی.

شێوەی دوهەم بریتیە لە پێشنیاری بەرپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامی، دەوڵەتێك کە ئیلهام لە بەها ئیسلامیەکانەوە وەردەگرێت و بەپێی یاساکانی ئیسلام بەکاردەبێت. دەوڵەتێکی لەمچەشنە دەبێت رێسا و یاساکانی شەرع (قورئان و سونەت) رەچاو بکات و بەکار بهێنێ. ئەو یاسایانەی کە رێنمایی ژیانی تاك و کۆمەڵ دەکەن. لێرەدا چیدی ئیسلام کورت نابێتەوە بۆ ئامێری دەوڵەت، بەڵکو دەوڵەت دەچێتە خزمەتی ئیسلامەوە. لەبەرئەوە دەوڵەتی ئیسلامی رێك پێچەوانەی دەوڵەتی مۆدێرنە. واتە لەم حاڵەتەدا نەك هەر دەوڵەت و دین لەیەك جیا نین، بەڵکو دەوڵەت ملکەچی دینە. لە ئەنجامدا مەسەلەی سیاسی و مەسەلەی دینی تێکدەئاڵێن و گرنگتر لەمەش لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا جیابونەوە نیە. لێرەوە ئیسلامیزم بە داواکاری دەوڵەتی ئیسلامی، لەگەڵ مۆدێرنەی سیاسیدا دەجەنگێت و دەیەوێت رێگە لە دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن بگرێت و تەنانەت رێگە لە هەموو جۆرە گۆڕانێکی سیاسی بگرێت. دەکرێ ئەم بارودۆخە بە روونی لەو ولاَتانەدا کە ئیسلامیزمی تیا سەقامگیر بووە، بە تایبەتی ئێران و سودان، ببینین.

لەو ڕووەوە کە وڵاتە موسڵمانەکان هێشتا دەستیان بە مۆدێرنەی سیاسی نەگەیشتووە و لە بەرامبەر ئیسلامیزمدا بێچەکن و قابیلی زیان پێگەیاندنن، کەوابوو هەوڵدەدەن ئاراستەیەکی میانڕەوانە وەربگرن و بۆ بەدیهاتنی خواستە سەرەکیەکانی ئیسلامیەکان، ئیمتیاز بدەن. بەمشێوەیە ئیسلام وەك دینی فەرمی دەوڵەت دەپارێزن و هەوڵدەدەن بە دانانی دین لە پەروەردەکردن، بەکارهێنانی یاسا ئیسلامیەکان لە بواری خێزان، مزگەوت دروستکردن، پارێزگاریکردن لە مزگەوتەکان و دەزگا ئیسلامیەکان و.. وەڵامی خواستەکانیان بدەنەوە. ئاشکرایە ئاراستەیەکی وا ڕێگە لە گۆڕانیان بۆ دەوڵەتێکی مۆدێرن و عەلمانی دەگرێت. بەمشێوەیە پێشکەوتنی بەردەوامی ئیسلامیزم و پەنابردنی بۆ توندوتیژی، هەڕەشەیەکە کە ڕێگە لە ئاراستە وەرگرتنی ئەم وڵاتانە بەرەو مۆدێرنەی سیاسی دەگرێت و ڕێگەی گۆڕانکاریان لێدەگرێت.

ئیسلامیزم تەنانەت کاتێك تەکنیکەکانی ئەمڕۆش بەکاردێنێ یان پشت بە پێشکەوتنەکانی زانست وەردەگرێت، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دژایەتی مۆدێرنەی سیاسی دەکات. لەبەرئەمە ئەگەرچی دەشێت ئیسلام هێواش هێواش لە ڕێگەی ریفۆرمەوە مۆدێرن بکرێت، بەڵام ئیسلامیکردنی مۆدێرنەی سیاسی کارێکی ئەستەم و تەنانەت مەحاڵە. چونکە کارێکی وا دەبێتە هۆی لەناوبردنی مۆدێرنە. لەوڕووەوە کە ئیسلامیزم قوڵی بۆ ڕەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی هەڵکردووە، و ناتوانێت بچێتە ناویەوە، لە دەرئەنجامدا لە نێوان ئیسلامیزم و مۆدێرنەی سیاسیدا دژایەتیەکی تەواو کامڵ هەیە. لەبەرئەوە ئەو بڕوایەی کە ئیسلامیزم بە دەستگەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسی دەتوانێت دەوڵەتێکی مۆدێرن دروستبکات و مەسەلە بێئەژمارەکانی کۆمەڵگا چارەسەر بکات، لە خەیاڵێك زیاتر نیە. چونکە لەم حاڵەتەدا هەوڵدەدات دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن بۆ ماوەیەکی نادیار دروستبکات و ڕێگەی هەموو گۆڕانێك بەرەو مۆدێرنەی سیاسی بگرێت. سەرەڕای ئەمە گەڕان بەدوای سازشکردن لەگەڵ ئیسلامیزمدا و دابەشکردنی دەسەڵات لەگەڵ لایەنگرانیدا، لەبەر دوو هۆ باش نییە: یەکەم دەشێت کە ئەم سەرکەوتنە ڕێژەییە بە بەس نەزانێت و هەوڵبدات خۆی بە فراوانترین شێوە بسەپێنێت، دووهەم ئامادەبوون و کرداری لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرنی جیا لە کۆمەڵگا و لێرەوە جیا لە دین، بە توندی نەگونجاوە. لە ئەنجامدا باشتر وایە ئیسلامیزم لە دەوڵەت دور بخرێتەوە و لە ژێر پەردەی دیموکراسیدا بەدەسەڵات نەگات. لێرەوە لە بری وتوێژکردن لەگەڵ ئیسلامیزمدا و بەشداری پێکردنی لە دەوڵەتدا، دەبێت بە توندی دژی خەبات بکرێت و ئەگەر پێویستیش بوو پەنا بۆ ناچارکردن و زۆری یاسایی ببرێت.

لە ژێر ڕۆشنایی تێبینیەکانی پێشوودا هەنوکە دەتوانین هەڵوێستەکانی هەندێك کارشناسی ئیسلامی (یان باشتر بڵێین) ئیسلامیزم، تاوتوێ بکەین. ئەم کەسانە کە زۆر جار زانینێکی وردیان بۆ دیاردەی ئیسلامیزم بە شێوە جیاواز و ئاڵۆزەکانیەوە هەیە، بەشێوەیەکی بەرجەستە و بەوردبینەوە ئەم دیاردەیە شیدەکەنەوە و تەفسیرێکی هوشیارانەی بۆ دەکەن (کە هەندێکجار خاڵی نیە لە هاودەردی شاراوە و تەنانەت جۆرێك لە خۆشنودی) و بەمشێوەیە کرانەوەیەکی زیهنی و تێگەیشتنێکی شایستە لە خۆیان پیشاندەدەن. لەگەڵ ئەمەشدا هەرچەندە ئەم کەسانە بابەتی

لێکۆڵینەوەی خۆیان بە شێوازێکی زانستی دەناسن، بەڵام بە گشتی دوچاری کەموکوڕی چوارچێوەیەکی تیوری شایستەن بۆ قوڵایی دیاردەکە و ئەنجامگیری و پێشنیارە عەمەلیەکانیان لە فەقیری تێڕوانینە سیاسیەکانیان، زیانی پێدەکەوێت راستیەکەی ئەوەیە ئەم کەسانە تیوریەکی سیاسی شایستەیان بۆ بەئەنجام گەیاندنی کارەکەی خۆیان، لەبەردەستدا نیە. گەرچی ئەمانە لە بارەی پەیوەندیەکانی ئیسلامیزمو مۆدێرنەی سیاسیەوە، هەندێك پرسیار دەهێننە پێشێ و بەدوای رێگەیەکدا بۆ ئاشتکردنەوەی ئەم دوانە دەگەڕێن، بەڵام چەمکی هەمەکی مۆدێرنە — کە ئیسلامیەکانیش بەکاریدەهێنن — بە پێناسەنەکراوی و زۆر ئاڵۆز ماوەتەوە. لە بارەی مۆدێرنەی سیاسیەوە دەبێت بگوترێت ئەم چەمکە بۆ رادەربڕین لە بارەی ئیسلامیزمەوە وەك دیاردەیەکی سیاسی، شتێکی ناچاریە، بەڵام ئەم چەمکە لە کاری ئەم ژمارەیە لە کارشناساندا وون و نەناسراوە.

ئەم کەموکوڕیە دەتوانێت فۆرمی هەڵسەنگاندنە جێی وتوێژ و هەندێکجار ساویلکانەو تەنانەت ترسناکەکان، رونبکاتەوە. بەمشێوەیە هەندێك وا بیر دەکەنەوە کە ئیسلامیزم لەگەڵ مۆدێرنە و دیموکراسیدا گونجاوە. هەندێکی دی بڕوایان وایە ئیسلامیزم دەتوانێت بە مۆدێرنە بگات و بەها دیموکراتیەکان قبوڵ بکات. هەندێکی دی بڕوایانوایە ئیسلامیستەکان دەتوانن تێکەڵ بە گەمەی دیموکراتی بن و ئیسلامیزم لە پارێزگاری عەلمانیەت کەمتر ترسناکە. تەنانەت گروپێك بڕوایان وایە ئیسلامیزم لە بیناکردنەوەی نوخبەکانی رابەری، دەورێکی پۆزەتیڤ دەبینێ و بەشداریکردنی لە پرۆسەی دیموکراتیدا بێ هیچ زەمانەتێك مومکین و تەنانەت پێویستە. هەروەها هەندێکی دی هیوادارن ئیسلامیزم لە ئایندەدا روبکاتە دیموکراسی و ببێت بە هێزێکی دیموکراتی چالاك. ئەم هەڵوێستگرتنە خێرخواز و بەرزەفڕانە، جێی گومان و تەنانەت ساویلکانەن، چونکە خەسڵەتی هەقیقی ئیسلامیزم و لۆژیکە قوڵەکەی ناناسێت. ئیسلامیزم لەبنەڕەتەوە هەم بە مۆدێرنەی سیاسیو ناچاریەکانی نامۆیەو هەم بەو دیموکراسیەی دەرئەنجامی مۆدێرنەی سیاسیە. لێرەوە لەبەرئەوەی ئیسلامیزم سەربەخۆی و بنەماکانی دیموکراسی رەد دەکاتەوە، ناکرێت هیچ بەهایەکی سیاسی تایبەتی و دیموکراتیانەی بۆ دابنرێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەبێ سەرنج لەو خاڵە بدەین کە ئیسلامیزم دەتوانێت بێ ویستی خۆی دەورێکی گرنگ لە گۆڕانی سیاسی جیهانی ئیسلامدا ببینێ. چونکە لە قوڵاییدا ئەم جیهانە دابەشدەکات و فرەیی و پلۆرالیزمی دەخاتە ناو. رێك وەك چۆن پرۆتستانیزم لە سەدەی شانزەهەمدا ئەوروپای مەسیحی کەرتکرد و هەمەڕەنگی پێبەخشی. بەمشێوەیە ئیسلامیزم بەشداری لە سەقامگیری دوو رەهەندی لە جیهانێکدا دەکات کە بە نەریت یەك رەهەندە. ئەم دوو رەهەندیە لە بواری دینیدا دەتوانێت بە تێپەڕبوونی کات جیابونەوەی نێوان دەوڵەت و دین و پاشان نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا بە دوای خۆیدا بهێنێ. دیارە دەشێت ئەم پرۆسەیە هاوکاتی ناچارکردن و توندوتیژی بێت و جەنگی ناوخۆی کەمتازۆر درێژخایەن و توند بە دوای خۆیدا بهێنێت، رێك بەو شێوەیەی کە ئەوروپا لە سەدەی شانزەهەم و حەڤدەهەمدا جەنگە مەزهەبیە ترسناکەکانی تاقیکردەوە.

لێرەوە ئیسلامیزم دەتوانێت لە ڕێگەی چاوەڕوان نەکراو و بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ، لە پەیدابوونی مۆدێرنەدا بەشداری بکات. بەڵێ ئیسلامیزم لەسەرو خواستی بەڕپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامیەوە لە راستیدا مەسەلەی پێویستی قوڵ بە دەوڵەت و خواستی مۆدێرنەی سیاسی پێشاندەدات. بەمشێوەیە ئەوەی ئیسلام پێش هەموو شتێك لێی دەترسێت، واتە دابەشبوونی نەتەوەی موسڵمان و جیاوازی لەناو خودی نەتەوەدا، دەتوانێت گۆڕانێکی سیاسی ریشەیی بەدوای خۆیدا بهێنێ و هێواش هێواش بەرەو دەوڵەتی مۆدێرن و دیموکراسی رێ بکات. هەر لەبەر ئەمەشە وڵاتێکی وەك جەزائیر لەم ڕێگەیەدا کە تاقیکردنەوەیەکی سەختی بەجێهێشتووە، بێگومان لەو وڵاتانەی کە لە دیاردەی ئیسلامیزم لە ئەماندا بوون و یان کەمتر کاری تێکردوون، پێشکەوتوترە.

مۆدێرنە سیاسی لە جیهانی ئیسلامدا روانگەیەکی دوور دەستە کە بەدیهاتنی بەهۆی پەیوەندی تەنگاوتەنگی دین و دەوڵەتەوە، کێشە ئامێزە. لێرەشدا وەك هەر جێگەیەکی دی مۆدێرنە دەرئەنجامی کۆمەڵێك گۆڕانی هەنگاو بە هەنگاو دەبێت کە زەمەن و هێزێکی زۆری دەوێت، زۆربەی وڵاتە ئیسلامیەکان کە سەردەمێکی زۆر بەسەر سەربەخۆییاندا تێناپەڕێت لەسەرەتای ئەم پرۆسەیەدان و هەندێکیان هێشتا پێیان نەخستۆتە ناو ئەم ڕێگەیەوە. بەڵێ لەلایەکەوە نەبوونی مۆدێرنەی سیاسی یان ئەستەمی بەدیهاتنی، گەشەکردن و پەرەسەندنی ئیسلامیزم روندەکاتەوە و لەلایەکی دیەوە دەکرێ بگوترێت ئیسلامیزم رێگری گۆڕانی سیاسی ئەم وڵاتانەیە.

پێدەچێت لەم روانگەیەوە ئەزمونی فەرەنسا بتوانێت سودی هەبێت. چونکە ئەم وڵاتە بەدرێژایی سەدەیەك رژێمێکی تاقیکردەوە کە لەسەر بناغەی رێکەوتنی دەوڵەت و دین دامەزرابوو. لەم قۆناغەدا دەوڵەت سەرەڕای کۆنترۆڵکردنی مەزهەب و کەمکردنەوەی دەسەلاتە سیاسیەکەی، هەندێك پەیوەندی خۆی لەگەڵ مەزهەبدا هێشتەوە. هەرچەندە کاسۆلیزم چیدی بە دینی فەرمی دەوڵەت نەدەژمێررا (جگە لە قۆناغی کورتی گەڕانەوەی سەڵتەنەت) بەلاّم لە ژێر سەرپەرشتی دەوڵەتدا بوو کە پێداویستیە ئابوریەکانی دەستەبەر دەکرد و لە بەرامبەر ئەمەشدا سودی لە پشتێوانیەکەی دەگرت. بارودۆخی هەنوکەی وڵاتە ئیسلامیەکان کە ئیسلام تیایدا دینی فەرمیە، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ بارودۆخی ئەو قۆناغەی فەڕەنسادا نیە. فەرەنسا پاش گۆڕانێکی درێژخایەنی سەدساڵە، توانی جیابونەوەی دەوڵەت و دین بکاتە شتێکی پراکتیکی. دەکرێت ئەم رێگەیە لە جیهانی ئیسلامیشدا ببڕێت و ڕێگەچارەی جۆراوجۆری وەك بێلایەنی دینی دەوڵەت یان پەیوەندی رێکەوتنئاسای نێوان دەوڵەت و ئیسلام یان جیابونەوەی هەمیشەییان، ممکین بێت. لە ڕاستیدا گرنگ ئەوەیە دەوڵەت رەهەندێکی دینی نەبێت و ئیسلامیش چیدی دینی دەوڵەتی نەبێت. دیارە کارێکی وا پێویستی بەوەیە سیستەمی یاسارێژی لە دەسەلاّتی یاساکانی شەرع رزگاری بێت و یاسا ئیسلامیەکان لە مەسەلە سزادان و مەدەنیەکاندا (بە تایبەتی لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندی بە خێزانەوە هەیە) بەکار نەهێنرێت. بەلاّم دەشێت پەیوەندیگەلێك لە نێوان دەوڵەت و ئیسلامدا هەبێت، لەوانە ئیسلام کۆمەکێکی شایستە وەربگرێت و فێرکردنی ئازادانەی دابین

بکرێت – دیاره به مەرجی ئەوەی ئازادی دینی رەچاو بکرێت.

بێگومان مۆدێرنەی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیشدا وەك فەرەنسا، دەرئەنجامی پرۆسەیەکی درێژخایەن و سەخت دەبێت. گەرچی ئەم پرۆسەیە ئێستا لە زوربەی ولاّتەکاندا دەستی پێکردووە، بەلاّم هێشتا لە قۆناغە سەرەتاییەکانی خۆیدایە و لە راستیدا بریتیە لە بەدیهاتنی جیابونەوەی پێشکەوتوخوازانەی دەوڵەت و کۆمەڵگا، بۆ ئەوەی جیاکارییەکی رون لە نێوان بواری گشتی و بواری تایبەتیدا جێگیر بێت و ئەگەری پەیدابوونی هاولاّتی راستەقینە و ئازادیە واقعیەکان دەستەبەر بێت. بەلاّم بۆ ئەوەی مۆدێرنەی سیاسی کامڵ بێت، دەبێت جیابونەوەی نێوان دەوڵەت و ئیسلام واتە سەقامگیربوونی عەلمانیەتیش ببیّ بە شتێکی عەمەلی. هەرچەندە ئەم جیابونەوەیە نامومکین نیە، بەلاّم تەنها هەنگاو بە هەنگاو بەدەست دێت و دەکرێت ئەمەش هەم بە دەرئەنجامی مۆدێرنەی سیاسی و هەم بە نیشانەی بە ئەنجام گەیاندنی، دابنێین.

## سەرچاوە

بەشی حەوتەمی کتێبی: مۆریس باریی، مدرنیته سیاسی – ت: عبدالوهاب احمدی – تهران – نشر اگه – چاپی یەکەم 1383.

# فەزا پیرۆزەکان

له فارسییەوە: سەروەر عومەر محەمەد

شوێنێکی پیرۆز، بەر له هەموو شتێك شوێنێکی سنوردار و دیاریکراوه، فەزایەکه که له فەزاکانی دیکه جیاوازه. سروتەکانی پەرستن که کەسێك به جێدەهێنێت، ڕوو لەو شوێنه پیرۆزیی شوێنەکه دیاریدەکات و ئەو شوێنه له فەزا باوەکانی دیکه جیادەکاتەوه. بۆ تێگەیشتن له تایبەتمەندی ئەم شوێنانه *Jonathan Z.smith* گوزارەیەکی جوانی له فەزای پیرۆز کردووه، وەکو "زەرەبینێکی چڕکەرەوه". شوێنێکی پیرۆز، باری سەرنج لەسەر شێوەکان، شتەکان و هەڵسوکەوتەکانی ناوی چڕ دەکاتەوه و ئەوان وەکو کۆمەڵه شتێك وێنه دەکێشێت که هەڵگری واتای ئاینین. ئەم سیمبولانه، بەشه سەرەکییەکانی واقیعییەت دەردەبڕن. وەختێك کۆمەڵگایەکی ئاینی تەماشای ئەو شتانه دەکات، ژیانێکی گونجاو لەگەڵ ئەو دیدگایەدا پێناسه دەکات و بۆ دەستڕاگەیشتن به میانەی نێوان دونیای مرۆیی و واقیعیەته ئیلاهییەکان نێوندگیرێك دەدۆزێتەوه.

بەهەمان شێوەی فەزا باوەکانی دیکه، فەزای پیرۆز زۆر شوێنی جیاواز دەگرێتەوه. فەزای پیرۆز، ئەو شوێنانه دەگرێتەوه که بۆ مەبەستی ئاینی دروستکراون، بۆ نموونه پەرستگاکان یاخود *Temenoi*، و ئەو شوێنانەی که بەشێوەی ئاینی تەفسیر کراون، وەکو چیاکان یاخود ڕووبارەکان، فەزای پیرۆز ئەو فەزایانه دەگرێتەوه که بەشێوەی فیزیایی دەتوانین بچینه ناویانەوه، وەکو سیمای دەرەکی زەوییەکی پیرۆز، بەشێوەیەکی وێنایی وەکو پێکهاتەی ناوەوەی جەسته له حاڵەتی وەرزشکردندا (*Tantric yoga*) یا به شێوەی بینین، وەکو فەزای ماندا لایەك. فەزای پیرۆز تەنانەت فەزای نا پیرۆزیش ڕەت ناکەتەوه، چونکه هەمان شوێن له هەلومەرج و مەوقیعیەتی جیاوازدا دەتوانێت هەم پیرۆز و هەم نا پیرۆز بێت. بۆ نموونه له کولتوری دێرینی *Maori* دا، ئاودەست سنووری نێوان دونیای زیندووەکان و مردووەکان پیشان دەدات. هاوشێوەی ئەو، شوێنی بەرپاکردنی

سرووت و مەراسیمەکانە، جێگەیەك کە ڕۆحێکی نەخوازراو دەکرێت بکرێتە دەرەوە و یاخود پشتیوانی ڕۆحەکان بەدەست بهێنێت. بە مپێیە، ئەم فەزایە هەروا کە ئاودەستە، پیرۆزیشە. بە هەمان شێوە فەزایەکی کارکردییە، بەڵام لە دروستکردنیدا، نەخشەکێشان و ئادابەکانی ناویدا. دەکرێت واتای ئاینیشی پێدرابێت. مەزارێك، کە لە چەند هەلومەرجێکی تایبەتیدا ناوچەی چڕبوونەوەی چالاکی دینییە، دەکرێت لە چەند کاتێکی دیکەدا نادیدە بگیرێت. بە کورتی شوێنێکی پیرۆز کاتێك بە دیدێت، کە وەکو شوێنێکی پیرۆز تێیبگەین. ئەو تیۆرەی کە فەزا پیرۆزەکان بە عەدەسەیەك دەچوێنێت، ئەو واتایە دەگەیەنێت کە شوێنەکان پیرۆزن لەبەرئەوەی کارکردێکی ئاینی پێشکەش دەکەن، نەك لەبەرئەوەی کە خەسڵەتگەلێکی فیزیایی سەیر و سەمەرە یا جوانی ناسانەیان هەیە. بیروباوەڕێك کە لەلایەن فریدریش شلایرماخەرەوە خرایە ڕوو لە لایەن ردلف ئاتووەوە فراوان کرا، ئیدراکی پیرۆزی بە هەستی ئاینییەوە دەبەستێتەوە. بەم پێیە، لە بنەما و لە بناغەدا، شوێنە پیرۆزەکان دەبێت ئەو هێزەیان هەبێت کە کاردانەوەیەکی کاریگەر (لە مرۆڤدا) دروست بکەن و زۆرێك لە شوێنەپیرۆزەکان بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە ئەم خەسڵەتەیان هەیە، چیا پیرۆزەکانی چین، کلێسا گەورەکانی گوتیك لە ئەوروپا و سەرچاوەی ڕووبارە پیرۆزەکانی هیندییەکان، خاوەنی یەك جوانی و هێزی کاریگەرن. بەڵام بونی ئەم چۆنایەتیانە بۆ شوێن (بۆ شوێنی پیرۆز) ناچارییەن. زۆرێك لە شوێنە پیرۆزەکان، تەنانەت ئەو جێگایانەی کە حاڵەتێکی سەنترالّیان لە ژیانی ئاینی کۆمەڵگادا هەیە، بەلای کەسانێکەوە کە لە دەرەوەی ئەو بیروباوەڕەن، سەرنجڕاکێش نین و هەستەکانی ئەو نابزوێنن. شێوەی شوێن، بەبێ زانینی ئەوەی کە ئەم شوێنە لەسەر چ شتێك و، چۆن چۆنی مانا دەدات، دەکرێت هەرگیز هیچ جۆرە هەستێکی ئاینی نەداتە مرۆڤ. بۆ نمونە *Rddhipur*، مەزارگای سەرەکی ماهانوبەکانە کە بە دەستەیەك لە *Krsnaite maharashtrian* دێنە ئەژمار. ئێرە شوێنێکە کە خودا بەشێوەی پەیکەری (مجسم) (*Gundam Ran*) تیا دەژیا. جێگایەك کە ئەو هێزی خوداوەندی دابەزاندو کردەوە گەلێکی پیشاندا کە سروشتی خوداوەندیی ئاشکراکرد. ئێرە شوێنێکە *cakradhar* بەرجەستەیەکی دیکەی خوداوەندەکە، سەردانی ئەوێی کردووە. کەسێك کە کۆمەڵگای *Mahanubhar* ی دامەزراندووە. بەڵام خودی *Rddhipur* تەواو نا ئاوارتەیە و ئەو شوێنانەی کە *Gundam Ranl* کارەکانی خۆی تێدا ئەنجام دەدا، تەنها لەلایەن نیشانە بەردین و بچووکەکانەوە پیشان دەدرێت. لەوێدا هیچ شتێك کە هەستی شکۆمەندی یا راز ئامێزی بەهێز بکات، بوونی نییەو هێشتا گوندەکە بەهۆی سنووربەندییە ئاینییەکانەوە، جێگەی ڕێز و پاراستنە. ئەم شوێنە لە ڕووی ستاتیکیەوە قووڵ و فراوان نییە، بەڵام بەم حاڵەشەوە لە ڕووی ئاینییەوە بەهێز و کاریگەرە.

## دامەزراندنی فەزا پیرۆزەکان

تایبەتمەندبونی فەزا پیرۆزەکانو گەڕانەوەیان بۆ باڵاترین چەمکەکانی کولتورێك، هەردووکیان بەزۆری بەم بیرو باوەڕەوە بەیان دەکرێن کە فەزا پیرۆزەکان، شتێکی بڕیار لەسەر دراو نین.

شوێنێکی پیرۆز بەشێوەیەکی جەوهەری نەك تەنها بەشێوەی وەرگرتن، لە چوار دەوری خۆی جیاوازە لەبەرئەوەی شوێنێك نییە تەواو

هەڵبژێردراوو بەدیهێنراوی مرۆڤ بێت. سەرەڕای ئەمە، چەمکی شوێنی پیرۆز لە کەسایەتی تایبەت بە خۆیدا، شێوەیەکی زەمینی پەیدا کردووە، کەسایەتیەکی دیاریکراو کە کرداری مرۆڤ بە تەنها ناتوانێت ئەو بوونەی پێببەخشێت.

لە کۆمەڵگا دێرینەکاندا، بەگشتی تەواوی زەمینی شارستانییەتێك، پیرۆزە و زۆربەی جار ئەم پیرۆزییە لە گێڕانەوەکانی (پەیوەست بە) دامەزراندنی ئەو شارستانییەتەدا بەیان دەکرێت. هەندێك کات ئەم زەمینە بەشێوەیەکی تایبەت بەدیهێنراوە. *Kojiki* و *Nihongi* بیروباوەڕەکانی سەردەمانی *Kami* یان پاراستووە، وەختێك کە ژاپۆن و شێوازی ژیان تیایدا بونیاد نرا.

لەسەر بنەمای ئەم دەقانە، دوو خوداوەندی *Izanagi* و *Izanami* لەسەر ئاوەکانی سەر زەوی کە هێشتا شێوەیان نەگرتبوو، بیریانکردەوەو نێزەیەکی گەوهەر نیشانیان ڕۆکردە نێو ئۆقیانوسەکانەوە، لە فرمێسکێك کە لەو نێزەیەوە تکا، یەکەمین دوورگەی ژاپۆن دروستبوو. چەندێك دواتر، لەم دوو خوداوەندە خوداوەندگەلێکی دیکە لە دایك بوون. لە نێویاندا *Amaterasu* خوداوەندی خۆر بوو کە نەوەکانی ئەو بەسەر ژاپۆندا فەرمانڕەواییان دەکرد. بەم پێیە، ژاپۆن لە تەواوی جێگاکانی دیکە جیاوازە، یەکەمین زەمینە، زەمینێك کە لەلایەن خوداکانەوە ژیانی تیا بونیادنراوە. لەلایەکی دیەوە دەکرێت زەمینێکی وەکو سەرزەمینی ئیسرائیل، لەبەرئەوەی کە لەلایەن خودایەکەوە بەخشراوە، پیرۆز بێت و یان دەکرێت زەمینێك لەلایەن ڕێو ڕەسمە ئاینییەکانەوە بونیاد بنرێت. لەسەر بنەمای باوەڕێکی کۆنی هیندی، لە *Satapatha* زەمینێك کە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری *Brahmana* وە، بۆ نیشتەجێ بوونی براهماکان نەگونجاو بوو. وەختێك ئاگری قوربانی لە ڕوبارەکە پەڕێنرایەوە و لەو سەرزەمینەدا جێگیر بوو، ئەو جێگایە بۆ ژیانی براهماکان گونجێنرا.

شوێن یا بینایەکی پیرۆز لە نێو زەمینێکی پیرۆزدا، بە جۆرێکی هاوشێوە خاوەنی خەسڵەتێکە (کەسایەتییەك، چەمکێك یا ماهییەتێك) کە ئەو شوێنە جیادەکاتەوە. ڕێوڕەسمی پەرستگاکان و مەزارە گەورەکانی هیند باس لەوە دەکات کە ئەم پەرستگایانە بەشێوەیەکی خودی نەك ڕێژەیی، پیرۆزن. پیرۆزترین ئەو پەیکەرانەی باس لە شیوا دەکەن، *Svayambhulingas*ەکانن. پەیکەرەکانی لەمەڕ شیوا کاری مرۆڤ نین بەڵکو خودی ئاشکراکەری ئەو خوداوەندەن، بە هەمان شێوە، پیرۆزترین شوێنەکانی خوداوەندەکە، *Pitha*کانن، ئەو جێگایانەی کە بەشەکانی جەستەی ئەو خوداوەندە پاش خۆکوشتن و بڕینەوە، کەوتنە سەرزەوی. لە هەندێك بواری دیکەدا، نەوەك شتێك بەڵکو تەنها و تەنها خودی زەمین، پەرستنی خودایەك لەناوچەیەکدا دیاری دەکات. لەسەر بنەمای گێڕانەوەکانی پەیوەست بەو پەرستگایەی کەوتۆتە ناو *srirangam*وە، ئەم پەرستگایە لە بەهەشتدا دروستکرا. لەوێوە بوو کە بۆ سەر زەوی هێنرا بۆ شاری *Rama*، پاشان *Rama* ئەوی دایە دەست دیوێکی پارێزکار کە دەیویست لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە بۆ ماڵی خۆی لە سریلانکا، بەهەرحاڵ، دێوەکە پەرستگاکەی لە نزیك تەنکاوی ڕووباری *kaveri* (*cauvery*) لەسەر زەوی داناو وەختێك هەوڵیدا دووبارە بەرزی بکاتەوە، نەیتوانی بیجوڵێنێت. پاشان خودای پەرستگاکە لە بەردەمیدا دەرکەوت و پێی وت کە ڕووبارەکە سەرکێشییەکی زۆر پیشان دەدات بۆ ئەوەی کە پەرستگاکە لە

كەنارەكانی خۆیدا بهێڵێتەوەو ئەو خودایەش حەزی دەكرد كە لەوێدا بمێنێتەوە.

(*Shulman, 1980 p.49*) بەم پێیە جێگەی جێگیر بوونی ئێستای پەرستگاكە لەلایەن هیچ دێو یاخود مرۆڤێكەوە نەبوو، بەڵكو ئەو خودایە ئەوێی هەڵبژارد.

دەكرێت خودایان، پیرۆزێتی تایبەتی شوێنێك، لەلایەن نیشانەكانیشەوە پیشان بدەن. زۆرجار گیانداران وەكو پەیامگەیەنەرانی هەڵبژێردراوی خودایی، كاری خۆیان ئەنجام دەدەن، بەم پێیە بۆ نموونە شاری *Tenochititlan*ی ئازتەكەكان، لە شوێنێكدا بونیاد نرابوو كە هەڵۆیەك لەسەر كاكتۆسێكی شكۆفەكردوو، نیشتۆتەوەو *Aeneas* شوێن بەرازێك كەوت تا ئەو جێگەی كە تیایدا بێچووەكانی لەدایك بوون و لەوێدا (شاری *Albalonga*)ی بونیادنا. گەڕان بۆ ئەم نیشانانە دەكرێت پەرەسێنێ بۆ زانستی غەیب گۆیی (فاڵگیری).

غەیب گۆیی لەڕێگەی خاكەوە لای چینییەكان، تەواو یەكێكە لەو هەوڵانە بۆ جیاكردنەوەی چۆنێتییە مەعقول (بابەتییەكان)ی شوێنێك، بەهۆی موتالاكردنی ناوچەی دیاری زەویو هاوسەنگی ئاوەكان، بایەكان و ڕەگەزەكانی دیكەوەیە.

لە هەندێك بواری دیكەدا، شوێنێك بەهۆی ئەو روداوە ئاینیانەی تیایدا ڕویداوە، پیرۆز دەبێت. لەسەردەمانی محەمەدی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت)، ئۆرشەلیم شوێنێكی پیرۆز بووە بۆ ئیسلام. گەرچی باوەڕگەلێكی زۆر بەم شارەوە پەیوەست بوو. بەلاّم گەشتی (میعراجی) پێغەمبەر بوو كە لەسەروو هەموو ئەم باوەڕانەوە، پیرۆزێتی ئەم شارەی دروستكرد. شەوێك محەمەدی پێغەمبەر بۆ ئۆرشەلیم و بەردی سەر كێوی ئەم پەرستگایە براو لەوێشەوە لە ڕێگەی ئاسمانەكانەوە بەرەو ئاستانەی ڕاستەقینەی خوداوەند. مزگەوتی قبە الصخرە و دانانی ئۆرشەلیم بە زیارەتگایەك، هەردووكیان ڕاگەیەنەر و بەهێزكەری پیرۆزێتی ئەم شارەن. ئەم پیرۆزییە بە دۆزینەوەی نیشانەی گەشتەكەی محەمەدی پێغەمبەر – جێ پێی ئەو لەسەر بەردەكە، شوێنەواری زینی (ئەسپ)ەكەی و تەنانەت جێگایەك لەسەر بەردەكە كە جوبرائیل بەر لە بەرزبوونەوەی پێغەمبەر سازی كردبوو – پلەیەكی بالاّتری بەدەستهێناو پیرۆزێتی ئەم شارە دیسان بەهێزتربوو. بە باسكردنی ڕووداوە گرنگە ئاینییەكانی دیكەی پەیوەست بەو بابەتەوە وەكو چیرۆكەكانی ئیبراهیم و ئیسحاق، *melchizedek* پادشای *salem* و پەیژەی یەعقوب لە میانەی بەسەرهاتەكانی تەورات و غەیری تەوراتدا كە لەوێدا ڕوویانداوە، ڕۆشن دەبێتەوە كە شوێنێكی پیرۆز دەتوانێت باوەڕگەلی جۆراوجۆر بەدەست بخات و بەم پێیە تەنانەت بەشێوەیەكی بەهێزتر پیرۆز ببێت.

دەكرێت شوێنگەلێكیش بەهۆی بەرهەمی كەسانی پیرۆزەوە، پیرۆزبن. گڵكۆیەك دەكرێت شوێنێك پیرۆز بكات، لەبەرئەوەی گڵكۆیەك نەوەك تەنها هەر خاڵی جیابوونەوەی زیندووەكان لە مردووەكان دیاریدەكات، بەڵكو خاڵی پەیوەندیشیان دەستنیشان دەكات. بۆ نموونە، لە مەسیحیەتی پێشكەوتوودا، گڵكۆی شەهیدان بەهۆی پیرۆزی كەسی كۆچكردووەوە، بوونە شوێنگەلێك بۆ سرووتی عەشای ڕەبانی. پاشان لە سەرەتای سەدەی شەشەمدا، نووسراوو بەرهەمی قەسیدەكان، بوونە خاڵی چڕ بوونەوەی سرووتەكانی پیرۆزكردنی كەنیسایەك. ئەم دەقانە، كەنیسە و ئەو جێگایانەیان پیرۆز دەكرد كە لێی دادەنران. سەرئەنجام شێوەی زەوییەك دەكرێت

ماناو پیرۆزی بەو شوێنە ببەخشێت. لە کلتورە جیاوازەکاندا شوێنە جۆراو جۆرەکان ڕاگەیەنەری ئامادەگی خوداکانن. بەهەمان شێوە کە باسمانکرد، زەوی ژاپۆن لەبەرئەوە پیرۆزە کە لەلایەن *Kami*یەوە بەدیهێنراوەو دەپارێزرێت. لە ژاپۆندا چەندین شوێن هەیە کە *Kami* تیایدا بە شێوەی ئاشکرا ئامادەیە. بۆ نموونە چیاکان، لە چیای فۆجییەوە (بیگرە) تا گردەکانی پەرستگا ناوچەییەکان، دەکرێت شوێنەواری ئامادەگی *Kami* بن. لە هیند ڕووبارەکانو شوێنەکانی پێکگەیشتنی دوو ڕووبار، پیرۆزن. لەبەرئەوەی ئاوە خاوێنکەرەوەکانو ڕووبارە پێکگەیشتووەکان، پیشاندەری ئەو شوێنانەن کە خودایان لەوێدا ئامادەن و دەستیان پێدەگات. لەم بوارانەدا شێوەی زەوی ئاماژە بە ماناگەلێك دەکات کە سەرنج بەرەو پیرۆزێتی زەوی ڕادەکێشێت.

لە سەرەتای وتارەکەدا، ئاماژەم بەوەدا کە شوێنە پیرۆزەکان بڕیار لەسەر دراونین. بەڵام شوێنگەلێك بۆ چالاکییە ئاینییەکان بوونیان هەیە، ڕێك لەبەرئەوەی بڕیار لەسەر دراون. ئەگەر پاڵنەر بۆ بونیادنانی شوێنە پیرۆزەکان حاڵەتێکی جیهانگیری هەیە، ئەوا ئارەزوو بۆ سنوردانەنان بۆ خوداش هەر بەو شێوەیەیە.

ڕێوڕەسمی نزای هندییەکان، وەکو ڕێوڕەسمە ئاینییەکانی دیکە، بەرەو دوو لا رادەکێشرێت، یەکیان بەرەو لای خودایانێك کە لە شوێنگەلی تایبەتدان و ئەوی دیکە بەرەو لای بەدرۆخستنەوەی ئەوەی کە دەبێت لە شوێنێکی دیکەدا بەدوای ئلوهییەتدا بگەڕێین. "بۆچی بەردەوام لە مزگەوتدا پەرستش بکەین و بە زەحمەت بڕۆین بۆ مەککە تا خودا ببینین؟ ئایا خودا لە مزگەوتدا دەژی؟ ئایا *Pam* لە بتەکان و شوێنە پیرۆزەکاندا بوونی هەیە؟" *Kabir* ئەم پرسیارانە دەهێنێتە ئاراوە.

تەلارسازی مزگەوت مشتومڕی نێوان بە پیرۆزکردنی جێگایەك و ڕەتکردنەوەی هەر شێوە سنوورداربوونێکی ئامادەیی خوداوەند، دەخاتە ڕوو. مزگەوت، هەمان بەهاکانی جۆرەکانی دیکەی شوێنە پیرۆزەکانی هەیە. ناوەوەی (فەزاکە) بەرەو ڕووی ناوەندێکی پیرۆز ئاڕاستە کراوە. میحراب، پەرستش ڕووەو شاری پیرۆزی مەککە ئاڕاستە دەکات. فەزای مزگەوت لە باقی فەزاکانی دیکە جیاکراوەتەوە، کەسەکان دەبێت پێڵاوەکانیان لەبەردەمی دەرگای هاتنە ژوورەوەدا دابکەنن، لەناو چوارچێوەی مزگەوتدا، پیرۆزترین شوێن، پەرستگا، (حەرەم) بە جوانی لە نێو حەوشەوە دیارە. هەندێك لە مزگەوتەکان شوێنی زیارەتن. چونکە شوێنی بەخاکسپاردنی پیاوان و ژنانی پیرۆزن، ئەو کەسانەی کە هێزی ڕۆحیان بەم شوێنانە بەخشیوە. بەرجەستەترینی ئەم مزگەوتانە، مزگەوتێکە لە مەدینە کە لەسەر گڵکۆی پەیامبەر دورستکراوە.

لە هەمانحاڵدا تەلارسازی دەکرێت بەشێوەیەکی تەواو جیاواز ڕاڤە بکرێت، وەکو ڕەتکردنەوەی یا بەتاڵکردنەوەی فەزای پیرۆز. کارکردی سەرەکی مزگەوت فەزایەکە بۆ پەرستشی گشتی. لە ئیسلامدا مزگەوت لەبەرئەوە گرنگی هەیە کە کۆمەڵێك کەس لەوێدا کۆدەبنەوە و پەرستش ئەنجام دەدەن، نەوەك لەبەر خودی شوێنەکە. گێڕانەوەیەکی باو دەڵێت "هەموو دونیا مزگەوتە، شوێنێك بۆ پەرستش" لەسەر زەمینە ئیسلامییەکاندا، زۆرجار مزگەوت بە ئاسانی لەو بینایانەی کە خاوەن پلەیەکی نزمترن، جیاناکرێتەوە و یاخود وەکو شوێنێکی پیرۆز، سەرنج ڕاناکێشێت. تەنانەت گومەز کە بەشێوەیەکی

نەوعی بەسەر بینای مزگەوتەوەیە و کەوانەی ئاسمان (بەهەشت) بەیاد دەهێنێتەوە، مانایەکی گشتی هەیە کە ئاماژەیە بۆ هێز یاخود شوێنی کۆبوونەوە دەکات و بە ناچار دەستنیشانی شوێنێکی پیرۆز ناکات. ئەم هێماگەراییەی ئاسمان لە نێو مزگەوتدا گرنگی پێنادرێت. هەروەها مانای پەرستنیش ناگەیەنێت. لە حاڵێکدا کە پەرستگا بەرەو ڕووی مەککە ئاڕاستەکراوە، بەشەکانی دیکەی بیناکە، بە شێوەیەکی خودی هیچ جۆرە پێکهاتەیەکی ئاڕاستەدار یا نێوەندییان نییە. تەنانەت میحراب کە دەکرێت شوێنێکی پیرۆزی تایبەت بێت، بە چۆڵی دەهێڵرێتەوە، کە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ئەو پەروەردگارەی کە دەپەرسترێت، لەوێدا یا لە هیچ شوێنێکی دیکەدا جێگیر نەبووە. هەموو ئەمانە بەم تێڕوانینە ئیسلامییەوە پەیوەستە کە ئەگەرچی خوداوەند بەدیهێنەری دونیایە، بەڵام خۆی لەسەر و ئەو دونیایەوەیە نەوەك لە نێویدا. مزگەوت بەپێی پێناسەکەمان بە فەزایەکی پیرۆز دێتە ئەژمار کە لەم پێناسەیەدا، فەزای پیرۆز بەشوێنێك بۆ پەرستش و شوێنێکی بەهادار ئەژمار دەکرێت. بەڵام باس لە فەزایەکی پڕمانا دەکات لەبەرئەوەی نکولی لە بەهانەرێتییەکانی شوێنە پیرۆزەکان دەکات. نکولی گەلێکی هاوشێوە دەربارەی بەشوێنکردن (خودا) لە تەلارسازی پرۆتستاندا هەیە، بەتایبەت لە "شێوازی سادە"ی پرۆتستاندا. بۆ نمونە لە دەورانی تازەگەری لە هۆڵەندادا، کەنیسەکانی گوتیکی مەزن تێك نەدران، بەڵکو وەکو چەند شوێنێك بۆ پەرستشی دەستە جەمعی و ئامۆژگاری نوێ کرانەوە.

ئەو پەیکەرانەی بۆ جوانکاری و ڕازاندنەوە دانرابوون لابران، شووشە ڕوونەکان جێگەی شووشە ڕەنگاو ڕەنگەکانیان گرتەوە، میحرابی بەرز، لابراو جێگەی قەشە بە کورسی پڕکرایەوە. بە کورتی تەواوی نیشانە بەرچاوەکانی پیرۆزی جێگایەکی بەتایبەت، لابران. تەلارسازی، حاڵەتگەلێکی ئیجابیشی هێنایە کایەوە. بەڵام حاڵەتگەلێك کە دووبارە پیرۆزێتی لە جێگایەکی دیکە دادەنا. مینبەرێکی بەرز لە نێوەڕاستدا دانراو بوویە خاڵی سەرنج، بەڵام خودی مینبەر جێگای هێز یا ئامادەیی ئیلاهی نەبوو، بەڵکو ئاماژەی بە پیرۆزێتی گوتاری خوداوەند دەکرد کە لەوێدا دەگوتراو دەخوێندرایەوە. ئەم کەنیسایانە شوێنگەلێکی پیرۆزن بەهۆی ئەوەی کە نکوڵی گەلێکی بەرچاون لەسەر ئەوەی کە هێماگەرایی فەزا، هۆکاری (گواستنەوە)ی پیرۆزێتی خوداوەندە بۆ شوێن.

## کارکردەکانی فەزای پیرۆز

ئەو هێمایانەی بە شوێنێك مانا دەبەخشن، بۆ ئەو زەمینە ئاینییە دەگەڕێنەوە کە نەتەوەیەك تیایدا دەژی. ئەم بەشە، لەو ڕێگایانە دەکۆڵێتەوە کە بە هۆیانەوە فەزای پیرۆز هەوڵی جێگیرکردنی ئەو زەمینەیە و بەدیهێنانی کاریگەری هاوتا لە نێوان جیهانە ئیلاهی و ئینسانییەکاندا دەدات. بەتایبەتی، سێ ڕۆڵی فەزای پیرۆز گرنگن، لەبەرئەوەی ئەوانە لە سیستەمە ئاینییەکاندا بەڕاستی دەزانرێن و بۆ مەبەستەکانی (ئەو سیستەمانە) بە کاروبارێکی بناغەیی دێنە ئەژمار. یەکەم، فەزای پیرۆز، هۆکارێکە بۆ پەیوەندی لەگەڵ خودایان یاخود نزیك بوونەوە لێیان . دووەم، فەزای پیرۆز شوێنێکی (پیشاندەری) هێزی ئیلاهییە و سێهەم، وێنەیەکی قابیلی بینین بۆ دنیا بینن و

لێرەوە شێوەیەك بەو دنیایە و ڕێكخستنێكیش بەدانیشتوانی دەبەخشێت.

## شوێنەكانی پەیوەندی

فەزا پیرۆزەكان بەر لە هەموو شتێك شوێنگەلێكن بۆ پەیوەندی لەگەڵ خوداوەندا. شوێنگەلێك كە خەڵكی بۆ دیداری خودایان بۆ ئەوێ دەڕۆن. ئەم كاركردە بە زۆری لەلایەن هێماگەلێكەوە بەیان دەكرێت كە پیشاندەری پەیوەندی نێوان دونیای ئینسانەكان و قەڵەمڕەوە بەرزترەكانن. وەها هێماگەلێك دەكرێت ئەو ستوونانە بن كە لە زەوییەوە بەرەو ئاسمانی باڵا هەڵچوون. وەك كێوەكان، درەختەكان، گوریسەكان، ستوونەكان و كۆڵەكەكان. بۆ نموونە ئەو پەرستگایانەی كەوتوونەتە باكوری هیندستانەوە، بواری ئاسمان كە بەهۆی ***Amrtakalasa*** (گۆزەی ئیكسیری نەمری)ەوە لە سەرووی پەرستگاكەوە دەردەكەوێت، بە ڕووی زەوییەوە پەیوەست دەكات. قوچەكەكانی ئەم پەرستگایە دووبارە دروستكردنەوەی كێوەكانن، كە شوێنگەلێكن بۆ نیشتەجێبوونی خوداكان. بۆ نموونە پەرستگای ***Kailasa*** نەتەنها ناوی چیایەكی هەڵگرتووە كە شیوا تیایدا نیشتەجێیە، بەڵكو تەنانەت وێنەی لایەكی ڕووخساری ئەویشی پێوەیە. بەڵام هێماگەلێك كە ڕوونكەرەوەی پێكگەیشتنی قەڵەمڕەوەكانن دەكرێت شێوەگەلی دیكەشیان هەبێت. لە كەنیسەكانی بیزانسیدا، هەنگاونان لە دەرگای چوونە ژوورەوەوە بەرەو لای میحراب، جووڵەیەكە لە دونیای ئینسانییەوە بەرەو دونیای ئیلاهی. ڕێڕەوی نێوان ئەم دوو بوارە، ڕیزی ستوونەكان، پەردەی نێوان پەرستگاو جێگای قەشەیە. وەختێك قەشەكان لە دەرگاكانی ڕیزە ستوونەكانەوە تێدەپەڕن، دەبن بەو فریشتانەی لە نێوان جیهانەكاندا دەجووڵێن. خودی پەیكەرەكان، توانای بینینی ئاسمان فەراهەم دەكەن. بەشێوەیەكی گشتی، ***Iconostasis*** "هێما"یەك یاخود "شت"ێك نییە بۆ پەرستن، بەڵكو دەروازەیەكە كە لە ڕێگایەوە ئەم دنیا بە دونیایەكی دیكەوە بەستراوەتەوە. (*Galavaris, 1981, p.7*)

ڕێگایەكی دیكەی پەیوەستكردنی خوداكان و ئینسانەكان، لەلایەن هێماگەلێكی خوداكانەوەیە. شوێنێكی پیرۆز دەكرێت هەڵگری وێنەگەلێك لە خودایان یاخود نیشانەگەلی دیكە بێت كە ئامادەیی ئەوان ئاشكرا دەكات. پەرستگایەكی هیندوی، شوێنی پێكگەیشتنە. لەبەرئەوەی خاوەنی فۆرمێكە تیایدا خوداوەند بە شێوەیەكی ڕەزامەندانە بۆ هەڵبژاردنی شوێنی نیشتەجێبوون. (لەگەڵ پەرستگاكەدا) هاوتایی پەیدا كردووە. تابوتی پەیمان كە لە قدس الأقداس ی پەرستگای ئۆرشەلیمدا بوو، جێخەوی یەهوە بوو، نیشانەیەكی بەرچاو لە ئامادەیی ئەو یاخود ئامادەیی ناوی ئەو. پەرستگاكانی شینتو بە شوێنگەلێك بۆ نیشتەجێ بوونی ***Kami*** دێنە ئەژمار كە شێوەی مادیەكەی شتێكی پیرۆزە و بە "تەنێكی ئیلاهی" ناو دەبرێت، یاخود "جێنشینی ڕۆحی عالی مەقام". ئەم پەیكەرە لە ناوەوەی تەلاری پەرستگاكەدا پارێزگاری لێدەكرێت كە بە هۆی دەرگاكان یاخود دیواری بامبۆوە لە بینین دەپارێزرێت. بەڵام بوونی ئەو، ئامادەییەكی ئیلاهی بە پەرستگاكە دەبەخشێت. وەكو هەمان نموونە،ماڵێكی ژاپۆنی دەبێتە جێگایەكی پیرۆز كاتێك كە ***Kamidana***یەكی تێدایە كە هێماكانی ***Kami*** پیرۆز دەكات و ***Butsudan*** كە میحرابێكە، هەم وێناكانی بوداو تابلۆی باپیران لە خۆدەگرێت.

تەنانەت بەبیٚ هێما ئاشكرا و پەیوەستكارەكان یاخود نیشانەگەلێك لە خودایان، دەكرێت شوێنێك وەكو خاڵی پەیوەندی نێوان خودایان و مرۆڤەكان هەست بكرێت. ئیسلام بە توندی لەگەڵ بوونی خودا لە شوێنێكدا یاخود هێماگەلێك بۆ بینینی خودا دژایەتی دەكات. ئەگەرچی كەعبە ناوەندێكە پەرستش ڕووەو ئەویٚ ئاڕاستە دەكرێت، هیچ وێنەیەكی خودای لە خۆیدا جێنەكردۆتەوە، تەنانەت بە شوێنی نیشتەجێبوونی خوداش نایەتە ئەژمار. بەمحاڵەوە لە هەندێك بواردا ڕاڤە ئیسلامییەكان ئەویٚ وەك شوێنێك بۆ دەستڕاگەیشتنێكی تایبەت بە خودا، باس دەكەن. گێڕانەوەیەكی چاخی نەفامی، بەردە ڕەشەكە (حجر الأسود)ی نێو كەعبە بە دەستی ڕاستی خوداوەند وەسف دەكات. "كە ئەو (خوداوەند) ئەو دەستە دەهێنێتە پێشەوە (بۆ ئەو بەندانەی كە ماچی دەكەن)، هەروەكو كەسێك كە تەوقە لەگەڵ نزیكەكانی دەكات" وتارێكی بڵاوكراوە لە ڕۆژنامەیەكدا لە ساڵی 1971دا دەنووسێت "وەختێك دەست لە حجر الاسود دەدەیت و ماچی دەكەیت، عیشق و تاسەی خۆت دەكەیتە ناوییەوەو ئەو بەردەڕەشە دەكەیتە سندوقێكی پۆستە و لەوێوە عیشقی تۆ بە ئافەریدگاری ئەم جیهانە دەگات كە بە چاو نابینرێت". *Lazarus- Yafeh, 1981, pp,120, 123* هەر بەم شێوەیە كە لەم بوارانەدا هاتووە، خوداوەند بەشێوەیەكی ئاشكراو (بینراو) ئامادەنییە، بەڵام لە هەمانحاڵدا كەعبە لە ڕاستیدا دەبێتە خاڵی پەیوەندی نێوان خوداو مرۆڤایەتی.

فەزای پیرۆز، وەك شوێنێك بۆ پەیوەندی لەگەڵ خوداوەندا، شوێنێكە بۆ پاكیزەیی و پاكژبوونەوە لەبەرئەوەی پاكیزەیی ئەو توانایە بە مرۆڤ دەبەخشێت كە لەگەڵ خودایاندا پەیوەندی ببەستێت. لەوێدا كەم و كوڕییەكان و (پیسبونەكان)ی ژیانی ئاسایی كەمتر دەبنەوە. شوێنێكی پیرۆز ڕێكخستنی ئیدیاڵی شتەكان ئاشكرا دەكات كە لەگەڵ بواری خوداوەند، لەگەڵ ژیان و ژینی نێوان مرۆڤەكان، یاخود لەگەڵ ئەو بەهایانەی كە خەڵكی پێویستە تامەزرۆیان بن، پەیوەستە.

پەرستگای شینتو شوێنێكە بۆ پاكژبوونەوە، لەبەرئەوەی شوێنی *Kami*یەو پیسبوون لادەبات، چونكە پیسبوون، لەناوچوون و مەرگە. لە تەشریفاتە ئاینییەكاندا بە پاكژی پەرستگا دەگەین. بەشێوەیەكی باو چادرگەیەك و ئەستێڵێكی بەردین، ئاو بۆ شۆردنی دەست و دەموچاو دابین دەكەن. ئەو سیٚ ڕووبارەی بەسەریانەوە پردێك دروستكراوە، بە پەرستگا كۆتاییان دێت تا عیبادەتكاران لە حاڵێكدا بە ڕووبارەكاندا تێدەپەڕن، خۆیان خاوێن بكەنەوە. پاكژی (ئەم پەرستگایە) لە ڕوونكردنەوەی پێناسەكەیدا خراوەتە ڕوو. *Torii* (دەروازەكانی شینتۆ) پەیژەكان، فەزا چوار دەورگیراوەكان و پردەكان، ناوچەگەلێكی تایبەت بە دیار دەخەن و هێمان بۆ نزیك بوونەوە لە خوداوەند. فەزا پیرۆزەكانی دیكە، بەهۆی ناساندنی فەزایەكی میانگیرەوە بۆ بەڕێوەچوونی ڕێوڕەسمی پاكژبوونەوە، تێپەڕین لەناوچەیەكی ناخاوێنەوە بۆ خاوێن دەستنیشان دەكەن، هەندێك لە مزگەوت و كەنیسەكان لە چوونە ژوورەوەدا بۆ نێو فەزای سەرەكی بەشی پیرۆز (پەرستگا)، وەها فەزاگەلێكیان بۆ پاكژ بوونەوە هەیە.

شوێنێكی پیرۆز نە تەنها دەتوانێت شوێنێك بێت بۆ پەیوەندی لەگەڵ جیهانی خوداوەندا، بەڵكو هەروەها شوێنێكە بۆ پەیوەندی لەگەڵ (جیهانەكان)ی نزیك (ناوچە)ی پیرۆز. بۆ نموونە،

**پێوەرێکی پارادۆکسی سەرەکی ئاین ئەمەیە کە ئەگەر خوداوەند لە هەموو شوێنێکە، بەم پێیە دەبێت "لە جێگەیەکدا بێت". تەنانەت ئەگەر تەواوی دونیا لە "پڕشنگی خودا پڕە"، ئەو پڕشنگە دەبێت لە شوێنێکدا دەرکەوتبێت. ئەم پێوەرە پارادۆکساڵە لە پەرستگای ئۆرشەلیمدا ڕەنگی داوەتەوە کە تابوتی پەیمانی لە خۆیدا هەڵگرتبوو، کە هێما بوو بۆ جێخەوی یەهوە بەڵام هیچ وێنەیەکی یەهوەی بە پەرستگاکە نەدەبەخشی. بە هەمان شێوە لە ئیلاهیاتدا کە لە کتێبی (تثنیە) دا هاتووە، یەهوە، ناوی خۆی نەوەك خودی خۆی لە پەرستگاکەدا ئاشکرا کردووە. بەم پێیە هەم پەرستگاو هەم دەقی (تەورات) بەشێوەگەلی جیاوازی خۆیان، بەردەوام لە هەوڵی حەل و فەسڵی پارادۆکسی، جیهانگیربوون و بە شوێن بوونی یەهوەدا بوون. لەلایەکی دیکەوە پەرستگا گەورەکانی هیندو، بە گشتی وێنەگەلێکی جۆراوجۆری خودایانیان لە خۆگرتووە. بەشێوەیەکی سیمبولی عیبادەتکارانی خودایان یان خوداکانی دیکەش ڕووخسارەکانی دیکەی خوداوەندی نێوەندی پەرستگاکە دەبینن. یا بە مەبەستی ئامادەبوون بۆ گەیشتن بە خودای نێوەندی، بەرەو ڕووی خودایانی دیکەی (ئامادە) لە پەرستگاکەدا، پەرستش دەکەن. بەم پێیە پەرستگایەکی هیندویی دیدگای هیندۆکان دەربارەی زنجیرەی پلەبەندی خوداوەند، پیشان دەدات کە لە بوونێکی ئیلاهیدا بەتایبەت، بە بەرزترین ئاستی خۆی دەگات، یا لە کەنیسەکانی ڕێنیسانسدا هەمئاهەنگی و هاوسەنگی تەلارسازی، کەماڵ و جوانی خودا پیشان دەدەن. لە تەواوی ئەم نموونانەدا، شێوەی شوێن، دەرخەری ماهیەتی خودایەکە کە لەوێدا دەپەرسترێت.**

## شوێنەکانی دەسەڵاتی خودایی

**لەبەرئەوەی (شوێنی پیرۆز) شوێنی پەیوەندییە لەگەڵ بوونەوەرە خوداییەکاندا، بەم پێیە شوێنێکە بۆ دەسەڵاتی خودایی، کە دەتوانێت ژیانی مرۆڤ بگۆڕێت. سروشتی ئەم گۆڕانە بەهۆی نەریتە ئاینییەکان و سەنگی شوێنی پیرۆزەوە جیاوازە. بە پێی داب و نەریتێکی هیندی شوێنەکانی زیارەتکردن، *bhukti* (سوود) و *mukti* (ڕزگاری) بەدیدەهێنن. یەکێك لە و سوودانە، دۆزینەوەی چارەسەرە. بۆ نموونە لە مەسیحییەتی سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە زۆرێك لە زیارەتگاکاندا تامەزرۆییەك بۆ بینین یا ئەزموونی چارەسەرە موعجیزە ئاساکان پیشاندەدرا. لە ڕاستیدا، زیارەتگاکان هێندە بەشێوەیەکی نزیك لەگەڵ چارەسەرکردندا پەیوەست بووبوون کە پیاوێکی گەنجی خەڵکی *warbelton*، لە چوون بۆ *Canterbury* سەرپێچی کرد، "چونکە من نەلاڵم و نە ئیفلیج، و تەندروستیم زۆر باش دێتە بەرچاو". کەسێکی دیکە بەڵگەی دەهێنایەوە کە "من تەندروستییەکی تەواوم هەیە، من چ پێویستییەکم بە نەریتی توماس هەیە؟" (*Sumptlon 1972, p 78*) بۆ ملیۆنان کەس کە بەدوای چارەسەرە موعجیزە ئاساکاندا دەگەڕێن، *Lourdes* وەکو شوێنێك بۆ زیارەت ماوەتەوە، هەرچەندە کەنیسەکانی کاتۆلیك چەندین چارەسەری وەکو موعجیزەی ڕاستەقینە سەلماندووە. دەکرێت شوێنێك بە هۆی ئەو چارەسەرانەی کە دەیبەخشێت دەربکەوێت. بۆ نموونە یەکێك لە شوێنەکانی دەرکەوتنی خوداوەندی شیوا، چیای *Arunacala* یە کە بە زۆری نەخۆشییەکانی سینگ و نەزۆکی چارەسەر دەکات و دوو پەرستگای *sufi* لە پنجاب، گولی و جۆرێك**

نەخۆشی چاو چارەسەر دەكات. (*Bharati, 1963*) هێزی خودایی كە لە شوێنە پیرۆزەكاندا ڕووبەڕووی دەبینەوە، هەروەها دەكرێت ئامانجگەلی گشتی تری بۆ چارەسازییە جەستەیی و مادییەكان تێدا بێت. سەركەوتن لە خوێندن یاخود كاردا، لە دایكبوونی منداڵان و یاخود ڕەنگە بەهرە خوداییەكان بە تەنها، دەكرێت لەو هۆكارانە بن كە دەبێتە هۆی سەردانی شوێنێكی پیرۆز.

ڕزگارییش دەكرێت لە شوێنە پیرۆزەكاندا بە دەست بێت. بە پێی گێڕانەوە جیاوازە هیندییەكان، مردن لە بناری، سووتان و بوونە خۆڵەمێش لە وێداو بڵاوكردنەوەی خۆڵەمێشی مردوو لە بنارس، ڕزگاری كەسی مردوو دابین دەكات. زۆر جار ڕزگاری بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ بە پاكیزەیی شوێنێك و توانای ئەو شوێنە لە پاكژكردنەوەی ئەوەی لە ناویدایە، پەیوەستە. تازەگەرێكی ئینگلیزی *Hug Latimer*، بە سوێندخواردن و گریانەوە لە هەوڵی ئەوەدابوو كە باوەڕ بە زیارەتكاران بهێنێت كە بینینی خوێنی مەسیح لە ئەستێرەی (هالی)دا، دەبێتە هۆی ئەوەی كە ئەوان لە ژیاندا پاكیزە و سەرفراز بن، بەبێ گەردێك گوناه. (*sumption, 1972, p 289*) بەم پێیە شوێنێكی پیرۆز وەك دەستڕاگەیشتنێك بە خوداوەند، دەبێتە ڕێگایەك بۆ كامڵبوونی ژیانی ئینسانی.

## شوێنگەلێك وەك وێناكردنی دونیا

فەزایەكی پیرۆز بە زۆری وەك خوازەیەكی بینراو بۆ دونیایەكی ئاینی دێتە ئەژمار. پەیوەندی نێوان سیستمی فەزا و شێوازی ژیانی ئینسان، نموونەیەكی سروشتی (ئەم بوارە)یە. ژیانێكی بێئامانج یاخود بێ مانا بە زۆری لە خوازە فەزاییەكاندا دەردەبڕدرێت، دەبێت (ئەم فەزایە) "ونبوو"، "ئاڕاستەنەكراو" و "بێلایەن" بێت. لەوێدا كە ئەو فەزایانە فەزاگەلێكی ناسێنراون، شوێنە پیرۆزەكان، نەخشەگەلێكی سروشتین كە ئاڕاستە بە ژیان دەبەخشن. فەزا پیرۆزەكان ڕێكوپێكی بە فەزا دەبەخشن – بە زۆری فەزا جوگرافی و هەمیشەش فەزا وجودیەكان – بەهۆی ڕێكوپێكی بەخشین بەو فەزایە، بەهەرچی لە ناویشیدایە، نەزم دەبەخشن. ماڵی هەڵم *Lakota* نمونەیەكی باش بۆ نەزم بەخشین بە فەزا وەك بەرجەستەكەری شوێنێكی پیرۆز فەراهەم دەكات. ناوچەی دەرەوەی ماڵەكە بازنەیەكە. شێوەی ئەم بازنەیە بە هۆی چەماندنەوەی دوانزە تا شانزە (شووڵ)ی نەمامی داری بییەوە دروست دەبێت كە لە چواریەكی بازنەكەوە بەرەو لای چواریەكی بەرامبەر شێوە دەگرێت. بە پێی گوتەی *Black Elk*. دارییەكان بە شێوەیەك دانران كە چوارگۆشەی دونیا دیاری دەكەن. بەم پێیە تەواوی ماڵەكە، بە تەواوی جیهان، لە وێنەیەكدا دێتە ئەژمار و بوونەوەری دوو پێ، چوار پێ و باڵدار، لە ناویداو تەواوی شتەكانی دونیا لەوێدا دانراون. چاڵێك، كە بەردی گەرمی بۆ دروستكردنی هەڵم تیادایە، لە ناوەڕاستی ماڵەكەدا هەڵكەندراوە. ئەم ناوەڕاستە، ناوەڕاستی دونیایە كە لەوێدا *Wakantanka* (ڕۆحی مەزن) نیشتەجێیە، بەهێزی ئەو كە ئاگرە، ناوەند بە *Wakantanka* وە پەیوەستە، (*Brown, 1971, p. 32*)، لەوێدا كە ئەو كۆی هەموو هێزە خوداییەكانە، بەم پێیە ماڵی هەڵم چوار دەوری فەزایەكی فیزیكی دەدات و واقیعییەتەكانی دیكەی *Lokota* لە شێوەی خۆیدا وێنە دەكێشێت. ناوەندی ئەو دەبێتە خاڵی كۆتایی بۆ گەڕانەوە كە لەو فەزایەدا، هەموو بوونەوەرەكان و هەموو هێزەكان سەرئەنجام لەو خاڵەدا بەیەك دەگەن.

خوازەی فەزایەکی دیکە، کە بەشێوەیەکی نزیك پەیوەندی بە شوێنە پیرۆزەکانەوە هەیە، ئاراستە دۆزەرەوەیە. شوێنی پیرۆز سەرنج لەسەر خاڵێکی هێمایی چڕ دەکاتەوە کە یا بە گۆڕینی ئاراستەی خۆی یاخود بە سوڕاندنی ئەو شتانەی کە لە ناویدایە. (تەماشای *orientation* بکەن) شوێنە پیرۆزەکان شێوەگەلی جۆراو جۆر لە دۆزینەوەی ئاراستەو بەهاکانی ئاراستە پیشان دەدەن، یەکەمین کەنیسەکانی *Coptic* و ڕۆژهەلاّتی و کەنیسەکانی ئەم دواییانەی ڕۆژئاوا، بە ئاراستەی هەلاّتنی خۆر دروست کرابوون، کە هێمای هەستانەوەی مەسیحە، پەرستگاکانی هیند و بەهۆکاری جۆراو جۆر ڕوو لە ئاراستەی جۆراوجۆر دەکەن.

بۆ نمونە پەرستگای *Taraknatha* لە *Tarakeswar* ڕووی لە باکوورە. گەورەی کۆمەڵگای ڕەهبانی (نیشتەجیّ) لە پەرستگاکەدا ڕوونی کردەوە کە ئاراستەی باکوور، بە تایبەتی پیرۆز و شکۆدارە. یەکەم لەبەرئەوەی بەرامبەر باشوورە، ئاراستەی دونیای مردووان. دووەم لەبەرئەوەی بە ئاراستەی کێوی *Kailasa*، ماڵی شیوایە و سێهەم، لەبەرئەوەی بەدەستپێکردن لە باکوورەوە، سوڕانەوە بە دەوری پەرستگای ناوەوەی سەرەتا، بە ڕۆژهەلاّت تەواو دەبێت — بەئاراستەی خۆر– و نووری زانست. ڕوونکردنەوەکانی ڕاهیبە گەورەکە ناجێگیری لۆژیکی فەزای پیرۆز پیشان دەدات کە لە هەر شێوەیەکی خۆیدا مانا پەیدا دەکات. لە بیرو باوەڕەکانی دیکەدا، ئاراستە سەرەکییەکان بە بنەمایەك بۆ ئاراستەکردن نایەنە ئەژمار، کەنیسەکان بەشێوەیەکی نەریتی بەرەو ئۆرشەلیم ئاراستە دەکرێن و مزگەوتەکان ڕووەو مەککە. ئەم شوێنانە نە لەبەرئەوەی کە ڕێگەیەکی هاوشێوە بۆ ئاراستەکردن پیشان دەدەن لەیەك دەچن، بەڵکو لەبەرئەوەی هەردووکیان مانا بە ئاراستە دەبەخشن.

شوێنە پیرۆزەکان هەروەها، دابەشکردنێکی واقیعی کارکردی لە فەزای جوگرافیاییدا بەرهەم دەهێنن. دابەشکردنێك کە لە هەمانحاڵدا خوازەگەلێکن بۆ شێوەی جیاوازی ژیان. لە ڕێکخستنی دونیادا، نە تەنیا ناوەندێکن کە دونیا ڕووی لەوانە، بەڵکو دەکرێت سنوورەکانی نێوان بوارە جیاوازەکان دیاری بکەن. ئەم سنوورانە دەکرێت هەم بوارە واقیعییە بینراوەکان و یاخود نەبینراوەکان لە خۆبگرێت و هەم بوارە جوگرافیاییەکان. سەر ئاوی *Maori*یەکان کە لە سەرەوە ئاماژەی پێدرا، سنووری نێوان دونیای ئینسانەکان و دونیای مردووەکانی پێك دەهێنا.. بەلاّم دونیای مردووەکان، دونیای خوداکانیش بوو.

سرووتی داتاشینی تیر لەم سەرئاوەدا پەیوەندییەکی لە نێوان دوو لایەنی ئەم سنوورەدا بەدیدەهێنا. ئەوانەی کە دەیانویست ڕۆحی ناحەز لە خۆیان دوور بخەنەوە، تیریان دا دەتاشی تا ئەو ڕۆحە خراپە بۆ بواری خۆی بگێڕنەوە. ئەوانەی دەیانویست کۆمەکی خودایان بەدەست بهێنن، ئەم تیرەیان دادەتاشی بۆ بەرپاکردنی پەیوەندی لەگەڵ خوداکان. بەم پێیە سنووری بەدیهاتوو لەلایەن سەرئاوەوە، لە هەردوولاوە کراوە بوو.

هەروەها ڕەنگە سنوورە بەدیهاتووەکان لەلایەن فەزا پیرۆزەکانەوە، سنووری دونیای بینراو دیاری بکەن و یاخود فەزا گەلی تایبەت لە ناویدا دروستبکەن. بۆ نمونە، لە داب و نەریتێکی تایلەندیدا لە باکوری ئەم ولاّتە، کۆمەڵێك لە پەرستگا زیارەتییە دوانزە دانەییەکان، سیستمێك لە فەزا گەلی پێچاوپێچ بەدیدەهێنن. ئەم دەزگایە لە حاڵێکدا کە لەناوخۆیی ترین و بچووکترین ناوچەوە

دەست پێدەکات، ناوچەگەلی ناوەندگەرای گەورەتر بەشێوەی یەکلەدوای یەك لە خۆدەگرێت و بەردەوام کۆمەڵەگەلی گەورەتر دیاریدەکات کە خەڵکی ناوەند، پەیوەستن پێوەی. ئەم کۆمەڵانە لە دیمەنی شیوی ڕووباری *ping* ەوە، کەوتوونەتە بەر سەرنج کە چوار پەرستگا لە پەرستگا دوانزە دانەییەکان لەوێدا هەڵکەوتوون، ئەم چوار پەرستگایەو چوار پەرستگای دیکە کە لەگەڵ قەڵەمڕەوە سەرەکییەکانی باکووری تایلەندا لە دەرەوەی شیوی ڕووباری *ping* لە پەیوەندیدان، دووەمین کۆمەڵگا دیاریدەکەن کە پەیوەستە بە خەڵکی *Lanna* ی تایلەندەوە. کۆمەڵگای سێهەم سەرجەم پەیڕەوانی بردیسمی *Lao* و باکووری تایلەند لە خۆ دەگرێت کە بە جۆرێك دەبینرێت کە وا دێتە بەرچاو بەشێوەیەکی نزیك بەیەکەوە پەیوەستن. ئەم کۆمەڵگایە بەهۆی زیادکردنی پەرستگایەك لە باکوری ڕۆژهەڵاتی تایلەند دەرکەوتبوو کە بۆ خەڵکی *Lao* ی تایلەند و لائوس پیرۆز بوو.

چوارەم، زیادکردنی پەرستگای *ShweDagon* لە ڕانگون، بەرمە، بودیسمی تایلەندی لەگەڵ بودیسمی خەڵکی بەشی خوارووی بەرمەدا کردە یەکێك، بە تایبەتی کەسانێك کە پەرستگای *Shwe Dagon* لەلایان پیرۆز بوو. پێنجەم، پەرستگای هەڵکەوتوو لە *Bodhgaya*، ئەو جێگایەی کە بودا ڕۆشنگەری هزری بەدەستهێنا، بودیسمی باکووری تایلەند و بەرمەی بە کۆمەڵگای هەموو بوداییەکانەوە پەیوەست کرد. دواین پەرستگا لە بەهەشتی سی و سێی خودادا بوو. ئەم جێگایە هێشتا لە (دەستەی) گۆی ئەو دونیایانەدایە کە لەلایەن *karman*ەوە بەڕێوە دەبرێن. بەم پێیە کۆمەڵگا تەواوی بوونەوەرە هەستیارەکان لە ئاسمان و زەویدا پێناسە دەکات کە مەحکومن بە مەرگ و زیندوو بوونەوە. لەم حاڵەتەدا، پەرستگا پیرۆزەکان فەزاکان و بوونەوەرە جۆراوجۆرەکان و دونیا هەم لە یەکدی جیادەکەنەوە و هەم ئەوانە لەگەڵ ئەو شتەی کە خەڵکی دۆڵی ڕوباری *ping* لەگەڵیدا لە پەیوەندیدا بوون، یەکدەخات.

بە هەمان شێوە، لە باشوری ئاسیا نموونەی داڕشتنی شار، کۆمەڵێك فەزای یەك ناوەند (متحد المرکز)ی لە دەوروبەری پەرستگایەکی ناوەندی لە دڵی شاردا، بەدیدەهێنا. بۆ نموونە، ئەم شێوەیە لە *Katmandu* دا دەردەکەوێت. شار بە بیست و چوار پەرستگا دەورە دراوە، هەشت خوداوەندی دایك. ڕێوڕەسمێکی بەردەوامی پەرستش لەم پەرستگایانەدا، ئەوان لە سێ کۆمەڵەی هەشت دانەییدا ریزبەندی دەکات. کە سێ بازنەی هاوچەق لە دەوروبەری *Katamandu* پێك دەهێنن. فراوانترین بازنە، دەوری ناوچەیەك دەدات کە بەشێوەی یەکلەدوایەك، لە ژێر کۆنترۆڵی پادشایانی *Katamandu* دایە.

بازنەی دووەم، دۆڵی *Katmandu* لە خۆ دەگرێت کە گوندەکان و ناوچە چواردەور گیراوەکان دەگرێتەوە کە بۆ خەڵکی شار ئاشنایە. سێهەمین بازنە خودی شار دیاریدەکات. بەشی ناوەندی شار بە دوانزە ژووری شێوە چوارگۆشەیی کە لە دەوروبەری پەرستگای *Taleju* دا بوون ڕێك دەخرا، *Taleju* خوداوەندێك بوو کە لەگەڵ پادشایانی *Malla* دا بەشێوەیەکی نزیك پەیوەست بوو. شێوەی ئەندازەیی شار ئەوی لە ناوچەکانی دەوروبەری جیادەکردەوە و وەکو پیرۆزترین ناوچە دیاری دەکرد کە تیایدا هاتنە دی نەزمی ئیلاهی لە تەواوترین شێوەیدا، دروست دەکرا. لەم شێوازەدا پەرستگاکان، ئاستە جیاوازەکانی پیرۆزکردن دیاری دەکەن کە لە

ناوەندی پیرۆزی شارەوە بۆ تەواوی پادشایەتییەکە دریژ دەبێتەوە.

## شکاندنی تەلیسمی فەزا پیرۆزەکان

کارکردی فەزای پیرۆز، بەشێوە جیاوازەکانییەوە، وێنەگەلی جیاوازی کارکردی سەرەکی ئەون، ئەم کارکردە پێناسەی ئەو هێما بنەڕەتیانەیە کە نموونەکانی ژیان لە کولتورێکدا بەرهەم دەهێنن. ئەم بەشە هەندێك لەو شێوازە هێماییانەی کە فەزا پیرۆزەکان مانادار دەکەن، وێنە دەکێشێت. ئەم سیستمانە بۆ سەر پێکهاتەی شوێنێك زیادکراون و بەم پێیە بەیەکدی و بەڕواڵەتی ئەو شوێنەوە پەیوەست بوون. فەزایەك دەتوانێت زۆر شتی دیکە لە خۆ بگرێت، جەستەی مرۆڤ، جیهان، دابەشکارییەکانی کات، حیکایەتی پیرۆزی داب و نەریتێك و ناوچە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤ. هەرچەندە لە ژیانی ئاینی کولتورێکدا، ناوچەیەك حاڵەتێکی ناوەندی تری هەبێت، ئەو سیستمانەی کە دەگەڕێنەوە سەری زیاتر دەبێت.

## تەن ( جەستە )

جەستەی مرۆڤ سیستمێکی بنەماییە. ئەگەر تەنها سیستمی بنەمایی نەبێت-کە بەپێی ئەو خەڵك دونیا ڕێك دەخەن و ڕاڤەی دەکەن - خودی ئەم جەستەیە فەزایەکە، تەنانەت هەندێك جار فەزایەکی پیرۆز وەك شێوەکانی *Yoga Trantric*، کە تیایدا جەستە بۆ گۆڕینی ئەو شێوانەی لەلایەن یۆگاوە ئەنجام دەدرێت، دەگۆڕێت بۆ زەوی. هەروەها جەستە دەتوانێت هۆکارێکی پەیوەندی بێت لەگەڵ فەزا دەرەکییەکاندا، کە تیایدا یەك

شێوەو کەسێتی دەردەبڕێت. لە زۆر بواردا ئەم پەیوەندییە لە نێوان جەستەو شوێندا ڕوون و ئاشکرایە. نەخشەی ئاسۆیی کەنیسەکانی گوتیك نە تەنیا پیشاندەری مەسیحیە لەسەر چوار مێخە، بەڵکو زیاتر پیشاندەری شێوەی جەستەی مرۆڤە. لە هێماگەرایی کەنیسەکانی بیزانسیدا. حەوشەی کەنیسە پیشاندەری جەستەی مرۆڤ بوو، جێگەی کەشیش، دەربڕی گیان و *Altar* نیشانەی ڕۆح بوو. لە کولتوری ناوچەکانی باشووری ئاسیادا، هێماگەرایی جەستە بە شێوەیەکی فراوان پەیوەستە بە شوێنە پیرۆزەکانەوە بۆ نموونە پەرستگاکانی هیند و بەشێوەیەکی ئاشکرا دووبارە دروستکردنەوەی سەری جەستەن.

نەخشەی ووردی هێما ئامێزی پەرستگای *Vastupurusa*یە، نیشانەیەك کە بەسەر زەوینی ئایندەی ئەودا کێشراوە. ئەم نیشانەیە، ئاڕاستە سەرەکییەکان، شوێنکەوتەکانی مانگ، هەسارەکان، خودایان و جەستەی مرۆڤ بە یەك دەگەیەنێت و شێوەکانیان بە جۆرێکی هێمایی بۆ ئەو پەرستگایەی کە لەسەری بیناکراوە دەگوازێتەوە، کتێبە هێڵکارییە تەلارسازیەکانی هیند، بە ئاشکرا پەرستگا بە جەستەی مرۆڤ دەچوێنن، دەرگا، (لە شێوەی) دەمە، گومەزی سەر منارەی قوچەکی، سەرە. هەر بەو شێوەیەی کە ئێسکە پەیکەری سەری مرۆڤ درزێکی تێدایە کە لە کاتی مەرگدا ڕۆح لەوێوە بەرەو ئاسمان دەڕوات، تەواو بە هەمان شێوە، گومەز بە منارەیەك، یەکالآکراوەتەوەو شوێنی پیرۆزی ناوەوەی پەرستگا، هەمان شوێنی ڕۆحە لە جەستەی مرۆڤدا.

"پەرستگا"ی *silparatn*، بە شێوەیەکی کورت ئەوە دەردەبڕێت: "دەبێت وەکو مرۆڤ جیهانێك بپەرسترێت".

لەم هاوشێوەییەی شوێن و جەستەی (مرۆڤ)دا، مانای زۆر زیاد بە (شوێن) دەبەخشرێت. هەم کەنیسەکانی گوتیك و هەم پەرستگای هیند و هەمان شێوە کە وێنەی جەستەن، بە وێنەی جیهانیش دێنە ئەژمار و بەم پێیە گونجاوی و هاوتایی نێوان جیهانی گەورەو جیهانی بچووك وێنە دەکێشن. کەنیسەی گوتیك، ئاماژە بە جەستەی مەسیح دەکات، کەسێك کە بە کەنیسەیەکی تەواوی مەسیحی دێتە ئەژمار، کەسێك کە وێنەی بەرجەستەی خودایەو کەسێك کەبە نێوەندی دونیا و مێژوو دێتە ئەژمار. بەم پێیە هاوشێوەیی کەنیسە و جەستەی مەسیح دەربڕینێکی بەرچاوی ناوەندێتی مەسیح لە جیهانداو ئامادەگی ئەو لە ژیانی کۆمەڵگادا دەخاتە ڕوو. لەبەرئەوەی پەرستگایەکی هیندو پیشاندەری جەستەی مرۆڤە، گەشت بە نێو پەرستگادا، بە گەشتێك بۆ نێو دەروونی خودی کەسەکەشدا دێتە ئەژمار. پەیوەندی لەگەڵ وێنەی خوداوەند لە دڵی پەرستگاکەدا، ڕەنگدانەوەی پەیوەندی لەگەڵ خوداوەندە لە ناخی کەسێکدا. بەم پێیە لە هەمان حاڵدا کە (لێکچوونی) شێوەی جەستە، مانایەکی گشتی بە فەزا دەدات، مانای تایبەتی فەزا لەچەمکی بیروباوەڕە ئاینییەکانی هەر دینێکدا بڵاودەکاتەوە.

## جیهان

فەزای پیرۆز بەهۆکاری وەرگرتنی شێوەی دونیا، وەشێوە بە دنیا دەبەخشێت. بەپێی نموونەیەکی میرسیا ئەلیادە لەسەر فەزای پیرۆز. بەشە سەرەکییە ستونییەکانی دونیا، لە شوێنێکی پیرۆزدا دابەش دەبن و لەوێدا دەردەکەون. ئەم بەشانە بەشێوەیەکی دووبارە بووەوە، جیهانی سەروتر، زەوی و جیهانی خواروترن *David D.shulman* ئەم نموونەیەی لە پەرستگاکانی *Tamilnadu* دا دۆزیوەتەوە کە نەتەنها ئەو هێمایانە لە خۆ دەگرێت کە لەلایەن زەوییەوە بەرەو سەرەوە بەرزدەبنەوە، بەڵکو هێماکانی *Biladvard* یەکیش لە خۆ دەگرێت، ڕاڕەوێك بۆ جیهانی خوارەوە. بیناکانی دیکە، وێناگەلی جیهانی بێوێنەتر پیشان دەدەن. بۆ نموونە لە *watharipunjaya* لە تایلەند، *ceitya* کە بینای ناوەندی کۆمەڵەیەکی پیرۆزە، بەشێوەیەکی ستوونی سێ ناوچەی بنەمایی دونیای بودایی لە خۆ دەگرێت. (دونیای) جەستەیی، (دونیای) شێوە گرتوو و دونیای بێ شێوە. *ceitya* نەتەنها ئەم سێ ناوچە جیاوازە پیشان دەدات، بەڵکو توانای بەزبوونەوە بۆ پلەی تەواوەتی ڕووناکبیریش نمایش دەکات. شوێنە پیرۆزەکان دەکرێت نەتەنها بوارە ستوونییەکانی دونیای بخەنە ڕوو، بەڵکو پەردەیەك یاخود پەردەیەکی دیکە لە پەردەکانی ئەو پیشان بدەن. هەر بەو جۆرەی کە ئاماژەمان پێدا، شوێنی پیرۆز بەزۆری جێگایە کە مرۆڤەکان لەوێدا دەچنە نێو بواری خودایانەوە، یاخود بە پێچەوانەوە، دەبنە شوێنێك بۆ دەرکەوتنی خوداوەند یا خودایان لە نێوان خەڵکیدا. لە هەردوو بوارەکەدا، (ئەو شوێنە) دەبێتە جێگەی ئاشکرابوونی خوداوەند و بەم پێیە وێنەیەك لە بواری خوداوەند. بۆ نمونە بە بەکارهێنانی شێوەگەلی ئەندازەیی سادە، گونجان و ڕووناکی، کەنیسە گەورەکانی گوتیك وەك وێنەیەك لە شارێکی ئاسمانی وێنا دەکرا. بەپێی بیروباوەڕەکانی مەسیحییەت و هیند و، شارە پیرۆزەکانی ئۆرشەلیم و بنارس، نموونەی ئاسمانییان هەیە و بەم پێیە وێنەی بەهەشتن.

بەهەشت نەوەك هەر دەتوانێت بواری خوداکان بێت، بەڵکو هەروەها نموونەیەکی ڕێکخستنی خودایی و بەرزبوونەوەی ڕێکوپێکە. شوێنی پیرۆز دەکرێت بەهەشتێك بێت لەسەر ڕووی زەوی کە ڕێکخستنی نەمر و پاکیزەی بەهەشت بۆ سەر ڕووی زەوی دەهێنێت. بۆ نموونە لە کاتی بناغەدانانی شارەکان لە ڕۆژگاری ڕۆمییەکاندا، غەیبگۆ وێنەی بازنەیەکی دەکێشا کە لەلایەن چەند هێڵێکەوە لە باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە، دەکرا بە چوار بەشەوە، ئەم نیشانەیە ڕێکخستنی ئاسمانی دووبارە دەکردەوەو بەم پێیە لەسەر زەوی سەقامگیری دەکرد. پاش ئەوە، بە پێی دەستورە ئاینییەکان، ئەم نیشانەیە لەسەر تەواوی زەوینێك کە دەبوو شار بیگرتایەتە خۆی، سنوورەکانی دونیای دووبارە دروست دەکردەوە. هێڵی ڕۆژهەڵات –ڕۆژئاوا ڕێڕەوی خۆری دیاری دەکرد و هێڵی باکوور– باشوور تەوەرەی ئاسمان. بەم شێوەیە شار و غەیبگۆ لە شوێنی پێکگەیشتنی ئەم دوو هێڵەدا و لێرەوە بەشێوەیەکی دامەزراوو هەمئاهەنگ لە ناوەندی دونیادا رادەوەستان.

## بەدیهاتن و پەیدابوونی گەردوون

فەزای پیرۆز هەروەها دەکرێت ئەو قۆناغە یەکلەدوایەکانەی دونیا تیایدا هاتەبوون بەدیبهێنێتەوە. دیسان بەپێی نموونەکەی ئەلیادە، لەبەرئەوەی شوێنی پیرۆز ناوەندێکە دونیا لەدەوروبەریدا دەگات بە ڕێکخستن و خاڵی پێکگەیشتنە لەگەڵ بواری ئیلاهیدا، بەخاڵی دەسپێکردنیش دێتە ئەژمار. ئەفراندن لەوێدا دەستی پێکرد و لەوێوە فراوان بوو. ئەم هێماگەرییە لە تەلارسازی پەرستگای هیندویدا ئاشکرایە. لە ناوەوەی شوێنی پیرۆزی پەرستگاکەدا، نێوەندێکی تاریك هەیە کە لەوەوە وێنەکانی دونیا دێنە بوون کە لەسەر دیوارەکان یاخود دەروازەکانی پەرستگا گەورەکان دەکێشرێن. سروشتی بوونی ئەم هێماگەرییە دەتوانێت بە پەیوەندی لاوەکی بەو شوێنانەوە کە مانای سەرەکییان لە جێگایەکی دیکەیە، ڕوونبکرێتەوە. بۆ نموونە، بەپێی *midrash Tanhuma Qedoshimlo*، ئۆرشەلیم و پەرستگاکەی لەبەرئەوە پیرۆزن کە زەوی پیرۆز، ناوەندی فەزایەو پەرستگا، ناوەندی زەوی پیرۆز: "دروست بەو شێوەیەی کە ناوك لە ناوەندی جەستەی مرۆڤدایە، بە هەمان شێوە سەرزەمینی ئیسرائیل لە ناوەندی دونیادایە.. و سەرچاوەی دونیایە. ئۆرشەلیم لە ناوەندی سەرزەمینی ئیسرائیلدایە. پەرستگا لە ناوەندی ئۆرشەلیمدایە. قدس الاقداس لە ناوەندی پەرستگادایە. تابووتی پەیمان (عهد) لە ناوەندی قدس الاقداس دایەو ناوکی بناغەیی (دونیا) لە بەرامبەر تابووتی پەیماندایە کە جێگاکەی، شوێنی پەیدابوونی جیهانە". ئەم هێماگەرییە ئاماژە بە مەزنی شوێن دەکات لەبەرئەوەی ئەو شتەی یەکەمینە لە کاتدا ، بە سروشت یەکەمینیشە لە ناوەرۆکدا.

## کات

دەکرێت دابەشکارییەکانی کات هەروەها لە شوێنی پیرۆزیشدا نمایش بکرێت، بەتایبەتی وەختێك کە کات لەلایەن ئەو ڕێوڕەسمانەوە کە لەوێدا بەڕێوە دەچن، ڕێکبخرێت یاخود کۆنترۆڵ بکرێت، بۆ نموونە، بەشەکانی *ming-tang*، خانەی ڕۆژژمێری چینی، ڕوونکەرەوەی وەرزەکان بوو. هەر بەشە بۆ سێ جێگە دابەش کرابوو کە نیشانەی

مانگەکانی هەر وەرزێك بوون. ئەو سرووتانەی کە لەوێدا بەڕێوە دەچوون، گرەنتی بەدوای یەکدا هاتنی ڕێکوپێکی ئەم سووڕانەی کات بوو.ئەو ڕێو ڕەسمانە هەروەها گرەنتی جووڵەی کات بوون و بەم پێیە گرەنتی چارەنووسی تەواوی ئەو بوونەوەرە زیندووانە بوون کە پەیوەست بوون بە ئیمپراتۆرەوە، کەسێك کە بەڕێوەچوونی ئەم مەراسیمەی لە ئەستۆ بوو. جۆرێکی جیاواز لە هێماگەریی کاتی پەیوەست بوو بە کوشتارگا خشتییەکانەوە کە لە ڕێوڕەسمی تایبەتی بوداییدا دروست دەکران.

چینی و خشتەکانی کوشتارگاکە، وەرزەکان، مانگەکان، شەوان و ڕۆژان و سەرئەنجام ساڵیان پیشان دەدا کە هێمای تەواوێتی کات بوو. کۆتایی مەراسیمەکە، جێگیربوونی کات و دواجاریش دەستڕاگەیشتن بوو بە سەرمەدی (ابدیت) بۆ کەسی قوربانیکار.

## ڕیوایەتە پیرۆزەکان

فەزای پیرۆز دەکرێت نەتەنیا نیشانەی دونیای سروشتی لە خۆیدا هەڵگرتبێت، بەڵکو نیشانەکانی گێڕانەوە پیرۆزەکانیش لەخۆ بگرێت. شوێنێکی تایبەت دەکرێت یادهێنەرەوەی ڕووداوگەلێك بێت کە دەگوترێت لەوێدا ڕوویانداوە یاخود دەکرێت یادگارییەکان یا باسی ئەو حیکایەتە پیرۆزانە لە خۆ بگرێت کە ئەوانە بە یادی زەین دەهێننەوە. لە *Watharipunjaya* لە تایلەند، دیوارەکانی *Vihara* (حەوشەی ڕەهبانی) بەچەند ڕوونکردنەوەیەك ڕازێنراوەتەوە کە باسی ژیانەکانی بودا لە شێوەیەکی دەرەکیدا دەردەبڕن و بەها مەعنەوییە سەرەکییەکانی بودیسم ڕووندەکەنەوە. بە هەمان شێوە، کەنیسەکانی مەسیحی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، چەند نیگار و پەیکەرێك لە خۆ دەگرن کە وێنەی ڕزگاری پیشان دەدەن. بۆ نموونە لە کەنیسەکانی ڕۆژهەڵاتدا، ڕیزی ستوونەکان چەند وێنەیەك لە خۆ دەگرن کە پەیوەستن بە دوانزە ڕووداوی گرنگ لە ژیانی مەسیحدا، کە لە جەژنە گەورەکانی ساڵی مەسیحیدا، دەپارێزرێن. پەیکەرەکانی دیکە دەکرێت چەند دیمەنێك لە تەورات یاخود ژیانی قدیسەکان یا شەهیدەکان پیشان بدەن کە هەموو ئەمانە بەیادهێنەرەوەی مێژووی کارە خوداییەکانن لە جیهاندا. سرووتەکانی حەج لە فەزایەکدا بەڕێوە دەچێت کە بەیادهێنەرەوەی کۆچکردنە (لە) دوو ساتی هەستیار لە مێژووی پیرۆزی ئیسلامدا، سەردەمانی ئیبراهیم، کەسێك کە کەعبەی دروستکرد و ئاینی یەکتاپەرستی لەوێدا بەرپاکرد، سەردەمانی پێغەمبەر (د.خ)، کە سەردانی دواجاری ئەو لە ڕێوڕەسمی سارای عەرەفاتدا بەیاد دەهێنرێتەوە. لەم نموونەیەی دواییدا، شوێنی پیرۆز نەتەنیا ڕووداوێك بەیاد دەهێنێتەوە، بەڵکو شوێنی ڕووداوەکەشە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر دواین وتاری خۆی لەمیانەی حەجیماڵئاواییدا (حجه الوداع) لە عەرەفاتدا خوێندەوە. شوێن، مەودای کاتی نێوان ڕووداو و عیبادەتکار لە نێو دەبات و لە میانەی ئەوەشەوە، مەودای کاتی نێوان پێغەمبەر و کاتی هەنووکە کەم دەکاتەوە. ئەم ئاوێتە بوونە کاتی و شوێنییە، واقیعیەتێکی بەسام و شکۆ بە ڕووداوەکە دەبەخشێت.

## پلەکانی ژیانی مرۆڤ

شوێنە پیرۆزەکان، لە شێوە یاخود کارکردیاندا بە ژیان و چالاکی مرۆڤ ڕێکوپێکی دەبەخشن. بیناکردنی باڵەخانە مەرجدار و جوڵاوەکانی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان، لەم

شوێنانەدا هەستێکی دڵنیاییان پێدەبەخشێت، بەڕێگایەك کە بڕیار لەسەر دراو نییە. بەڵکو بەرەهایی لەسەر بنەمای سروشتی سەرەکی شتەکان. شوێنی پیرۆز بە زۆری هاوتاییەکی ئاشکرا لە نێوان ڕێکخستنی بەرجەستەی دونیا، بواری نەمری خوداکان و بونیادی پەیوەندییە ئینسانییەکاندا، بەدیدەهێنێت.

ئەم لایەنەی شوێنی پیرۆز لە بەرهەمێکی نائاساییدا لەلایەن *paulwheatley* یەوە بەناوی ناوەندی چوار چارەك، کەوتۆتە ژێر لێکۆڵینەوەوە. لەم کتێبەدا *wheatley* لە کۆمەڵێك باڵەخانەی ئاینی دەکۆڵێتەوە کە ناوەرۆك و ناوەندی یەکبوون بەخشی شارسازی دێرین بوون. ئەم نێوەندە ئاینیانە "هۆکارگەلێك بوون بۆ بەدیهاتنی فەزا سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و پیرۆزەکان، هاوکات بونیادگەلی نەزمی جیهانی، کۆمەڵایەتی و مەعنەویشن." (*wheatley, 1971, p. 225*)

لە باسەکەی *wheatley* دا، شاری دێرینی چینی تەواو بەم شێوازە کاری دەکرد تا نەزمی ئینسانی لە بونیادی ئیلاهیدا جێگیر بکات. شار، وەك وێنەیەك لە جیهان، دادەڕێژرا، خاوەنی چوار لایەنە سەرەکیەکەو تەوەرێکی بنچینەیی باکوور — باشوور کە هاوشێوەی بازنەی نیوە ڕۆژی ئاسمانی بوو. ناوەندی شار پیرۆزترین ناوچە بوو، وەك ئەستێرەی جەمسەری. تەوەرێك کە ئاسمان بە دەوریدا دەسووڕێتەوە و لە ناوەندا کۆشکی پادشایی ستاری گرتبوو. بەم پێیە شار، نەزمی ئاسمانی لەسەر زەوی بەدیدەهێنایەوە و ناوەندی ئەو لە کۆشکی فەرمانڕەوادا بوو. هەمان شێوە کە ئاسمانەکان بەشێوەیەکی بەردەوام بەدەوری ئەستێرەی جەمسەریدا دەسووڕێنەوە، هەر بەو شێوەیە نەتەوە بە دەوری ئیمپراتۆردا دەسووڕایەوە. نەزمی سیاسی، بەشێوەی نەزمی بەرجەستەی جیهان شێوەی گرتبوو کە لە وێنە پیرۆزەکاندا فەزا پیشاندرابوو.

تێگەیشتن لە ناوەندێکی ئاینی وەك ناوەندی جیهان، یارمەتی گۆڕینی ئەو شوێنە دەدات بۆ ناوەندێکی ئابووری. بۆ نموونە لە *mesopotamia*، چالاکییە کشتوکاڵییەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا لە ژێر چاودێری ناوەندی کاربەدەستانی پەرستگادابوو. باشترین کارکردی ئابووری ناوەندی ئاینی لە ڕۆڵی ئەودا وەك هۆکارێك بۆ بڵاوبوونەوەی سەر لەنوێ شاردراوەتەوە. ئەم کارە دەکرێت هەم ئاماژە بێت بۆ چەمکی گەنجینە و هەم دابەشکردنی سەر لە نوێی کاڵاکان یاخود بەتەواوەتی لەسەر ماف خەرج کردن. شارە دێرینەکانی سۆمەر، شار — پەرستگاکانی مامبوج و *Tenochtitlan*، پایتەختی ئیمپراتۆری ئازتەك، سەرجەم نموونەن لەسەر ئەو شارانەی کە پیرۆزییان، جەختی لەسەر کۆنترۆڵی ئابوورییەك دەکردەوە، کە ئەو شارانەی بەڕێوەدەبرد. ناوچەیەکی پیرۆز دەکرێت وێنەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیش بخاتە ڕوو. بۆ نموونە گوندەکانی *Bororo* لە *matogrosso*ی بەڕازیل، وەك وێنەیەکی جیهانی بیناکرابوون. ماڵەکان بازنەیەکی خوارو خێچیان بەدەوری شوێنی نیشتەجێی پیاوەکاندا دروست دەکرد و ئەم بازنەیە لەلایەن چەند تەوەرەیەکەوە کە لەلای باکوور — باشوور و ڕۆژهەڵات — ڕۆژئاواوە بوون بۆ چوار بەش دابەش دەبوو. بەڵام ئەم دابەشکارییانە، ژیانی کۆمەڵایەتی گوند و شێوازی زەماوەندە خزمایەتییە نێو خۆییەکانیشی کۆنترۆڵ دەکرد. فەزایەکی پیرۆز دەکرێت ناوەندێك بێت بۆ پلەبەندی سەنگی کۆمەڵایەتی کە کۆمەڵگا دابەش و بینا دەکات. لە پەرستگەی *srirangam* لە باشووری هیند، لە

ناوەوەترین دوو ڕێگەی پشتوێنی کە لە نزیکترین ڕێگاکانی پەرستگاکەن، تاڕادەیەك بەشێوەیەکی تایبەتمەندانە لەلایەن بەرهەمەکانەوە بۆ نیشتەجێبوون هەڵبژێردراون. ئەو چینە کۆمەڵایەتییانەی پلەیەکی نزمتریان هەیە لە ناوچەگەلی دوورتردا دەژین.

فەزای پیرۆز بە ڕێگایەك یاخود بەچەند شێوازێك، بەشێوەیەکی مانادار لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، نەزم و ڕێکخستن بە فەزا دەبەخشێت. چونکە شوێنێکی پیرۆز هەم شایەنی بینینە و هەم شایەنی تێگەیشتنە، ئەو پەیوەندییە ئینسانیانەی کەمتر دەکەونە بەرچاو، بەرجەستە دەکات و ناوەندێکی شایەنی ناسینەوە بۆ پێکهاتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بەدیدەهێنێت.

شوێنێك، شوێنی چالاکییە ئاینییەکانە یاخود ئامانجی ئەوانە، ئەو کات ئەو شوێنە پیرۆزە. هەڵبژاردنی شوێنێك وەك شوێنێکی پیرۆز، هیچ سنووردارییەك بەسەر شێوە یاخود مانای ئەودا ناسەپێنێت. دەلالەت لە هیچ کاردانەوەیەکی ئایینی یاخود جوانناسی ناکات. بەلام ئەگەر شوێنە پیرۆزەکان مانایەکی باویان نەبێت، ڕۆڵێکی گشتییان هەیە. ناونانی شوێنێك بەناوی جێگایەکی پیرۆز، بانگەشەی ئەوە دەکات کە بونیادی ئەو شوێنە و هێماکانی دەربڕی بەهاکان و بنەما سەرەکییە کولتورییەکانن. بە پێدانی ئەم شێوە بەرچاوانە، شوێنی پیرۆز، بونیادی یەکبوونی نەتەوەیەك و دونیاکەیان بەرجەستە دەکات.

## ئەنجامگیری

ئێمە بەم گریمانەیە دەستمانپێکرد کە ئەگەر

## سەرچاوە

گۆڤاری "نامەی فەرهەنگ" ژمارە 49.

# ئەو قۆناغانەی کە مرۆڤ بۆ ناسینی خوای یەك تا بڕیویەتی

د. ئەحمەد تاج بخش

لە فارسییەوە: وریا قانیع

مرۆڤە دێرینەکان لە سەردەمی ژیانیانا سەبارەت بە هەموو ڕووداوەکان نەزان و بێ ئاگا بوون، هۆی ڕوودانی ڕووداوەکانیان نەدەزانی و پەییان پێنەدەبرد. لە بەر ئەمە گیرۆدەی ترس و دڵەڕاوکێ دەبوون، وەکو (لۆ کرتیۆس) دەڵێت: ترس دایکی خواکانە هۆیەك بووە بۆ بیرکردنەوەی مرۆڤ لە مەزهەب و بیر و ڕای ئاییینی و پەیدابوونی خواکان. پەرستنی ئەو هێزانە کە لە ژوور سروشتەوەن و باویان پەیدا کردووە.

مرۆڤی دێرین لە هەڵهاتن و ئاوابوون و گرتن و بەربوونی مانگ و خۆر و بوومەلەرزە و گڕکانەکان و چەخماخە و هەورە گرمە، لافاو، مردن، هیچی نەزانیوە و هۆکارەکانی ئەم ڕووداوانەی نەناسیوە و لێیان تێنەگەیشتووە، لەبەرئەمە نیگەرانبووە، بۆ دڵنیایی خۆی چەند خوایەکی لە مێشکی خۆیا دروستکردووە. بۆ ڕەزامەندی خواکان و ڕاکێشانی سەرنجی خواکان، دەستی بە قوربانیکردن کردووە. تاکو لە مەترسی خواکان و مەترسی ڕووداوەکانی دیکە ڕزگاریان کات، ئا لێرەوەیە کە ترس لە مردنو هەستی سەرسامبوونی لەو ڕووداوانە کە بە ڕێکەوت ڕوویانداوە. یان مرۆڤ نەیتوانیوە بزانێت هۆکارە سەرەکییەکانیان لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت. لێرەدا ئومێد بە یارمەتی خواکان و بیروڕا ئاییینییەکان لە دایك دەبن.

مرۆڤی سەرەتایی، بە بوونی ڕۆحی ئەسرار ئامێزی چیاکان و رووبار و، تاشە بەرد و دار و، خۆر و، مانگ قایل بووە وە هەموو ئەمانەی بە پیرۆز زانیوە، وە ئەم شێوە بیرکردنەوە ئاییینییە سەبارەت بە هەندێك بوونەوەر ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤ، حەزیکردووە لەگەڵ کۆمەڵێك بوونەوەری وەکو گیانداران ڕەفتار بکات و بۆ هەر یەکێکیان ڕۆحێکی بۆ دانێت. یان بە شێوەیەکی دیکە وا بزانێت کە

هەریەکەیان هێز و توانایەکی نهێنی لە دەرونیاندا هەیە.

لەگەڵ ئەمەشدا نەزانین و نیگەرانی مرۆڤ سەبارەت بە ڕووداوەکان و نەبوونی زانیاری و بێئاگابوونی لە هێز و توانای سروشت و توخمە جۆراوجۆرەکان بوەتە هۆ و پەیدابوونی بیروڕای ئایینی، هەندێك لە نەتەوە ئەسڵییەکانی ئەفریقایی هیچ جۆرە داب و نەریتێکی ئایینییان نییە هیچ جۆرە بتێك یا خوایەك یان توخمێك کە شایستەی پەرستن بێت لە ناویانا بەرچاو ناکەوێت.

هەندێك لە دانیشتوانی کامیرۆن تەنها باوەڕیان بە خواکانی شەڕ هەیە، هەرگیز لە هەوڵی ئەوەشدا نین کە ئەم خوایانە ڕازیبکەن. چونکە بە بۆچوونی ئەوان قوربانیکردن و هەموو داب و نەریتەکانی دیکە هیچ کاریگەرییەکیان نییە بۆ ئەوە کە خواکان لێیان ڕازیبن.

هەندێك لە دانیشتوانی ئەسڵی ئەمریکای باکوری باوەڕیان بە خوا هەیە و بەڵام نایپەرستن. یەکێك لەوانە وتویەتی: باوك و باپیرانمان هەمیشە ویستوویانە بزانن کە ئاوو لەوەڕی دەرو دەشت بۆ خۆراکی ئاژەڵەکانیان بەسە یان نا، لەبەرئەمە جگە لە زەوی ئیشیان بە هیچ شوێنێکی دیکە نەبووە، هەرگیز لەو بیرەدا نەبوون کە بزانن لە ئاسمانەکانا چی ڕوودەدات و دروستکەر و فەرمانڕەوای ئاسمانەکان کێیە؟

هەر کاتێك پرسیارێك لە خەڵکی ئەسکیمۆ بکرێت کە زەوی و ئاسمان کێ دروستیکردووە؟ وەرامەکەی ئەمەیە: من هیچ ئاگاداریم لەم بابەتانە نییە.

ئەڵبەتە ئەو نەتەوانە کە لەمەوپێش ئاماژەمان بۆ کردن بە دەگمەن هەن. بەشێوەیەکی گشتی زۆربەی نزیکبوونەوەی مرۆڤ لە ڕێکەوتن لەسەر ئایین، بەهۆی بوونی نیگەرانی و مەترسی و هۆکارەکانی پەیدابوونی ڕووداوەکانەوە بووە، بۆیە خواکانیان بۆ پەرستن بەکارهێناوە.

لە نێوان جۆرەکانی ترسا، ترسی مردن لە هەموویان زیاتر بووە چونکە لە ڕابردوودا کەمتر وا ڕوویداوە کە کەسێك بە مردنی سروشتی لە ڕۆژگاری دێریندا بمرێت. چونکە پێش ئەوەی پیربێت لە ئەنجامی جەنگدا لەگەڵ کەسانی دیکەدا یان لە ئەنجامی نەخۆشی جۆراوجۆر لەناو دەچوون. هەر لەمڕووەوە مرۆڤی سەرەتایی نەیتوانیوە باوەڕ بکا کە مردن ڕووداوێکی سروشتییە. لەبەر ئەمە بۆ ئەو مەسەلەیە هۆیەکی لە ژوور سروشتەوەی بۆ داناوە.

ترس لە مردن هەستێکی سەرسوڕهێنەرەو لەو ڕووداوانەیە کە بەپێی ڕێکەوت هاتوەتە پێش وە مرۆڤ هەستی بە هۆکارەکانی نەکردووە. بۆتە هۆی پەیدابوونی ئەو هۆکارە کە بیروڕای ئایینزای لێوە پەیدا بووە.

مرۆڤە سەرەتاییەکان کاتێك کە یەکێکی مردوو دەهاتە خەویان دەترسان ئەمەش بووە هۆی پەیدابوونی بیروڕای ئایینی. وایان دەزانی مردووەکان بۆ ئازاردانیان هاتوونەتەوە. لەمڕووەوە مردووەکانی خۆیان دەنایە ناو گۆڕەوە بە گڵ و بەرد چواردەوریان دادەپۆشی. تاکو نەتوانێت بگەڕێتەوە، لەناو گۆڕەکەشدا لە پەنای مردووەکەدا هەندێك خۆراك پێداویستییان بۆ دادەنا تاکو نیازی گەڕاندنەوەی نەبێت.

هەندێك مرۆڤ لە دوای مەرگی یەکێك لە خزمەکانی دیواری ماڵی مردووەکەیان کون دەکرد و لەوێوە مردووەکەیان دەبردە دەرەوە. سێجار بە پەلە بە دەوری ماڵەکەدا دەیانگێڕا لە دواییدا ئەیانبرد بە خاکیان دەسپارد. ئەمەش بەو نیازەوە بوو کە

ڕۆحەکەی ڕێگەیماڵەکە هەڵە بکات نەتوانێت بگەڕێتەوە.

بینینی مردووەکان لە خەودا، ئەو بیرەی بۆ مرۆڤ هێنایە پێشەوە، کە هەموو بوونەوەرێکی زیندوو، ڕۆح یان هێزێکی ئەسرار ئامێزی هەیە. کە دەتوانێت لە کاتی نوستنا لە لاشەیەوە بڕواتە دەر.

لە کتێبی (ئۆپانیشاد) کە لە کتێبە کۆنەکانی هیندییەکانە نووسراوە: هەرگیز کەسێکی خەوتوو بە پەلە بێدار مەکەرەوە چونکە لەوانەیە ڕۆحەکەی ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ ناو لەشەکەی خۆی هەڵە بکات کە چارەکردنی ئەوەش گەلێك دژوارە.

بە بۆچوونی مرۆڤی سەرەتایی چیا، ڕووبار، دار، ئەستێرە، بەرد، خۆر، مانگ، هەموویان توخمی پیرۆزن.

بۆ لایەنگری بۆچوونی مرۆڤە دێرینەکان، یەکێك لە نووسەرەکانی وڵاتی چین بۆچوونێکی دەربڕیوە دەڵێت:

سروشت کۆمەڵێك بوونەوەری زیندووی گەورەیە کە ڕۆحی هەندێکیان ئاشکرایە و لە هەندێکی دیکەیان شاراوەیە. لە دەروونی هەموویان بنەمای ڕۆحی مادی هەیە هەمووشیان بەرەو یەکنیازی ئەسرار ئامێز لە جم و جووڵدان. چونکە مرۆڤەکان ڕۆحی ئەسرار ئامێزیان بۆ هەموو شتێك دادەناو بە شاراوەیان دەزانی لەم ڕووەوە گەلێك خوا پەیدابوون. کە دەتوانین بە چەند دەستەیەکی ئاسمان و، زەمینی، گیاندار، ڕووەك، مرۆڤ دابەشکەین.

ناتوانین بەشێوەیەکی تەواو ڕاست بڵێین، یەکەم بوونەوەرێك کە مرۆڤ پەرستوویەتی چیبووە. بەڵام لەوانەیە مانگ بەشێك بوبێت لەو بوونەوەرە کە پەرستراوە. چونکە شەوە تاریکەکانی بۆ ڕونکردونەتەوە.

گەلێك ئەفسانە لەمبارەوە ماونەتەوە، بەڵام لە ڕۆژگارێکدا کە کشتیاری جێگەی ڕاوکردنی گرتەوە مرۆڤ زانی کە گەرمایی خۆر مایەی بەرهەمهێنانی زەوییە. زیاد لەوەش گەرمایی و ڕووناکییان پێدەبەخشێت. خۆر بووە جێگەی ڕووتێکردن و پەرستن.

باوەڕکردن بە ڕۆح و ژیانی مردووەکان بە ئەندازەیەك بوو، هەندێجار بەم شێوەیە پەیامیان بۆ مردووەکان دەنارد: سەرۆکی تیرەو بەرەبابەکان پەیامێکیان بە کەسێکدا ڕادەسپارد کە بە فلانە مردوو یان بە کۆمەڵێك مردووی ڕاگەیەنێت. لە دوای ڕاسپاردنی پەیامەکە بەبێ ڕاوەستان کابرای پەیامبەریان دەکوشت تاکو پەیامەکە ببات بۆ مردووەکان و پێیان ڕاگەیەنێت.

پەرستنی مردوویش وردە وردە برەوی پەیدا کرد بۆ شادبوونی هەموو مردووەکان. هەم بۆ ئەوەش کە ژیانیان لێتاڵنەبێت، خێرو قوربانییان بۆ دەکردن. ئەمجۆرە پەرستنە بوو بەهۆی پتەوبوونی بڕیارە کۆمەڵایەتییەکان و پەروەردەکردن و پاراستنی ڕەسم و یاسای تیرەو بەرەبابەکان.

پەرستنی مردووەکان یەکێك بوو لە بنەماکانی بەهێزبوونی پێکهاتەی بنەماڵە، ئەو ترسە کە لە سەرەتاوە هەبوو وردە وردە ترسەکە جێگەی خۆی بۆ ڕێزگرتن و بە پیرۆز زانینی مردووەکان چۆڵکرد.

پەرستنی ئەو بوونەوەرانە یان مرۆڤانە کە بە خوا دەناسران، یەکێکبوو لە قۆناغەکانی گۆڕان و پێگەیشتنی مەزهەب. دوای ئەوە کە مرۆڤ لە قۆناغە جیاجیاکانی پەرستن لە هێزە ئەسرار ئامێزەکانی ئاسمانی و ڕووەکی تێپەڕی، دەستی بە پەرستنی زیندەوەران و لە دوایشدا دەستی بە پەرستنی باب و باپیرانی خۆی کرد. هەندێجاریش ستایشی

ئایینیان بۆ پاشاکانیان کە لەو کاتەدا لەسەر تەختی دەستەڵاتدا بوون ئەکرد[1].

## ڕەسم و یاسای ئایینی:

مرۆڤ بەو هۆیانەوە کەلێیان دواین گەلێك خوایان دەپەرست، وە هەمیشە لە هەوڵدابوون کە هۆکاری دڵخۆشی و ڕەزامەندییان بە دەست بێنن. رەسم و یاسای پەیوەندیدار بەم بابەتەوە لە لایەنی جادووگەری تایبەتی تایەفەکەیانەوە کە ئامرازی پەیوەندی نێوان خواو مرۆڤبوون ڕابەرایەتی ئایینەکەیان دەکرد.

داب و نەریتێك کە بۆ ڕاکێشانی سەرنج و یارمەتی خواکان بەکاردەهات نەریتێکی چاو لێگەریبوویانی مرۆڤ هەر چییەکی کە لە خواکان داوا دەکرد، شتی وەکو ئەوەیان ئەنجام دەدا. بۆ نموونە ئەگەر حەزیان لە باران بارین بوایە، جادووگەر ئاو پرژێنی زەوی دەکرد لەسەر بەرزاییەکەوە ئاوی بە زەویدا دەڕشت.

لە نێوان ژنانی سۆمەترەدا باو بوو، ئەگەر ژنێك نەزۆك بوایە هەیکەلی منداڵێکی لەباوەش دەگرت، بەو هیوایە کە کۆرپەلەیەك لە منداڵانیا دروست ببێت.

لە مالیزیا ژنی نەزۆك، بوکڵەیەکی لە پارچەیەکی سوور دروست دەکرد وە چەند دووعایەکی دەخوێندەوە چەند کەسێکی ڕادەسپارد کە لە ناو خەڵکا هەواڵی سکپڕبوونی بۆ بڵاوبکەنەوە بڵێن بەمزوانە منداڵی دەبێت، و ئەبێتە دایك.

هەندێك لە تیرەو بەرەبابەکان ڕقیان لە هەرکەس بوایە بوکڵەیەکیان لە وێنەی ئەو کابرایە دروست دەکرد و دەیانسووتان لە هەمانکاتیشدا چەند دووعایەکیان دەخوێند لەو باوەڕەدابوون کە کابرای نەفرەت لێکراو بەم کارەیان دەمرێت. لەمەوە ئەوە دەردەکەوێت، مرۆڤەکان بۆ ئەو کارانەیان کە داوایان لە خواکانیان دەکرد، لە پێشەوە خۆیان نموونەیەکیان لەو شێوەیە ئەنجامدەدا. تاکو خواکانیان بە چاولێگەری لەوانەوە ئارەزووەکانیان بهێننە دی.

لەناو هەندێ نەتەوەدا، واباو بوو کە لە کەژی بەهاردا پیاوێك و ژنێکیان هەڵدەبژارد و بە ناونیشانی شا و شاژن لە یەکترییان مارە دەکردن و بەو هیوایە بوون کە کێڵگەو دارەکان پەندیان لێوەرگرن بەروبوومیان زۆرتر بێت. هەندێك تایەفەی وەکو دانیشتوانی (گوا) لە رۆژگاری دێریندا لە کاتی تۆوچاندندا پیاوێکیان دەکوشت، خوێنەکەیان لە زەویەکە دەپژاند تاکو بەرهەمێکی باشتریان بداتێ.

بە ناوی قوربانییەوە سەربڕینی مرۆڤ لەناو نەتەوە جیاجیاکاندا برەوی هەبوو. لەمدوایيانەدا لە نزیکی کەنداوی مەکزیك هەیکەلێکی فلزی دۆزرایەوە کە پەیوەندی بە یەکێك لە خواکانەوە هەبوو. لە دەروونی هەیکەلەکەدا پاشماوەی مرۆڤی تێدا بوو ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بەناونیشانی دیاری بۆ خواکەیان مرۆڤێکیان سەر بڕیوە.

لە ڕابردوویەکی کۆنتردا زۆربەی تایەفەکان گۆشتی مرۆڤیان دەخوارد، وەوای بۆ دەچوون کە خواکانیش حەز لە گۆشتی مرۆڤ دەکەن. بەڵام وردە وردە لە دوای پێشکەوتنی شارستانییەت، مرۆڤکردن بە قوربانی پوچکرایەوە واتە هەڵوەشایەوە. لەوەبەدواوە لە باتی مرۆڤ ئاژەڵیان دەکرد بە قوربانی.

ئەم بیروباوەڕەش هەبوو کە گوایە تایبەتمەندی هەر پارچە گۆشتێکی جەستە و رۆحی هەر بوونەوەرێك کە مرۆڤ دەیخوارد بۆ ئەو کەسە دەگوازرێتەوە کە خواردوویەتی، لەمڕووەوە هەندێك

تایەفە خواكانی خۆشیان دەخوارد لە ئەنجامدا كەسێكیان هەڵدەبژارد و وەكو خوا دەیانپەرست. لە ئەنجامدا ئەیانكوشت و خوێنەكەیان دەخواردەوە.

لە هەندێ تایەفەدا هەیكەلی خواكانیان لە دانەوێڵە دروست دەكرد جادوگەری تایەفە دووعایەكی دەخوێند تاكو هەیكەلەكەیان ببێتە خوایەكی ڕاستەقینە. لە دواییدا هەیكەلەكەیان دەخوارد.

باوەڕ كردن بە ڕۆحی هەموو شتێك، بوو بە هۆی پەیدابوونی بیروباوەڕی (فوق الطبیعة) = ئەو دیوی سروشت لەمەوە باوەڕكردن بە سیحر و جادوو لەدایكبوو. لەم سەردەمەشدا كە مرۆڤ گەیشتوەتە پلەی بەرزی ژیری و شارستانییەت هێشتا ئەم جۆرە بیرو باوەڕە لە كۆمەڵگادا بە زەقی دەبینرێت، یانی ژمارەیەكی زۆر لە دانیشتوانی گۆی زەوی هەن كە باوەڕیان بە سیحر و جادوو هەیە، هەمیشە (تەلیسم)ێك یا چەند دوعایەك بۆ پاراستنی خۆیان لە خراپەی هێزەكانی ئەودیوی سروشت هەڵدەگرن.

سیحر و جادو وردە وردە بوو بە هۆی پەیدابوونی زانست و هونەر. زانستی پزیشكی و ئەستێرەناسی و هەندێك لە زانستەكانی دیكە سەریان هەڵدا. جادووگەرەكان كە لە مرۆڤە هۆشیارەكانی تایەفەوە هەڵبژێردرابوون، هەر كاتێك لە ئەنجامدانی كارەكەی خۆیانا تێك دەشكان، تێدەكۆشان بۆ پاراستنی پێگەی خۆیان سود لە هێزە سروشتییەكان وەربگرن، ئەمەش بوو بە بنەمایەك بۆ فراوانبوونی فەرهەنگی مرۆڤایەتی. وردە وردە ئەركی ئایینی و ئەنجامدانی داب و نەریتی بنەڕەتی ئایینی جادووگەری گەشەی سەند. دەستەیەكی تایبەتی بۆ ئەنجامدانی فەرمان، (احكام)ەكانی ئایین پەیدابوون كە بە هۆی باوەڕی زۆربەی دانیشتوان، دەسەلأت و بڕشتێكی زۆریان بەدەست هێنا لە مێژووی نەتەوە جیاجیاكاندا، ناكۆكی پێشەوا ئایینیەكان لە بەرامبەر سوڵتانەكاندا بەرچاو دەكەون كە چۆن جادووگەران و كاهینەكان نەیارێكی سەرەكی و بەهێزی دەوڵەتەكان بوون. ڕۆحانییەكان لە سەردەمە جیاجیاكاندا ئوسوڵی ڕەوشت و زانست و پەروەردەیان فێری خەڵكی دەكرد پایە لەرزۆكەكانی ڕەوشتی مرۆڤیان بە كۆڵەكەكانی جیهانی (مافوق الطبیعة) ئەودیوی سروشت و ترسی خواكان ڕاگرتبوو. دڵ و دەروونی لاواز و بێهێزەكانیان داوەتەوەو ئارامییان پێبەخشیون تا ئەندازەیەك بەرگرییان لە دەستدرێژی كردنی ستەمگەرەكان كردووە.

باوەڕهێنان بە كاروبار و دەستەلأتی ئەودیوی سروشت، بوو بە هۆی چەسپاندنی مانەوەی ڕەوشت، چونكە مرۆڤ لە خواكان دەترسان. ناچار ئەو یاسا و فەرمانانە كە گەورە پیاوانی ئایینی ڕایانگەیاندبوو پەسەندی بكەن، لەبەر ئەوە كە خودی مرۆڤ گوێڕایەڵ و ملكەچ نییە، هیچ هۆكارێك وەكو ترسی خواكان نەیتوانیوە مرۆڤ لە دەستدرێژیكردن بۆ كاری خراپ و دژی مرۆڤایەتی بگێڕێتەوە. بیروڕای ئایینی بۆ مانەوەی ئوسوڵی ڕەوشت و مرۆڤایەتی گەلێك یارمەتی گەورەی پێشكەش بە مرۆڤایەتی كردووە، كۆمەك و یارمەتی مرۆڤە نەخۆش و نیگەرانەكانی داوە. بەلأم لە كاتێكدا كە زانیاری مرۆڤ پێشكەوت ناكۆكییەكانی نێوان زانستی دینیو زانستی نوێ گەشەی سەند. هەندێك باوەڕیان وایە كە سەرپێچیكردنی سەركردە ئایینییەكان لەگەڵ هەندێك لە مەسەلە زانستییە پێشكەوتووەكاندا بەرگری لە پێشكەوتنی

شارستانییەت دەکەن وەکو مەسەلەی (گالیلۆ و گەڕانی زەوی).

## بیروباوەڕی ئایینی

لە چوار چێوەی پێشەکی ئەم کتێبەدا لە بارەی پەیدابوونی هزری ئایینزایی بە شێوەیەکی کورت بابەتێکی تێدایە، کە مرۆڤ بۆ ڕاکێشانی هۆکارە باش و سازگارەکانی سروشت بۆ بەگژا چوونەوەی هۆکاری بەدو ناسازگاری سروشت، دەستی بە پەرستنی گەلێك توخم کردووە ڕواڵەتێك یان سیمایەکی بەناوی (رب النوع = بت) لە دار و بەرد و گڵ دروستکردووە گوایە بە (ویرد) و زکر و قوربانی سەرنجی ئەوانەیان ڕادەکێشا.

تیرەو تایەفەکانی ئاریایش، دەستیان بە پەرستنی مانگ و خۆر و ئەستێرە و ئاسمان و باران‌و دەریا و گیاندارانی سود بەخشی وەکو، گاو شێر و ئەسپ و سەگ و کۆتر کرد. وە بۆ هەر یەکێك لەم توخمانەی سەرەوە ناونیشانی خوایەکیان بۆ دادەنا. بە هەمان شێوە بۆ خۆپاراستن‌و بەرگریکردن لە زیان و هۆکاری ناسازگاری سروشت وەکو تاریکی، بروسکە، زستان و زیندەوەرانی زیانبەخشی وەکو مار و هەڵۆو گورگ و خشۆکەکانی دیکە (رب النوع)ێکیان بۆ دیاری دەکردن، قوربانییان بۆ دەرکردن و بڕیار نەزریان بۆ ئەدان تاکو لە زریانیان پارێزراو بن.

ئارییە ئێرانییەکان ڕووناکییان بەسەرچاوەی خێر و چاکە داناوە تاریکییشیان بەسەرچاوەی بەد رەفتاری داناوە. وە لەو باوەڕەدابوون، کە لە نێوان دەستەی خوای چاکە و خوای خراپەدا هەمیشە جەنگ و کوشتار لە ئارادایە. ئەمەش بابەتێك و بەشێکە لە بناغەی ئایینی زەردەشتدا دەردەکەوێت، هۆزە ئارياييەکان لە نێوان توخمە سوودبەخشەکانی وەکو ڕووناکی و باران لایەنگری زیاتریان هەبووە. وە لە ناو هۆکارە زیانبەخشەکانیشدا، تاریکایی و زستان ووشکەساڵی و نەخۆشی و مەرگییان بە دوژمنی ڕاستەقینەی مرۆڤ داناوە، بۆ بەرگریکردن و لەناوبردنی ئەوانە گەلێك هەوڵیانداوە.

هزری ئایینزایی هۆزە ئارياييەکان بە گورجی‌و بە پەلە گەشەیسەند، دەتوانین بڵێین یەکەم ئایینێك کە ئارياييەکان لە دوای نیشتەجێبوون لە ئێراندا و شارنشینی بونیان، شێوەی ئایینێکی نووسراوەیان دامەزراند کە ئایینی خۆرپەرستی (میهر پەرستی) بوو.

مۆڤ لە هەمان سەرەتاوە خاوەنی جۆرە بیرێکی ئایینی بووە، وە ئەم باوەڕەی هەبووە کە دەبێت هێزێکی نهێنی جگە لە بوونی خودی خۆی، ئەو ڕێنومایی ئەکات تاکو بتوانێت زیندەوەران ڕاو بکات یان پەلەوەرێك بگرێت، وە لەو باوەڕەدابووە کە سەرکەوتنەکانی لە ڕاوا پابەندی هێز و دەستەلآتێکی نادیارە، ئەگەر ئەم دەستەلآتە نادیارە یارمەتی نەدات لە هیچ ڕاوێك و کارێکدا سەر ناکەوێت و بەهرەمەند نابێت و هیچی بۆ ئەنجام نادرێت.

بەشێوەیەکی کورت مرۆڤی سەرەتایی، یان بڵێین دێرین، بە یەك بیرو ڕاوە تەماشای تەواوی بوونەوەرانی وەکو ڕووەك و زیندەوەر و بەرد و تەنە ئاسمانییەکانی دەکرد. لە دەروونی هەموو شتێکدا یەك ئەندێشەی مەزهەبی هەبووە دەستەلآتێکی بەهێزی وەك رۆحی ناسیوە. هەندێجار لەتاو ترسی زۆر لەو شتانەوە دوورکەوتووەتەوە، وە وای بۆ چووە ئەگەر دەستیان تێوەبدات گیرۆدەی بەلآو دەرد ئەبێت. ئەو شتە کە بەلای ئەوەوە خاوەنی هێزێکی نادیار و هێمادارە بۆیە مرۆڤ لێیان

دەترسێت. زاناکانی کۆمەڵناسی ئەوەیان ناو ناوە (تابو *Tabu*)

وشەی تابو لە زمانی دانیشتوانی (پۆلینزی)یەوە وەرگیراوە کە لە رۆژگارێکدا کەسێکی ئینگلیزی بە ناوی کاپیتان کوک، لە میانەی گەشتێکی خۆیا دیویەتی، کە دانیشتوان بەرانبەر بە هەندێك شت رێزێکی تایبەتییان هەیە وە بە زمانی خۆیان تابۆیان پێوتووە. لە دواییدا کە زاناکانی دیکە ئەو جۆرە شتانەیان لەناو تیرەو تایەفەکانی دیکەشدا دیوە ئەوانەشیان بە تابۆ ناو بردووە، وەلەوەبەدواوە ئەم وشەیە بلاۆبوەتەوە، لە هەموو نووسینێکدا مەبەستیان لەو شتانە بووە کە دەست لێوەدانیان قەدەغە بووە.

تایەفەکانی پۆلینزی لەو باوەڕەدابوون کە لە دەرونی تابۆدا هێزێکی نادیار و مەترسیدار هەیە کە پێیان دەوت ماناتابۆ. لەناو هۆز و نەتەوە جیاجیاکانا، تابۆ شێوەی جیاوازیان هەیە، وەکو نەخۆشی و لاشەی مردو مرۆڤی غەریب. ژن لە رۆژانی نەخۆشی مانگانەدا و سەرۆکی تیرەو خوێنو هەندێك زیندەوەرانیش بە تابو دەناسران.

تابۆ دوو جۆربوون، یەکەم شتی ناپاك و پیس دووهەم شتی پاك و پیرۆز، زاناکان ڕەگ و ریشە و رەسم و یاسا و ئادابی رەوشتییان لەمجۆرە تابۆیانەدا دۆزیوەتەوە، وە خۆ پاراستن لەوانەیان بە بناغەی گەلێك ئاداب و رەسم و یاسا زانیوە. کە پاشماوەکانی ئەو بیرو ڕایانە هێشتا لە ناو گەلێك مەزهەبدا ماونەتەوە.

ئەمرۆکەش هێشتا لەناو گەلێك نەتەوەی پێشکەوتووشدا ڕێزگرتن لە هەندێك دارو بەرد! ماوەتەوە. ڕێزگرتن لەم تابۆیانە بە درێژایی رۆژگار بە مەسەلەکانی حەلاڵ و حەرام = شایست و ناشایست، فەرمان و ئەرکی مەزهەبییان کۆتایی هاتووە. هەندێك لە زاناکان نوسیویانە کە لە لای زیندەوەرانیش بیرۆکەی ئەم تابۆیانە ئامادەیە، بۆ نموونە هەندێك زیندەوەر بەچکەکانی خۆیان دەخۆن وە هەندێکی دیکەیان خۆیانی لێلادەدەن. یان هەندێکیان گۆشتی زیندەوەری وەك خۆیان دەخۆن وە هەندێکی دیکەیان گۆشتی جۆری خۆیان بە تابۆ دەژمێرن[2].

بەو شێوەیە کە لە پێشەوە ئاماژەمان کرد بە زۆری تیرەکان و خوێن و خوێنڕشتنیان بە تابۆ دەژمارد. وە گەلێك لە مرۆڤەکان خوێن ڕژاندن و کوشتنی خزمانی نزیکیان بە ناشایست دەزانی. وە ئەگەر تاوانی وایان لێبقەومایە لەو باوەڕەدابوون کە ئەو هێزە هێمادارە یانی (مانا) زەحمەت و ئازاریان پێدەگەیەنێت.

## ئانیمێزم:

لێکۆڵینەوە لە ڕۆحی مندالأنی کۆرپە ئەو وتەیە دەسەلمێنێت، کە مندالأن گەلێك لە رۆحیانەتەکان و تارماییەکان دەترسن. هەموو مندالێك لە لاپەڕەی هزری بێگەردی خۆیا ئەم بۆچوونانەی هەیە. وا دەزانێت جیهانی دەوروبەری پڕە لە بوونەوەری نادیار کە لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیانداوە. ئەمجۆرە بیرکردنەوە لە ناو دەستەی لاوانیشدا هەیە، ئەمەش سەرەتایەك بووە بۆ پەیدابوونی باوەڕ بە جنۆکەو هاڵ و پەڕی و دێو و غول و ئەهریمەن. وە گەلێکی دیکەی لەم شێوانە. کە هەموویان میراتی هزری مرۆڤە سەرەتاییەکانن، کە تاکو ئێستاش لەلای مرۆڤی ئەمرۆکەش ماونەتەوە.

زاراوەی (*Animism*) کە لە وشەی (*Anima*) وەرگیراوە بە مانای (ڕەوان) دێت، وە بریتییە لەو باوەڕە کە دەڵێت لە هەموو تەنێك و بوونەوەرێکدا

ڕەوانێکی شاراوە هەیە یانی بە شێوەیەکی کورت مرۆڤە دێرینەکان وایان زانیوە کە هەموو شتێك تەنانەت تەنە ڕەقەکانی وەکو بەرد و ئاسن و.. هتد خاوەنی ڕەوانی تایبەتی خۆیانن. دەتوانین بڵێین کە باوەڕکردن بە مانەوەی ڕەوانی مرۆڤ لە دوای مردن کە لە تەواوی ئایینە گەورەکاندا هەیە ئەویش لەو جۆرە باوەڕەی مرۆڤە دێرینەکانەوە سەرچاوە دەگرێت.

یەکەمین ئەندێشە و بیروڕای ئانیمیزم، لە پەیدابوونی ئاشنایەتی مرۆڤ بە خەوبینینی کەسانی دیکەوە لە خەوەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەو دیمەنانە کە لە کاتی خەونا هاتوەتە بەرچاوی مرۆڤ، وایان لە مرۆڤ کردووە، کە خاوەنی خەونەکە بڕوای بە بوونەوەری نادیار هەبێت. ئەم باوەڕەش لە هزری مرۆڤدا پەیدابووە، کە هەموو مرۆڤێك خاوەنی ڕەوانیکەو لە کاتی نوستندا بە شێوەیەکی کاتی لە لەشی خاوەنەکەیا دەچێتە دەرەوە. لە دوای مردنیش لە جیهانی ڕەوانەکانا دەمێنێتەوە یان دەچێتە نێو لەشی کەسێکی دیکەوە.

نەتەوە دێرینەکان بوونی ڕەوانیان تەنها بۆ مرۆڤ دانەناوە. بەڵکو بوونەوەرە ڕووەکییەکان و زیندەوەران و تەنانەت تەنەبەستووەکانی وەکو (بەرد و ئاسن)یش بە مەڵبەندێکی نهێنی ڕەوانەکانیان دادەنا. پەیدابوونی باوەڕ بە بوونەوەرە خەیاڵییەکان و تارماییەکانی وەکو بوونی سیمای ترسناکی دێو و غول و جنۆکە، کە لە ناو کەلاوەو شوێنە لاخراو و چۆڵەکان و سامناکەکانی وەکو حەمام و کەلاوەی کۆشك و تەلاری دێرینی پان و بەرین، هەموویان لە داوێنی ئەندێشەی ئانیمیزم لەدایکبوون.

باوەڕکردن بە نفوزی ڕۆحە زیانبەخشەکان لە لەشی نەخۆشێکدا وە بردنی منداڵێکی تازە لە دایکبوو، لەلایەنی بوونەوەرێکی خەیاڵی وەکو (هاڵو شەوە) یان بیستنی دەنگی غەیبی بینینی (تارماییەکی خەیاڵی – شەبەح) لە تاریکاییدا، لەناو هەموو نەتەوەکاندا بە شێوەی جیاجیا هەیە و لە هزرا چەسپاون.

## توتەمیزم:

ڕێزگرتن لە هەندێك ڕووەك و زیندەوەر و ئاژەڵ. ئەندێشەیەکی دیکەی چاخە بەردینەکانە. هەر تیرەو بەرەبابێك ڕێزێکی تایبەتییان لە دارێك یان لە گیانلەبەرێکی تایبەتی گرتوو. ئەو بونەوەرەیان بە پاسەوانی تیرەکەی خۆیان داناوە. وشەی تۆتەم (*Totem*) لە زمانی سوور پێستەکانی ئەمریکاوە وەرگیراوە، ماناکەی یانی (شتێکی پیرۆز یان ڕێزدار) ئێستاش هێشتا تایەفە سوورپێستەکانی ئەمریکایی، گیاندارێك یان دارێك بەناونیشانی تۆتەم یان هێما و نیشانی تیرەکەی خۆیان دەستنیشان دەکەن.

لە ڕۆژگاری ئەمرۆکەشدا، گەلێك لە بیروڕا و بۆچوونی نەتەوە پێشکەوتووەکانیشدا شوێنەوارێك لە قوتابخانەی توتەمیزم لە ناویانا بە ئاشکرا دیارە. بەڵکو دەتوانین بڵێین کە وێنەی گیانداران کە بەشێوەیەی خاڵی کوتراو لەسەر جەستەی گەلێ کەسی ئاساییدا هەیە کە ئەمەش خوویەکی کۆنە و، دەتوانین ئەوانە بە شوێنەواری توتەمیزی ڕابوردوو پێناسەکەین. ئەمرۆکەش ئێمە لە میانەی لێکۆڵینەوە لە داب و نەریتی مرۆڤی پێشکەوتوشدا بە دی دەکەین. کە هێشتا ستایشی هەندێك ڕووەك و گیانداران و مارو مێرو لە ئارادایە. وەکو وێنەی گیاندارێك یان ڕووەکێك کە هەندێك نەتەوە بۆ هێمای ئاڵاکانیان هەڵیان بژاردووە و بەکاریان دەهێنن. وەکو وێنەی شێر و خۆر لەسەر ئاڵای

ئێرانی شاهەنشاهی کە هەمان شوێنەواری توتەمیزە. لە شانامەدا بۆ چەند ئاڵایەکی جیاجیای ئێرانی دێرین ئاماژە کراوە کە هەر یەکێك لە تیرەکان لە بەرانبەر سەربازگەکانی خۆیانا ئاڵاکانیان هەڵکردووە لە سەر ئاڵاکانیان وێنەی ئەستێرە یان خۆر یان گیاندارێك بە ڕەنگی جیاجیا دەکێشا وەکو وێنەی گورگ و ئەژدیها و فیل و شێرو گەلێکی دیکە. هەروەها ئارمی ئاڵاکانی ئێستاش لە نێو نەتەوە پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆکەشدا شوێنەواری بەرجەستەیان دیارە. کە لە شوێنەواری توتەمیزمەوە سەرچاوە دەگرێت، هەروەکو چۆن لە ئاڵای هەنێ وڵاتانی ئەمڕۆکەدا وێنەی گیاندار و پەلەوەرەکان بەرچاو دەکەون. وەکو وێنەی هەڵۆ لەسەر ئاڵای ئەڵمانیا و فیل لەسەر ئاڵای تایلەند و خۆر لەسەر ئاڵای کوردستان (وەرگێڕ) و یابان، وە شێر لەسەر ئاڵای سەیلان و گەلێکی دیکەی وەکو ئەمانە[3].

هێشتا لەناو دێهاتەکانی ئێراندا و دانیشتوانی سادەدا، باوەڕی ستایش کردنی ڕووەك کە لە دەروون و بیرو ڕایانا کاریگەرییەکی خەیاڵییان هەیە. یان بە هێمای ڕووناکییان داناوە لە ئارادا هەیە. وە لە لقی ئەو دارانە دەپارێنەوە کە چەند پارچە پەڕۆیەکیان پێوە بەستووە، داوا لە دارەکە دەکەن کە ئاواتەکانیان بۆ ئەنجام بدا. وە هەر کەسێك ئەو دارە ببڕێتەوە داوای کوشتن یان سزای غەیبی بۆ دەکەن. هەروەها لە بارەی گیاندارانیشەوە کوشتنی قەل و کونەبەبۆ لە کوردستانی خۆشمانا کوشتنی پشیلە بە خراپ دەزانن. لەو پاشماوانەدا کە لە کاتی هەڵکەندن و گەڕان بەدوای شوێنەوارا دۆزراونەتەوە، گەلێك وێنەو پەیکەری گیانداران و ڕووەك، کە لە سەرەتاوە بە شێوەی توتەمبوون، وردە وردە پێگەی خوایەتیان وەرگرتووە. بەرچاو دەکەون. وەکو ستایشکردنی گاو مارو مەیمون و لەلای هیندییەکان. وەستایشکردنی ئەسپ و شاهێن و بزنە کێوی لەلای ئێرانییەکانی دێرین. هەموو ئەمانە شوێنەواری تەوتەمیزمی دێرینن.

## فتیشیزم (یان پەرستنی تەنەکان):

به هەمان شێوە کە زیندەوەران و ڕووەك لەناو گەلێك لە نەتەوەکانی دێریندا جێگەی ڕێز لێنانبوون، گەلێك لە نەتەوەکانیش ستایشی تەنە ئاسمانییەکان و کەلوپەلی دیکەیانکردووە. پەرستنێکی مادی کە خاوەنی هێزێکی نهێنی و ئەسرار ئامێزە ئێستاش لەناو گەلێك تیرەو بەرە بابەکانی ئەمڕۆکەشدا هەن و ستایشیان دەکرێت و بە پیرۆزیان دادەنێن.

فتیش، وشەیەکی پرتەغالییە بە مانای (سیحر) یان (ئەفسون) دێت کە دەریاوانەکانی پرتەغالی لە سەدەی شازدەهەمدا کە کەنارەکانی ئەفریقایان دۆزییەوە، دیویانە کە ڕەشپێستەکان ڕێزێکی تایبەتییان بۆ هەندێ تەنی جیاجیا هەیە و پێیان دەڵێن (فتیش) لە دواییدا گەشتیارانی ئەو ناوچانە ئەو وشەیان بە مانای گشتی بەکارهێناوە لە هەموو شوێنێکدا پەرستنی تەنەکانیان بە فتیشیزم ناوبردووە. هەم لەم ڕۆژگارەشدا لە ناو تیرەو بەرە بابەکانی ئەفریقا و، هۆزە سوور پێستەکانی ئەمریکا و هەندێك تیرەی ئوستراليا، هەر دەستەو کۆمەڵێکیان جۆرێك فتیش دەپەرستن. ئەم شێوە پەرستنە بۆ ناو کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆکەشدا، دزەی کردووە وەکو باوەڕبوون بە تەلیسم و نوسینی چەند وشەیەکی هێما ئاسا لەسەر تەنێکی فلزی و هەڵگرتنیان، لە هەمان ڕەگ و ڕیشەی ستایش و پەرستنی تەنەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. باوەڕبوون بە ڕەوانی

نهێنی لە تەنەکانی وەکو بەرد، بووە بە هۆی ئەوە کە زۆربەی دانیشتوانی پێشکەوتوویش لەمرۆژگارەدا، بەردەکانی وەکو جەواهێرات و خشڵەکان بەتایبەتی ئەموستیلە کە لەسەر مۆرخانەکەی نەخش و هێمای رەمزی لەسەر نەخشکرابێت. بۆ ڕاکێشانی خۆشەویستی و بەرگری کردن لە خراپە لەگەڵ خۆیانا هەڵدەگرن و پارێزگاری لێدەکەن.

هەندێك لە زاناکان لەو باوەڕەدان کە پیرۆزبوونی بەردەکان و تەنە بێگیانەکان لە هەمان باوەڕی ڕابوردووەوە سەرچاوە دەگرن. ئێمە ئەمرۆکە کەسانێك دەبینین کە لەسەر میدالیای زێڕین وێنەی جۆراو جۆریان کێشاوە. وەکو ملوانکەش لە ملیانکردووە، ئەو چوار مێخە کە لە لایەنی مەسیحییەکانەوە لە دارو بەرد و فلز دروستکراون و لە کلیساکان و گۆڕستان و بەسەر دەرگای ماڵانەوە هەڵواسراون، ڕەگێکی کۆن و ڕابوردوویان هەیە.

هەندێك لەو بەردانە کە لە ئەستێرەکانی دیکەوە کەوتونەتە سەر گۆی ئەم زەویە، وەکو بەردە ڕەشەکەش کە لە سەردەمی نەزانیندا یەکێکبووە لەو تەنانە کە عەرەبەکان ستایشیانکردووە.

وردە وردەکە مرۆڤە سەرەتاییەکان پێیان ناوەتە نێو قۆناغی بەرزی شارستانییەتەوە قۆناغی بەردین یان بەجێهێشتووە و گەیشتوونەتە قۆناغی کانزاکان، سیمای فتیشیزم شێوەیەکی کامڵ تری پەیدا کردووە. وە ئایینی بت پەرستی سەری هەڵداوە. مرۆڤ لە بەرد و دار چەندین پەیکەریان دروستکردووە. وە دەستییان بە پەرستنی کردووە.

ستایشی بتی بەردین و فلزی و دارین، لە نێوان نەتەوەکانی میسر و ئاشوور و بابل و یۆنان و رۆم باوی هەبووە. بەڵام نەتەوە ئارياييەکان بە درێژایی مێژوو هیچ کاتێك بت و ئەو خوایانە کە بەرجەستە بوون نەپەرستووە. وەکو (بت) وە ئێرانییەکان یەکەم نەتەوەبوون کە ڕوویان لە یەکتاپەرستیکردووە، بۆ جیهانی یەکتاپەرستی و گەشەکردنی هزری ئایینزایی هەنگاویان ناوە.

ئەمرۆکەش هێشتا شوێنەواری بت پەرستی بە هۆی ستایشکردنی پەیکەری حەزرەتی مەسیح (ع)و قەدیسەکان بەرچاو دەکەون تەنها لە ئایینی ئیسلامدا شوێنەواری بتپەرستی و تەن پەرستی بوونیان نییە و بەرچاو ناکەوێ.

بیروباوەڕی ئایینزایی یارمەتی مرۆڤی بێ ئومێد و هیوا بڕاو دەدات. ڕۆڵێکی گرنگ سەبارەت بە پەیدابوونی ئارامی و دڵنیابوونی مرۆڤ دەگێڕێت.

ئەگەر مرۆڤ باوەڕی ئایینی نەبوایە بە ئوسوڵ و بیروباوەڕی ئایینی. بە گومانەوە تەماشای بنج و بناغەی بیرو باوەڕی ئایینی بکردبا، دەکەوتە نێو شەپۆل و گێژاوی سەرگەردانی و بیریان ئاڵۆزدەبوو. تەنها شتێك کە ئارامی بە هزری مرۆڤ ببەخشێت لەم جیهانە پڕ لە کوێرەوەریە بە ئاوات نەگەیشتنە دەست نە دەکەوت. بۆ بەش بڕاوان و تەنانەت بۆ سامانداراەکانیش ژیان ئەوەندە گران دەبوو لە تواناو وزەی مرۆڤدا نەدەبوو.

لە کاتێکدا مرۆڤ خۆی لە پاراستن و یاررمەتییەکانی بێ باك بێت. تەنها پشت بە هزر و عەقڵی خۆی ببەستێت و پەیڕەوکردنی بنج و بناغەی فەرمانەکانی ئایین بە هەوێنی پاشکەوتن بزانێت لە ئەنجامدا گیرۆدە دەبێت، تەواوی دەرگاکان لەسەرخۆی دادەخات. عەقڵی ئەو کەسەش لەو کاتەدا هیچ چارەیەکی بۆ نامێنێتەوە یان بە کوێرەوەری و نائومێدی ژیانی رۆژانەی خۆی

بەسەر دەبات بۆ ڕزگاربوون لە نەگەیشتن بە ئاواتەکانی دەست بەخۆکوژی دەکات.

لە نێو دانیشتوانی خۆرئاوادا خۆکوژی گەلێك زۆرە. بەڵام لە خۆر هەڵاتدا بەپشت بەستن بە باوەڕی ئاینی، کەمتر خەڵکی وەها هەیە کە بیر لە خۆکوشتن بکاتەوە.

ئایین هەمیشە و بە درێژایی سەردەمە مێژووییەکانی جێگای پشت پێبەستنی بەش براوان بووە وە سەر لە نوێ مرۆڤە تێکشکاوەکانی ئومێدەوار کردووەتەوە و پەنجەرەیەکی هیوایان لەسەر دەکاتەوە.

## پەراوێزەکان:

1- تاریخ تمدن، لە نوسینی ویل دورانت، لاپەڕە 99.

2- تاریخ ادیان، لە نوسینی عەلی ئەسغەری حکمەت، لاپەڕە 29.

3- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە 75.

## سەرچاوە:

تاریخ مختصر تمدن و فرهنگی ایران قبل از اسلام، نوسینی د. احمد تاج بخش، 2002.

# ژیانباشی

مالپەڕی فیدو
له عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

## ژیانباشی:

کۆڵەکەکانی ژیانباشی کامانەن؟ دەشێت کەسێك ئەوە لە چێژوەرگرتن لە دیمەنی خۆرئاوابوونێکدا ببینێتەوەو کەسێکی دیکە لە دانیشتن لەگەڵ خێزانەکەیدا بەدیبکات، کاتێك لە کەشێکی سروشتیدا پێکەوە ساتێکی خۆش بەسەردەبەن. بەکورتی، ئەو شتانەی پێداویستییەکانی مرۆڤ تێردەکەن، جا لە ڕووی دەروونییەوە بێت یان ڕۆحی، ئەقڵی، جەستەیی‌و لە هەموو لایەنێکەوە، جا تەندروستی بێت یان ئابووری‌و کۆمەڵایەتی. بەوپێیە دەتوانین بڵێین پێناسەکردنی ژیانباشی مەسەلەیەکی ڕێژەییەو لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دیکەو بەپێی پێوانەو هەڵسەنگاندنەکانی بۆ ژیان جیاوازە، بەڵام دەکرێت بڵێین ئەو کارو ڕەفتارانەیە کە مرۆڤ دەیانوێنێ بۆ ئەوەی بەختەوەری‌و ڕەزامەندی بهێنێتەدی.

بێگومان هۆکاری زۆر هەن کە جڵەوی دیاریکردنی کۆڵەکەکانی ژیانباشی دەکەن، وەك توانای بیرکردنەوەو بڕیاردان‌و کۆنترۆڵکردن، تەندروستیی جەستەیی‌و ئەقڵی، بارودۆخی بژێوی‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان، بڕوا ئاینییەکان، بەها ڕۆشنبیری‌و ژیوارییەکان، باری دارایی‌و ئابووری..هتد کە بەهۆیانەوە کەسێك دیاریی ئەو شتە دەکات کە گرنگترینە بەلایەوەو دەبێتە هۆی بەختەوەریی ئەو ژیانەی دەیگوزەرێنێت. تەندروستی دۆخی سەلامەتبوونی جەستەیی، ئەقڵی، کۆمەڵایەتی، سۆزداری، دەروونی، ئابووری‌و فێرکاری تەواوە نەك تەنیا نەبوونی نەخۆشی یاخود پەککەوتەیی. بێگومان تەندروستی‌و سەلامەتبوون بۆ هەموو مرۆڤەکان دەستەبەرناکرێن، ئەوەش دەبێتە هۆی خستنەوەی ململانێ لە ناخی مرۆڤداو کاریگەریی خراپی لەسەر تەندروستیی دەبێت.

ئەگەر لە ڕووی تەندروستییەوە بڕوانینە ژیانباشی، ئەوا چوار لایەنی بنچینەیی دەگرێتەوە کە بەم یان بەو شێوەیە کاریگەریی لەسەر تەندروستیو بگرە پەرەسەندنی مرۆڤ دەبێت:

-لایەنی جەستەیی.

-لایەنی هەستەکی.

-لایەنی ئەقڵی.

-لایەنی دەروونی.

ئەم چوار لایەنە هاوشانی ئەو پێداویستییە بنچینەییانەن کە زۆر گرنگن بۆ ژیانی مرۆڤو مرۆڤ بێ ئەوانە ناتوانێت درێژە بە ژیانی خۆی بداتو پێیاندەوترێت پێداویستییە سەرەتاییەکان:

- **پێداویستییە فیزیۆلۆژییەکان:**

هەوا، خواردن، شوێنی نیشتەجێبوون، نووستنو ئەوانی دیکە.

- **پێداویستیی ئاسایشو ئاسودەیی:**

واتە ژیان لە کۆمەڵگەیەکی بێ مەترسیدا.

- **پێداویستییەکانی تایبەت بە ئینتیما:**

قبوڵکردنی کۆمەڵایەتی، کارلێککردنی کۆمەڵایەتیو وەلائی کۆمەڵایەتی.

- **پێداویستیی نرخاندنی خود:**

– هەستکردن بە خودو بەهرە وەرگیراوەکان.

– نرخاندنو ڕێزگرتن.

- **پێداویستیی خۆناسین:**

جەستەیی، هەستەکی، دەروونیو ئەقڵی.

ئەم پێداویستیانە هاوشانی کۆڵەکەکانی ژیانباشینو بەبەشێکی تەواوکەری ئەو کۆڵەکانە دەژمێردرێن، لەدەستدانی هەریەکێکیان دەبێتە هۆی خستنەوەی ململانێ. بێگومان ئەمانە ڕێگە لەو هۆکارانە ناگرن کە بەدەرن لە ویستی مرۆڤو کاریگەرییان هەیە لەسەر کۆڵەکەکانی ژیانیو پەیوەندیان بە لایەنی تەندروستییەوە هەیە، وەك پەککەوتەیی، پیربوون، ئازار، ترس، فشاری کارکردن، جەنگ، مردن، دڵشکاوی، هیواو توانای جەستە، بەڵام پێویستە جیاوازیی لەنێوان ئەوەدا بکەین کە سروشتیە لەگەڵ ئەوەی ئەنجامی شێوازی بەهەڵە ژیان بەسەربردن یان نەخۆشی بەرهەمدێت.

## پەککەوتەیی:

پەککەوتەیی هەر بارێکە کە کاریگەریی لەسەر توانای ژیان بەسەربردنی بێ ئازارو چێژبەخش هەیە. پەککەوتەیی دەشێت ئەقڵی یان جەستەیی بێتو بەری کۆمەڵێك هۆکاری ڕاستەوخۆ بێت، وەك جینە بۆماوەکان، ڕووداو، نەخۆشیو پیربوون یاخود هۆکاری ناڕاستەوخۆ بێت ئەنجامی شێوازی بەهەڵە بەسەربردنی ژیان، نەریتە خراپەکانی خواردن، ڕەفتاری نادروستی ژنی سکپڕ، وەك جگەرەکێشانو دەرمان خواردن بێ ڕاوێژکردن بە پزیشك، یان هەر نەریتێکی خراپی دیکە کە کاریگەریی نێگەتیڤانەی لەسەر تەندروستی مرۆڤ (لە ڕووی جەستەییو دەروونیەوە) هەیەو زیانی کاتی یاخود هەمیشەیی بۆ تەندروستیی مرۆڤ دەبێت. دەشێت کەسی پەککەوتە لە سەرەتای لەدایکبوونەوە ڕاستیی پەککەوتەیی خۆی بەدی نەکات، بەڵام ئەوەی بارەکە گرانتردەکات، بەراوردکردنی خۆیەتی بەوانی دیکە کە لەشساغن، چونکە ئەمە جۆرێك لەپێوەنالاندنی دەروونی لە ناخی کەسەکەدا دروستدەکات. لێرەدا ئەوانە ئەوە لەیاددەکەن کە لەشساغەکانیش چەندین خاڵی لاوازو لایەنی پەککەوتەییان لە گەڵێك ڕووەوە هەیە. گرنگترین مەسەلە بۆ پەککەوتەکان یان لەشساغەکان ئەوەیە وەك خاڵی بێبڕوایی نەڕواننە لایەنە لاوازەکانی خۆیان، بەڵکو وەك هاندەرێك بۆ گەشەپێدانی ژیان سەیریان بکەنو دانایيە

ڕووبەڕووی گرفتەکانی ژیان ببنەوەو ئازارەکانی خۆیان لەبیربکەن‌و فێری ئەوە بن لە هەلومەرجی نوێدا چێژ لە ژیان وەربگرن.

## پیربوون:

کاتی پیربوون گەلێك جۆری پەککەوتەیی سەرهەڵدەدەن‌و زۆرجار هەمیشەیش دەبن. مرۆڤ لەم قۆناغەدا توشی دڵشکاوی‌و بێهیوایی دەبێت، هەروەها جۆرێك لە هەستکردن بە پەشیمانی‌و گوناهباری سەبارەت بە نەریتە نادروستەکانی ژیانی پێشوو هاوڕێی دەبێت‌و ئاواتەخوازدەبێت تەمەنی بگەڕێتە دواوە، هەتاکو بتوانێت ئەو هەڵانە چارەسەربکات. بەم پێیە دەبینین پیربوون یەکێکە لەو هۆکارانەی کاریگەریی زۆری لەسەر ژیانباشی هەیەو بەپێوانەی بنچینەیی ئاشنابوونمان بە چەمکی ژیانباشی دەژمێردرێت. لێرەشدا دەبێت جیاوازی بکەین لەنێوان ئەو گۆڕانکاریانەی ئەنجامی پیربوون دروستدەبن لەگەڵ ئەوانەی بەرهەمی شێوازی هەڵەی ژیان بەسەربردن‌و نەخۆشکەوتنن. چونکە مرۆڤ چاك دەزانێت چ شتێك خراپە، بەڵام چاو لەوە دەپۆشێت کە سوودبەخشە بۆی. بۆ نموونە، ئەگەرچی کەسێك دەزانێت خواردنی چەوریی زۆر دەبێتە هۆی تووشبوون بە نەخۆشیی دڵ‌و ڕەقهەڵاتنی خوێنبەرەکان‌و جەڵتە، کەچی ئەوە فەرامۆشدەکات کە خواردنی شیر دەبێتە هۆی بەهێزکردنی خوێنبەرەکان.

## ئازار:

ئامرازێکی سروشتییە بۆ دەربڕینی ئەو زیانانەی بە مرۆڤ دەگات‌و دەکرێت بڵێین ئامرازی پاراستنی مرۆڤەو دیاردەیەکی تەندروستیشە. هەندێك پێیانوایە لەخۆڕازیبوونی دەروونی کاتێك دێتەدی کە هەست بە ئازار نەکەن. ئەمەش بڕوایەکی چەوتە، چونکە ئەوە دواتر گرفتی زۆر مەترسیدار دەخاتەوە. بەناوبانگترین نەخۆشی کە هەستکردن لای مرۆڤ لەناودەبات، نەخۆشی گولییە. ڕزگاربوون لە ئازارەکانمان کارێکی سەخت نییە، بەڵام زیادەڕۆیی لە ئازارشکاندندا مەترسیی زۆری بۆ تەندروستیی مرۆڤ هەیە، چونکە هەڵە نییە مرۆڤ ئەنجامی لەدەستدانی شتێك یان تێپەڕبوون بە ئەزموونێکی تاڵدا ئازاری هەبێت. گریان یەکێکە لەو ئامرازانەی لەئازار بەدوورمان دەگرێت‌و منداڵ هەمیشە بۆ خستنەڕووی ئازارەکانی خۆی پەنای بۆ دەبات، بەڵام زوو بەسەریدا زاڵدەبێت. پێویستە فێری ئەوە بین چۆن ئازارەکانمان جڵەودەکەین، لەبەرئەوەی کاریگەرییان لەسەر بیرکردنەوەو ئەو کارانە هەیە کە لە ژیانماندا ئەنجامیاندەدەین‌و دواتریش کاریگەرییان لەسەر ژیانباشیی دەروونی‌و جەستەیمان دەبێت.

## ترس:

کاردانەوەی هەستکردنە بە ئازارو سەرچاوەکەی بڕوا بەخۆنەبوون‌و نەبوونی ئازایەتیە؟!! چونکە ترس وێنەی دەروونیی ئازارەو وێنەی ماددیش کاتێك سەرهەڵدەدات کە مرۆڤ پیردەبێت‌و هەست بە پەککەوتەیی دەکات، وەك کاتی نەخۆشکەوتن یان پێشهاتنی ڕووداوێك کە هەردووکیان کاریگەرییان لەسەر ژیانباشی هەیە.

## هیوا، دڵشکاوی‌و مردن:

هیوا لایەنی پرشنگداری ژیانە، بەڵام دڵشکاوی لایەنە تاریکەکەیەتی. بێهیوابوون‌و دڵشکاوی

گرێدراوی تەمەنێکی دیاریکراو نییە، بەڵام دەکرێت لە پیریدا بە ڕوونی ببینرێت. دڵشکاوی مانای مردنو هیواش مانای ژیانە. نموونەی زۆر هەن دەربارەی چەندین مرۆڤ کە توانیویانە زاڵبن بەسەر نەخۆشیو دڵشکاویدا. لێرەشدا ژینگە ڕۆڵێکی گرنگی هەیەو ئەوانەی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، کاریگەریی زۆریان لەسەر دۆخی دڵشکاوی لای مرۆڤ هەیە. لەبەرئەوەی هەر تاکێك پێویستی بە خۆشەویستیو سۆزو ویستی بەهێز هەیە، هەروەها پێویستی بە بڕوابەخۆبوونو نرخاندنی خود هەیەو ژینگەیەکی گەرەکە کە تیایدا هەست بە شکۆمەندیی خۆی بکاتو خۆی بناسێت، ئەمەش نەك بە وتە، بەڵکو بەکردەوەو بەبوونی یارمەتی دارایش.

## پیوەنالاندن:

مرۆڤ خۆی بەرهەمهێنی پیوەنالاندنە لە جیهاندا. ڕاستە مرۆڤ ئەنجامی پیوەنالاندنەکانی ئازار دەچێژێت، بەڵام لێوەیان فێردەبێتو سەرەنجامیش ئاستی ژیانباشیی خۆی بەرزدەکاتەوە، چونکە بەهۆیانەوە:

–تێگەیشتن لە ژیانو خۆناسینو زاڵبوون بەسەر ململانێ دەروونیەکاندا مەیسەردەبێت.

–ئاشنابوون بە پێداویستیەکان دێتەدی، هەتا ژیانێکی دەروونیو ئەقڵیو تەندروستی چاكو بێ نەخۆشی بەرێتە سەر.

–دەرك بەو هۆکارانە دەکرێت کە پەککەوتەییو کەمئەندامبوون دەخەنەوەو مرۆڤ بە شێوازەکانی خۆپاراستن لێیان ئاشنادەبێت.

–هوشیاریی بەرامبەر بەوە بەدەستدێت، هەستکردن بە ئازار کاتێك دێت کە توانای سازان لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ژیان لەدەستدەچێت.

## وەرزش:

وەرزش گرنگو پێویستە بۆ ژیانباشی، چونکە ڕێگرە لەبەردەمی چەندین نەخۆشیدا، وەك بەرزیی پەستانی خوێن، نەخۆشییەکانی دڵ، خوێن بەربوونی مێشك. هەروەها مرۆڤ لە پیریدا لە چەندین نەخۆشی دەپارێزێ. هەر چالاکییەکی وەرزشکارانە پێویستی بە بوونی چەند توخمێکی سەرەکی هەیە، یەکەم هەوای پێویستە بۆ سووتاندنی خواردن، بۆ ئەوەی وزەمان پێ ببەخشێت. بۆیە دەبینین ئەو کەسانەی جگەرەکێشن لەکاتی وەرزشدا گرفتی بەرچاویان هەیە. بەوپێیەی جگەرە کاریگەریی لەسەر وردیلەکانی خوێن هەیە کە کاردەکەنە سەر هەوا هەڵمژینو گەیشتنی بە دڵ. توخمی دوەم ئاوە، چونکە مرۆڤ بۆ هەر چالاکییەك پێویستی بەئاو هەیە، بەوپێیەی ڕێگە لە وشکهەڵاتن دەگرێتو جێی ئەو ئارەقە دەگرێتەوە کە لە لەش دەردەچێت. توخمی سێیەم خواردنە، چونکە نابێت هیچ وەرزشێك بە سکی بەتاڵ بکرێت، لەبەرئەوەی گێژبوون دەخاتەوەو ڕێژەی شەکر لە خوێندا دادەبەزێنێ. بۆیە پێویستە ژەمێکی سووك لە پێشو پاش هەر چالاکییەکی وەرزشکارانەدا بخورێت، بەڵام دەبێت خۆ لە ژەمی چەورو قورسی پێش وەرزشکردن بەدووربگیرێت، لەبەرئەوەی ئەو کاتە خوێن بەرەو کۆئەندامەکانی ناوەوە دەڕوات بۆ هەرسکردن. توخمی چوارەم لیاقەیە. لێرەشدا جیاوازی هەیە لەنێوان مەشقەکانی لیاقەو مەشقەکانی وەرزشدا. مەشقەکانی لیاقە ئەوانەن کە

لەش ئامادەدەکەن بۆ هەر چالاکییەکی وەرزشکارانەو نەرمونیانیو هێزی بەرگری دەبەخشنو نزیکەی 15 خولەك/ ڕۆژانە دەخایەنێتو هەندێك جار دەگاتە 30خولەك/ڕۆژانە. مەشقەکانی وەرزش پاش ئەوانەی لیاقە دێنو بۆ بەهێزکردنی ماسولکە هەمەجۆرەکانی لەشن. بۆ نموونە، تێنس ماسولکەی دەست بەهێزدەکاتو ڕۆژانە دوای کارکردنو بۆ کەمکردنەوەی فشار لەسەر شانی مرۆڤو بۆ بەدەستهێنانی ئۆکسجینی پێویست بەکاردەبرێت.

## جەنگەکان:

مرۆڤ بە سروشتی خۆی شەڕانگێزو توندوتیژەو خۆی بەرپرسی یەکەمە بەرامبەر بە دەستەبەرکردنی ژیانباشی خۆی، دواتر کاریگەریی ژینگەو کۆمەڵگە دێت. جەنگەکان سروشتیان هەرجۆرێك بێت: ڕەگەزیو ئایینیو سیاسی، کاریگەریی خراپیان لەسەر ژیانباشی هەیەو مرۆڤ خۆی خودو تەندروستیی خۆی بەهۆی ئەو چەکانەوە وێراندەکات کە دایهێناونو ئەو ژینگەیەشیان پێ پیسدەکات کە تیایدا دەژیو کاریگەریان نەوە دوای نەوە دەمێنێتەوە.

## فشاری کارکردن:

ئەو فشارانەی مرۆڤ ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، بەتایبەتی فشاری کارکردن، چەندین نەخۆشی دەخەنەوە، لەوانە نەخۆشیی دڵو برینی گەدەو دوانزەگرێو ئەوانی دیکە.

فشاری کارکردن ئەنجامی ئەم هۆکارانە سەرهەڵدەدات:

**بەڕێوەبردنی کار:** مەبەست پەیوەندیی بەڕێوەبەر (سەرۆك)و کارمەندەکانە، لێرەشدا ململانێ ئەنجامی سیاسەتی چەوسێنەرانەی دژی کارمەندان لەلایەكو نەبوونی ئامرازی پەیوەندیی نێوان بەرپرسو ژێردەستەکانی سەرهەڵدەدات.

**بەرپرسیارێتی:** مەبەست بەرپرسیارێتیە بەرامبەر بە هاوکارەکان، سەرمایەو خەرجیەکان. هەروەها ترس لە ڕەخنەو نەبوونی خودی بەرپرسیارێتی.

**ململانێی ناوەکی:** ئەنجامی لاوازیی کارڕاییکردن، ئاشنانەبوونی ڕوون بە ئەرکەکان، بوونی زانیاریی هەڵە یاخود زیاتر لە بەرپرسێك لە شوێنی کارکردن دێتەئاراوە. لەو شتانەی ململانێ لەسەر کار دەخەنەوە:

-زیادەکارکردن لەبەر کەم دەرامەتی.

-ڕێکوپێك نەبوونی کاتەکانی کارکردن.

## پەیوەندیی نێوان ژنو پیاو:

لە کوێ خۆشەویستیی ڕاستەقینە دەبینینەوە؟ چاکترین شوێن بۆ دۆزینەوەی خۆشەویستیی ڕاستەقینەو ئارامیو ئاسایش ناو خێزانە. چونکە ژیانی خێزانی زۆر گرنگە بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤو خۆشەویستیی ژنو مێرد بنچینەی هاتنەدیی بەختەوەرییە لە ژیانداو هۆکاری دەستەبەربوونی ژیانباشیشە.

هاتنەئارای هاوسەرگیری یاخود پەیوەندیی خێزانی بەختەوەر لەنێوان ژنو پیاودا شتێکی ئاڵۆزەو دەکرێت وەك چەکێکی دووسەرە دابنرێت. چونکە دەشێت سەرکەوتنو ئارامیی خێزان دەستەبەربکات یاخود تەڵاق بەرهەمبهێنێ کە دەبێتە هۆی لێکترازانی خێزان. دەشێت هەندێك بپرسن داخۆ شێوازێك هەبێت بۆ پاراستنی پەیوەندییەکی هەتاهەتایی، بەبێ بەردەوامبوونی خۆشەویستی؟ بەوپێیەی پەیوەندیی نێوان ژنو پیاو پەیمانێکەو کاتێك هەڵدەوەشێتەوە، ئەوا

شێوازی پەیوەندی لاوازدەبێت و کاریگەریی لەسەر سەرتاپای پەیوەندییەکە دەبێت، بەتایبەتی پەیوەندیی سێکسی کە بەیەکێك لە کۆڵەکەکانی ژیانباشی دەژمێردرێت و تاودەرەوەی ڕادەی سەرکەوتنی خێزان و ژیانە بەگشتی، پێوانەی تەندروستیی مرۆڤیشە بەگشتی و تەنیا گرێدراوی هۆرمۆنەکان نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە هەستەکانمان و تەندروستیی گشتیشمانەوە هەیە.

دۆخی دەروونی کاریگەریی هەیە لەسەر پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو. بۆیە دەبینین هەندێك نەخۆشیی وەك خەمۆکی و دەرمانەکانی چارەسەرکردنی کاریگەریان لەسەر پەیوەندیی سێکسی هەیەو دەبنە هۆی لاوازبوون و لەدەستدانی چێژوەرگرتنی سێکسی. هەروەها دەرمانەکانی نەخۆشی وەك شەکرەو دڵ و پەستاندنی خوێن کاریگەریان هەیە. فشاری کارکردن یان هەر کێشەیەك مرۆڤ دووچاری دەبێت کاردەکاتە سەر ئەو پەیوەندییە، نەك تەنیا نەخۆشییە دەروونی و جەستەییەکان. مەبەست لە هەموو ئەوانە ئەوەیە، مرۆڤ هەتا لە ڕووی دەروونی و جەستەییەوە تەندروست بێت، پەیوەندیی سێکسی ئارام و هاوسەنگ دەبێت.

پەیوەندیی سێکسی هێزێکی گەورەیەو دەکرێت ژیانباشیمان تێکبدات یاخود بیپارێزێت و پەرەی پێ بدات. چونکە بەهێزترین دیاریی داهێنەرانەی بەخشراوە بە مرۆڤ، بەوپێیەی هەستی ئارامی دەخولقێنێ و هەستکردن بە تەنیایی دەڕەوێنێتەوە. هەروەها هەتا ئەو پەیوەندییە دروست بێت، ژیانباشیمان چاکتردەبێت.. بەڵام لایەنێکی نێگەتیڤی (خراپی) ئەم پەیوەندییە هەیە کە دەبێت وریای بین، ئەویش نەخۆشییە درمییە مەترسیدارەکانە، وەك ئایدز و هەوکردنی جگەر کە لە کەسێکەوە دەگوێزرێنەوە بۆ کەسێکی دیکەو هەڕەشە لە ژیان دەکەن. بۆیە ئامۆژگاریی مرۆڤ دەکرێت بۆ خۆپاراستن و فەحسکردنی پزیشکی پێش هاوسەرگیری.

## ئارامگرتن:

شێوازەکانی ئارامگرتن سادەن و هەرکەسێك دەتوانێت جێبەجێیان بکات، وەك: پێکەنین، حەوانەوە، ڕۆیشتن، وەرزشکردن و شێوازەکانی دیکە کە مرۆڤ پەنایان پێ دەبات بۆ سرەوتنی دەروونی و قایلبوون. ئەگەرچی شێوازەکانی ئارامگرتن ئاسانن، بەڵام کاریگەریی تەلیسماوی و بەرچاویان لەسەر ڕوونی مرۆڤ لە ڕووی دەروونی و جەستەیی و هەستەکیەوە هەیە.

کێ بەرپرسیارە بەرامبەر بە گەشەپێدانی ژیانباشیمان؟

بەرپرسیارێتی لێرەدا بریتییە لە توانای مرۆڤ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاست و دروستی ئەگەرەکانی ژیان و بەشێوەیەك کە تەبابێت لەگەڵ سروشتی مرۆڤانەدا، چونکە ئەوە تاودانەوەی دەبێت لەسەر ژیانمان لەم جیهانەدا.

**یەکەم/ بەرپرسیارێتی بەرامبەر بەخودی خۆمان:**

ئەم بەرپرسیارێتییە لە ئێستاو داهاتوودا پەلوپۆدەهاوێژێ بۆ هەر شوێنێك تیایدا بژین و کاری تێدا بکەین و یاریی تێدا بکەین و بەرپرسیارێتییە بەرامبەر بە تەندروستیی جەستەیی، هەستەکی، ئەقڵی و دەروونی خۆمان. هەروەها بەرپرسیارێتییە بەرامبەر بە گەشەپێدان و پەروەردەکردنی خۆمان و بەدەستهێنانی ئەزموونی هەمەڕەنگ و بەرپرسیارێتییە بەرامبەر بەو داهاتوەی چاوەڕوانیدەکەین، بەتایبەتی کاتێك پیردەبین.

**دووەم/ بەرپرسیارێتی بەرامبەر بەوانەی پشتمان پێدەبەستن:**

هاوسەرەکەمان، منداڵەکانمان، هاوڕێکانمان لە شوێنی کارو قوتابخانەو زانکۆ، ئەوانەی لە ئێمە گەورەترن، مامۆستاکانمان.. هتد.

**سێیەم: بەرپرسیارێتیمان بەرامبەر بەوانەی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین، جا قووڵیی پەیوەندییەکەمان هەرچەندێك بێت:**

ئەم جۆرە بەرپرسیارێتییە ئەم توخمانەی گەرەکە:

– داکۆکیکردن لە پەیوەندییەکەو لە ڕێگەی ڕادەی بەشداریکردنی پۆزەتیڤانەوە کە یاریدەدەرە بۆ پێگەیشتنی ئەو پەیوەندییە.

– ڕێزگرتن لەوی دیکەو داننان بە بەشدارییەکانیدا.

– ڕێزگرتنی دوولایەنی: هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەقینە بەبێ بوونی ڕێزگرتنی دوولایەنەی نێوان لایەنەکان بوونی نییە. ئەم خەسڵەتە پێویستە لە پەیوەندیی نێوان دایكو باوك– منداڵەکان، بەڕێوەبەر– کارمەندەکاندا هەبێت، چونکە منداڵەکانو کارمەندەکان کۆیلەنینو خاوەن توانای فێربوونی شتی نوێنو کەلێنی نێوان ئەو دوولایەنە گرێدراوی کەم ئەزموونیە کە هاریکاریو ڕێزگرتنی گەرەکە.

– تێگەیشتن لە پێداویستییەکانی ئەوانی دیکە: ئەم پەیوەندییە پێویستی بە تێگەیشتنی پێداویستییەکانی هەرلایەكو کارکردن بۆ دەستەبەرکردنیان هەیە.

– بەخشندەیی: واتە بەخشندەبوون بێ چاوەڕوانکردنی هیچ بەرامبەرێك.

– دابینکردنی ئامرازی پێکگەیشتن، چونکە ئەو بەشە کاریگەرەیە کە هەر پەیوەندییەك پشتی پێ دەبەستێ، بەڵکو بناغەی هەر پەیوەندییەکە.

– جەغتکردنەوە لەسەر ئازادیی ئەوانی دیکە: هەرکەسێك لە ئێمە پێداویستیو بیروڕای جۆربەجۆری خۆی هەیە کە ژیانباشیی تایبەت بەخۆی پێکدێنێ. بۆیە پێویستە ئازادیی هەڵبژاردنی شێوازی ژیان بدرێتە دەست ئەوانی دیکە، بەڵام دەرفەتی ئاڕاستەکردنیشیان لەئارادابێت. سەپاندنی بیروڕا سەرەنجامی پێچەوانەی دەبێتو دڵشکاویو توندوتیژی دەخاتەوە، بەڵام کارپێکردنی دیموکراسی دەبێتە هۆی هاریکاریکردنو ڕێزگرتنی دوولایەنەو ئاشتیی دەروونی.

پێویستە گۆڕان لەئارادابێت، بەمەرجێك ئەو گۆڕانە تەنیا ژینگەی دەوروبەر نەگرێتەوە، بەڵکو شۆڕبێتەوە بۆ ناو هەمووومان بۆ دۆزینەوەی ئەوەی داخۆ ڕێگەکەمان ڕاستە یاخود نا. کاتێك باسی ئەو چارەسەرانە دەکەین کە کاریگەریان لەسەر ژیانباشیمان هەیە، ئەوا دەبینین چارەسەرەکان تاکەکەسینو پشت بەو کۆششانە دەبەستن کە مرۆڤ بۆ پاراستنی ژیانباشیی خۆی دەیانکات یاخود گشتینو پێویستیان بە دابینکاریی هەیە لەسەر ئاستی گشتی، بەو پێیەش کۆششەکان دەستەجەمعی دەبن.

لێرەدا دەبێت لەخۆمان بپرسین:

–ئەو لایەنانەی ژینگە کامانەن کە داکۆکی لە ژیانباشیمان دەکەن؟

–سەرچاوەکانی ئەو مەترسیانە کامانەن کە هەڕەشە لە ژیانباشیمان دەکەن؟

–ئایا مرۆڤ دەتوانێت هاوشانی ژیان لەگەڵ ئەوانی دیکە ژیانباشیی خۆی بپارێزێ؟

لەڕاستیدا سەختە پێشبینی ئەوە بکەین لە داهاتوودا چیمان بەسەردێت، چونکە ژیان لەگۆڕانی بەردەوامدایەو کەس ناتوانێت پێشبینی هیچ شتێکی تێدا بکاتو ئەو سەرەنجامانەش کە مرۆڤ پێیاندەگات بریتین لەو ئەزموونە کەڵەکەبوانەی لەلایەن ئەوانی دیکەوە بەدەستهاتوون، ئەمە وێڕای هۆکاری فێربوونو ئەو ئامرازانەی گەشەپێدان کە یارمەتی پرۆسەی پێشبینیکردن دەدەن.

هەریەکێك لە ئێمە ئەو ڕاستییە فەرامۆشدەکات کە جیهان موڵکی هەرکەسێکە کە تیایدا دەژی، نەك موڵکی کەسێکی تایبەتی، بەڵام چاوچنۆکیو لوتبەرزیو شەڕەخۆریی هۆکاری دابەشبوونی ئەم جیهانەن بۆ کۆمەڵگەی بچووك بچووك. ئەمەش کاریگەریی لەسەر باشیی ئەو ژیانە هەیە کە دەیگوزەرێنین. بۆیە دەبینین لە تاقە وڵاتێکدا ململانێی زۆر لەنێوان تاکەکاندا هەیە، ئەمەش بەهۆی پێداویستییە جیاوازەکانیانەوە. لێرەشدا سەختە ئەوەی بەدەستدێت جێی ڕەزامەندیی هەموان بێت. بۆیە پێویستە مرۆڤ فێری ئەوە بێت کار بە چارەسەری میانڕەوانە بکات بۆ تێرکردنی خواستەکانی خۆیو لێرەشدا ژینگە ڕۆڵی خۆی هەی، بەڵام ڕۆڵی مرۆڤ تەنیا لەوەدا نییە کە دەتوانێت چی بەخۆی ببەخشێت، بەڵکو ئەوەیشە کە دەیداتە ئەوانی دیکە. پێش باسکردنی ڕۆڵی ژینگە بەگشتیو مرۆڤ بەتایبەتی، پێویستە بەو دابینکاریانە ئاشنابین کە ژیانباشی دەستەبەر دەکەنو دوو جۆرن:

## دابینکاریی ڕاستکردنەوەخواز:

مەبەست چاکسازیو پاشەکشەیە لەوانەی ژیانباشیمان تێکدەدەن، بەڵام نابێت چاکسازییەکە تەنیا نەریتە پێڕەوکراوەکان بگرێتەوە، بەڵکو ئەو نەریتانەش بگرێتەوە کە لە داهاتوودا پێڕەودەکرێنو پێویستیان بە گەشەپێدانی خۆراك، وەرزشو فێربوون هەیە. چونکە هەریەکێك لەو توخمانە بەچاك یان خراپ کاردەکەنە سەر سەلامەتیو تەندروستیمان. ڕاستە لەشمان لە تەمەنێکی دیاریکراودا لە گەورەبوون دەکەوێت، بەڵام ئەقڵ هەمیشە ئامادەیە بۆ گۆڕانو هەرگیز لەبیرکردنەوە ناوەستێت. بەهەمان شێوەش باری هەستەکیمان. وێڕای ئەوە دەتوانین گەشە بە لەشی خۆمان بدەین، ئەوەش لە ڕێگەی وەرزشکردنەوە. جا لەبەرئەوەی ئازارو پێوەناڵاندن دووبەشی گرنگی ژیانی مرۆڤن، بۆیە مرۆڤ پێویستی بە دابینکاریی زیاتر لە خۆپاراستن هەیە، ئەویش چارەسەرکردنەو بریتییە لە "ئارامگرتنی دەروونی" کە یارمەتی مرۆڤ دەدات ئازارەکانی خۆی کەمبکاتەوەو هەڵەیە مرۆڤ بۆ زاڵبوون بەسەر ئازارەکاندا، کە کاریگەریان لەسەر ژیانباشی هەیە، پەنا بۆ هۆشبەرەکانو دەرمان بەرێت.

## دابینکاریی خۆپاراستنخوازانە:

ئەمەش پرۆسەیەکی چاکسازیخوازانە نییە، بەڵکو خۆپاراستنخوازانەیەو لە ڕۆژی لەدایکبوونی مرۆڤەوە، بگرە پێش لەدایکبوونیشیەوە، دەستەبەردەکرێت. بەدرێژایی سەردەمەکان دەبینین مرۆڤ بەهەڵە ژیانباشی هەڵسەنگاندوە، چونکە ئەو وەك ژیانێکی هەتاهەتایی سەیری ژیانی خۆی کردوە، کەچی دواتر بەری نەریتە خراپەکانی خۆی چنیوەتەوە، کاتێك لە تافی لاویدا پەنای بۆ دەرمانو خواردنەوەو جگەرەکێشان بردوەو لە پیریدا هەوڵی ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانەی داوەو

بێسوودبوە. ئەو دابینكاریانە لە منداڵییەوە دەستپێدەكەن‌و لێرەدا نموونەیەكی سادە دەخەینەڕوو: دانی هەمیشەیی‌و گرفتەكانی لە منداڵیەوە دەستپێدەكات‌و هۆیەكەی خۆراكی خراپە لە تەمەنی چوار مانگی سەرەتادا. هەروەها خەوشیی پێكهاتەی مێشك دەگەڕێتەوە بۆ بەكارهێنانی دەرمان لەكاتی سكپڕیدا.

ئەم دابینكاریانە پێویستیان بەوەیە بەوردی ئاوڕ لە هەموو وردەكارییەكانی ژیانمان بدەینەوە، جا لەسەر ئاستی ڕاستكردنەوەخوازی بێت یاخود خۆپاراستنخوازی. بۆیە لێرەدا پرسیارێكی گرنگ دەخەینەڕوو ئەویش: چۆن شێوازی ژیانمان چاكبكەین هەتا بتوانین ناوی ژیانێكی ڕاست‌و تەندروستی لێ بنێین؟ لێرەدا داوا لە مرۆڤ ناكرێت كەسێتی خۆی بگۆڕێت، بەڵكو داوای ئەوەی لێ دەكرێت شێوازی ژیانی خۆی بگۆڕێت‌و پلانێكی كاریگەر دابنێ، هەتاكو بتوانێ چاكتربێت لەو كۆمەڵگەیەدا كە تیایدا دەژی‌و پلانەكەشی ئەم توخمانە لەخۆدەگرێت:

### -خۆراك:

پێویستە ژەمەكانی خۆراك هاوسەنگ بن‌و میوەو سەوزەی تازە لەخۆبگرن، هەتاكو ڤیتامین‌و كانزاكانمان پێ ببەخشن. هەروەها دەبێت ژەمەكان نیشاستەیان تێدابێت، بۆ ئەوەی وزەی پێویستمان بدەنێ‌و پرۆتینی پێویستیان تێدابێت، بۆ نوێكردنەوەی شانەكان‌و ئەو چەوریانە كەمبن كە زیان بە تەندروستی مرۆڤ دەگەیەنن. دەبێت خواردنی بەیانی‌و نیوەڕۆ دەوڵەمەندبن بۆ بەدەستهێنانی وزەی پێویست، بەڵام خواردنی شەو دەبێت سوك بێت. هەروەها ئەو جۆرە خۆراكانە بخورێت كە ڤیتامین (بی‌و سی‌و ئی)یان تێدایە، چونكە بەرگریی لەش زیاددەكەن. هاوسەنگیی نێوان ڤیتامین دی‌و كالسیۆم‌و مەگنیسیۆمیش گرنگە بۆ ڕێكخستنی لێدانی دڵ‌و ئێسقانەكان. كەمكردنەوەی شەكرو چەوریش زۆر باشە، چونكە زۆر بەكارهێنانیان جەڵتەكانی خوێن دەخاتەوە.

### -ئاو:

خواردنەوەی بڕی ئاوی پێویست یاریدەدەرە بۆ ڕزگاربوون لە زیادەخوێ.

### -كۆنترۆڵكردنی قورسایی:

نابێت قورساییت لە سنورێكی دیاریكراو زیاتربێت، چونكە زیانی بۆ دڵت دەبێت، ناشبێت لە ڕادەی سروشتیی خۆی كەمتربێت، لەبەرئەوەی تووشی كەم وزەییت دەكات. چێژ لەو خۆراكە وەربگرە كە دەیخۆیت، چونكە یارمەتی هەرسكردنی چاكتر دەدات. خۆت لە شەكرەمەنی‌و ڕۆنەمەنی بەدووربگرەو جگەرە مەكێشە، لەبەرئەوەی بەرزیی پەستاندنی خوێن‌و جەڵتە دەخەنەوە. كحولیش مەخۆرەوە، چونكە تووشی بێخەویت دەكات‌و جگەرو مێشكت وێراندەكات.

### -نووستن‌و پشوودان:

هەركاتێك ڕووبەڕووی فشارو ماندوبوون بوویتەوە، پشوودان دەبێتە پێداویستییەكی گرنگ، ئەویش لە ڕێگەی ئارامگرتنێكی كورتخایان (5خولەك/سەعات)و خۆبەدوورگرتن لە دانیشتنی درێژخایانەوە. ئەگەر دووچاری خەوزڕاندنیش بوویت، دڵەڕاوكێ دات نەگرێ‌و بەئارامگرتنەوە ڕاكشێ. هیچ دەرمان یان حەبێكی خەو یاخود وریاكەرەوەی وەك كافائین‌و نیكۆتین نیوسەعات

پێش نووستن بەکارمەهێنە. لەسەر پشت ڕابکشێ و هەردوو دەستی خۆت لە تەنیشت خۆتەوە دابنێ و بەقوولّی و لەسەرخۆ هەناسەبدە، چونکە ئەوە کاریگەرییەکی سەرنجڕاکێشی دەبێت. هەندێك جار بە پێپلیکانەدا سەرکەوەو وەرە خوارەوە، لەبەرئەوەی دەبێتە هۆی سووتاندنی هەندێك کالۆری و دابەزینی قورساییت.

## -لیاقەی لەش:

پێویستە بەرنامەیەك بۆ چالاکیی لەش دابنێیت و ئەو جۆرە چالاکییە هەڵبژێری کە گونجاوە بۆت: ڕێکردن، مەلەکردن، تێنس، ڕیشەو.. هتد. لەو چالاکیانە خۆت بەدووربگرە کە ئازاری ئەژنۆکانت دەدەن، بەتایبەتی ئەگەر لەمێژە وەرزشت نەکردوە، لەبەرئەوەی دەبێت وردەوردە نەك کتوپڕ دەستپێبکەیتەوە. هەندێك ئامێری وەرزشی گونجاو بەکاربهێنە، بەڕەچاوکردنی ڕێنمایی و ئامۆژگاری پێش کڕینیان. بۆ ماوەیەکی درێژ لەبەردەم تەلەفزیۆن دامەنیشە، بەتایبەتی ئەگەر کارەکەت لەو جۆرە بوو کە جوڵەی تێدانییە.

## -دان بەخۆداگرتن و ئارامگرتن:

دەبێت دان بەخۆتدا بگریت و کۆنترۆڵی خۆت بکەیت، بەتایبەتی کاتی توڕەبوون، چونکە زیانی بۆ تەندروستیت هەیە، ئەمەش کاتێك ڕوودەدات کە فشاری کارکردنت لەسەر دەبێت یاخود ڕووبەڕووی ئاستەنگ و تەنگ پێ هەڵچنین دەبیتەوە. بۆ دەستەبەرکردنی ئەوەش کارێکی چاکە گرووپێکی هاماهەنگ لەسەر کار هەبێت کە ئامانجی بەدەستهێنانی ئارامیی دەروونیە. هەروەها کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی گرفتەکانی ژیان، شڵەژان و دڵەڕاوکێ سەرهەڵدەدەن. بیروڕاو بیرکردنەوە خراپەکانت وەلاوەنێ و بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە بیربکەرەوە، چونکە مرۆڤ تاکە بوونەوەرە کە دەتوانێت بەختەوەری بۆ خۆی بهێنێتەدی.

## -تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانت:

ئەمە جۆرێکە لە چارەسەرکردنی دەروونی بۆ هەرکەسێك و جۆرێك لە ڕازیبوون و تێرکردنی ویژدانی دەستەبەردەکات. هەر مرۆڤێك کاتی ئەم چارەسەرە دەروونییە ڕەچاوی ئەو گۆڕانکاریانە دەکات کە کاتی ناخۆشی بەسەریدا دێن، جا جەستەیی- دەروونی بێت یاخود ئەقڵی و ئەوەش بەدیدەکات سنووری ڕێگەپێدراوی بڕیوە یاخود نا. بۆ نموونە، دانکرۆشتن، خەوزڕان، هەست نەکردن بە بەختەوەری، چێژوەرنەگرتن لە ژیان، بوونی ئازاری مل و سەرئێشە، ماندووبوونی هەمیشەیی، بێتوانایی لەئاست بڕیارداندا، هەستکردن بە شەڕانگێزی و نیشانەکانی دیکە.

ئەم شێوازە ئاسانە بۆ خۆبەدوورگرتن لە هەر کێشەیەکی تەندروستی. ئەوەی جێی پێکەنینە، مرۆڤ لە ڕۆژی لەدایکبوونەوە کۆششدەکات بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری و هەمووشتێکی دەوروبەر دەخاتە خزمەتی ئەوەوە، لەکاتێکدا بەختەوەری لەناوەوەڕا هەڵدەقوڵێت و لەو کاتەدا مرۆڤ دەتوانێت ژیانێکی ئارامی دروست مەیسەربکات.

ئەمە لەسەر ئاستی ئەو شتانەی مرۆڤ پێویستی پێیانە بۆ مسۆگەرکردنی تەندروستی و سەلامەتی لەڕووی تاکەکەسییەوە، بەڵام ئەگەر فراوانترو هەمەلایەنتر بڕوانینە جێگیرکردنی تەندروستی و

سەلامەتیی گشتیی هەرکەسێك و دەكرێت بەشێوەی پێداویستیی گشتی لێكیبدەینەوە كە پەیوەندیی بە لایەنی كۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابوورییەوە هەیە، ئەوا دەبینین ژیانی مرۆڤ، وێڕای پێداویستییە سەرەتاییەكان، دەكەوێتە ژێر كاریگەریی چەندین هۆكاری دیكەوە كە لە ژینگەی دەوروبەردان. واتە پەیوەندیی بە پێكهاتەی دەروونی و ئەقڵی و جەستەییەوە نییەو مرۆڤ دەستی تیایدا نییە، بەڵام دەكەوێتە ژێر كاریگەریانەوە. ئەوانەش كۆمەڵێك سیاسەتن كە پێویستە پێڕەوییبكرێن و هەر سیاسەتێكیش پرۆگرام و كارنامەی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەمەش لەپێناو خولقاندنی جۆرێك لە بەرەنگاربوونەوە بۆ گەیشتن بە كۆمەڵگەیەكی تەندروست. ئەوانەش دەكرێت لەم خاڵانەدا كۆبكرێنەوە:

## پێداویستییە گشتییەكان:

**-وشیاركردنەوەی تەندروستیانە:**

ئامڕازێكی گرنگ و پێویستە بۆ دابینكردنی ژیانباشی و پێویستی بەچەند كەناڵێك هەیە، وەك:

-ئامڕازەكانی ڕاگەیاندن: ئەمەش یەكێكە لە ئامڕازە فێركارییە بەهێزەكان و دەتوانرێت بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی تەندروستی بەكاربرێن. تەلەفزیۆن بەتایبەتی كاریگەریی زۆرە لەسەر گەنجان و دەتوانێت وێناكردنی گەنجان بەچاك یان خراپ دەستنیشان بكات. هەروەها كەرتەكانی دیكەی ڕاگەیاندن و بەرنامەكانی ڕادیۆ ڕۆڵی گرنگیان لەم بوارەدا هەیە.

-لەناوبردنی هەر ئاستەنگێكی ڕێكخراوەیی لەبەردەم وشیاركردنەوەی تەندروستیدا.

-دانانی بەرنامەو بابەتی ڕاهێنان بۆ ئەوانەی بایەخ بە تەندروستی دەدەن، بۆ بەرزكردنەوەی هۆشمەندییان سەبارەت بە پرۆسەی تەندروستی و چەكداركردنیان بەهەر شتێك نوێ و كاریگەربێت لە بواری تەندروستیی خۆپاراستنخوازدا.

-نەهێشتنی نەخوێندەواری، چونكە بەم یان بەو شێوەیە دەبێتە هۆی چاككردنی تەندروستیی مرۆڤ، بەوپێیەی مرۆڤی خوێندەوار زیاتر لە نەخوێندەوار دەزانێت چۆن خۆی دەپارێزێت.

-دەستنیشانكردنی ئەو كەلێنەی لە سەرچاوەكانی تەندروستیی فێركاریدا هەیە.

-تەواوكردنی خوێندنێك یان ڕاهێنانێكی هونەری لەسەر هەموو ئاستە گونجاوەكان كە دەتوانێت دەرفەت بۆ خۆناسین و ڕێزی خۆگرتن و بەدەستهێنانی شارەزایی بڕەخسێنێ و یارمەتیدەرە دەبێت بۆ هێنانەدیی سەلامەتیی دەروونی.

-هاندانی بەكارهێنانی ئینتەرنێت، چونكە سەرچاوەیەكی گرنگە بۆ بەدەستهێنانی هەر زانیارییەكی تایبەت بە تەندروستی بۆ پزیشك و نەخۆشەكان پێكەوە.

**-هاوڕێكردن لەگەڵ ئەو گۆڕانكارییە خێرایانەی بەسەر بواری تەندروستیدا دێن لەسەر ئاستی جیهان بەگشتی:**

ئەمەش تەنیا لەڕێگەی پێكهێنانی دەستەیەكی ڕاوێژكاریی ڕەسمییەوە لەسەر ئاستی وڵاتەكانی دنیا مەیسەردەبێت، بۆ بەدواداچوونی گۆڕانكارییەكانی بواری تەندروستی، كە یەكێك لە ئەركەكانی دابینكردنی خزمەتگوزارییەكانی چاودێریكردنی تەندروستییە بۆ هەر تاكێك و لەئاستێكی بەرزدا. هەروەها هاماهەنگی لەنێوان ئەو دامودەزگا جۆربەجۆرانەدا دروستدەكات كە نەخشە بۆ بایەخدان بە تەندروستی دادەنێن.

**-مسۆگەرکردنی چاودێریی تەندروستی لە سەعاتەکانی شەوو پشودانە ڕەسمیەکاندا:**

واتە دامەزراندنی گەلێك ناوەندی تەندروستی لە ناوچە جۆربەجۆرەکاندا، بۆ کەمکردنەوەی فشار لەسەر نەخۆشخانەکانو دابینکردنی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان بۆ تاکەکان لەهەر کاتوجێگەیەکدا بیانەوێو بۆ پاراستنی کەسەکان لە هەر مەترسییەك کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

**-ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشیە درمیەکان:**

بۆ نموونە ئایدزو هەوکردنی جگەر، چونکە زۆر گرنگە سنووری خزمەتگوزارییە پزیشکیەکان فراوانتربکرێتەوە، نەك تەنیا بۆ کەسی نەخۆش، بەڵکو بۆ ئەو کەسەش کە هەڵگری ڤایرۆسەکانی ئەو نەخۆشیانەیەو پاراستنی لەشساغەکان لەو نەخۆشیانە، بەتایبەتی ئەوانەی لە ڕێگەی پەیوەندیی سێکسی یان دەرزیی هۆشبەر بەکارهێنانەوە دەگوێزنەوە. ئەوەش لە ڕێگەی پەرەپێدانی هەڵمەتی هوشیارکردنەوەی فێرکارانەوە بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشیی ئایدزو تووشبوون بە ڤایرۆسەکەیو ڕێگەکانی خۆپاراستنو زیانەکانی بۆ ژنو پیاو لە گشت تەمەنەکاندا. هەروەها دابینکردنی شوێنی گونجاوی خاوەن ئامێری پێویست بۆ بایەخدان بەو نەخۆشانەو مسۆگەرکردنی ئامڕازەکانی گواستنەوەو چاودێری کردنی گشتی بۆیان، لەبەرئەوەی سەلامەتیی نەخۆشەکان لە سەلامەتیی تاکەکەسی لەشساغ کەم بایەخترنییە. هەروەها دابینکردنی دەرمانو پێداویستیەکانی تەندروستی بە کەمترین نرخ.

**-مسۆگەرکردنی خزمەتگوزارییەکانی تەندروستیی گشتی:**

واتە ئەوانەی بایەخدەدەن بە پاراستنی ئاستی تەندروستیو چاککردنی لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەوەش لە ڕێگەی چاودێریکردنی دۆخی تەندروستیی گشتییەوە:

-مسۆگەرکردنی سەلامەتیی خواردنو ئاوو هەوا لە ڕێگەی دەستەی تایبەتی دانانی یاسای توندەوە.

-هاندانی ئاکاری تەندروستیی ڕاستو دروست لە ڕێگەی سزادانو خەڵاتکردنەوە.

-دامەزراندنی ئەڵقەی پەیوەندیی لەنێوان دامودەزگا تەندروستییەکانو کارگەو نەخۆشخانەو کلینیکە تایبەتیەکانی پزیشکەکاندا بۆ مسۆگەرکردنی بەخێرایی گوێزانەوەی زانیاریەکان.

-چەسپاندنی پرۆگرامە خۆپاراستخوازەکان کە ڕووبەڕووی مەترسییەکانی تەندروستیی گشتی دەبنەوەو بەرزکردنەوەی دروشمی خۆپاراستن لە چارەسەرکردن چاکترە. ئەمەش بەشێوەی بەرنامەگەلی ئاڕاستەکار کە جەغت لەسەر گۆڕینی نەریتە خراپەکان دەکەنەوەو کارپێکردنی چالاکیی وەرزشکارانەو پێڕەویکردنی سیستەمی خۆراکی دیاریکراوو شێوازە خۆپاراستنخوازەکانی دیکە لەخۆدەگرێت.

-چڕکردنەوەی کۆششەکان بۆ نەخشەدانانی زیاتر بۆ لەناوبردنی نەخۆشییە هاوردەکان یاخود کەمکردنەوەی سنووری بڵاوبوونەوەیان.

-بەرەوپیرچوونی ڕووداوە لەناکاوەکان کە لە ژینگەی دەوروبەرمان پێشدێن، ئەویش لەڕێگەی پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە تەندروستیەکانەوە لە ئاستێکی زۆر بەرزداو بە چۆنایەتیەکی چاكو بەرەچاوکردنی توانای بەئاسانی بەدەستهێنانیان.

**-سنووردانان بۆ بەکارهێنانی دەرمانەکان، جگەرەکێشان، خواردنەوە، هۆشبەرەکانو حەبی نووستن:**

چونکە ئەوانە ژینگە پیسدەکەن‌و تەندروستیی مرۆڤ وێراندەکەن‌و ڕێژەی توندوتیژی‌و تاوانکاری بەرزدەکەنەوە. بۆ ئەمەش پێویستە پێڕەویی ئەم سیاسەتانە بکرێت بۆ ڕێگرتن لەو دیاردانە:

-چاککردنی هەلومەرجی ژیان بۆ ئەوانەی داهاتیان کەمەو لەناوبردنی دیاردەی بێکاری، چونکە دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی ڕێگەونکردن.

-گێڕانەوەی سانسۆری خێزان‌و ڕۆڵی قوتابخانەکان بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکان لە ڕووی ئاکاری‌و ئەخلاقیەوە.

-دامەزراندنی بەرنامەی چارەسەرخوازانە بۆ ئەوانەی لەسەر ئەو مەسەلانە ڕاهاتوون‌و جەغتکردنەوە لەسەر قۆناغی پاش چارەسەرکردن.

-مسۆگەرکردنی شوێن‌و ناوەندی تەندروستی بۆ بایەخدان بەو نەخۆشانە.

-بوونی یاسای سزادانی توندوتیژ دەرهەق بە هەرکەسێك زیان بەتەندروستیی خۆی بگەیەنێ.

**-هاریکاریکردنی دارایی:**

زیادکردنی ئەو داراییەی بۆ تەندروستی تەرخانکراوەو بایەخدان بە پزیشکی خۆپاراستنخوازو ئەو توێژەرانەی بەدوای هۆکان‌و سەرەنجامە کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسییەکانی کێشە تەندروستیەکاندا دەگەڕێن، لەوانە ئەوەی پەیوەندیی بە بەرهەمهێنانی دەرمان‌و خزمەتگوزارییەکانی پیرو پەککەوتەکان‌و کێشە تەندروستیەکانەوە هەیە.

**-بوونی بەرنامەی تایبەت بە خزمەتگوزاریی پشتگیریکردن:**

ئەمەش ئەوەیە کە دەدرێتە پەککەوتەو پیرەکان، کاتێك خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان بەتەنیا مەبەست نییە، بەڵکو خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتیەکانیش پێویستە، لەبەر نەبوونی خۆراکی گونجاوو بۆ ڕێکخستنی کاتی دەرمانخواردن. ئەم جۆرە چاودێریکردنە پێویستی بە بوونی نەخۆشخانە نییە، لەوکاتەدا نەبێت کە توخمی مرۆیی لەماڵەوە نییە. بۆیە پێویستە ئامرازی پەیوەندیکردنی ڕاستەوخۆ بۆ ئەوانە مسۆگەربکرێت کە پێداویستیی تایبەتیان هەیە، ئەویش لە ڕێگەی دابینکردن‌و مەشقپێکردنی کەسانی شایستەوە. چونکە کەسانی بەتەمەن‌و پەککەوتە کەسانی لەشساغن‌و ڕێژەیەکی زۆری دانیشتوان پێکدێنن‌و مافی خۆیانە ژیانێکی ئارام‌و بەختەوەر بەسەربەرن. هەروەها کاری وەهایان بۆ مسۆگەربکرێت کە گونجاوە لەگەڵ پێداویستییەکانیان بۆ هێنانەدیی لەخۆڕازیبوون‌و ڕێزی خۆگرتن.

**-دابینکردنی چاودێریکردن بۆ بێلانەکان:**

ئەمەش ئەنجامی زۆربوونی دانیشتوان بەرهەمدێت‌و دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خزمەتگوزارییەکان. بۆیە پێویستە تیمی گەڕۆکی تایبەت بەتەندروستی پێکبهێنرێت کە دەتوانێت بگاتە ئەو شوێنانەی بێلانەکان تیایدا دەژین بۆ پاراستنیان لە نەخۆشی.

**-بایەخدان بە ژنان:**

ژنان ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی تەندروست‌و سەلامەتخوازداو ئەو ڕۆڵەش لە ڕاهێنانی منداڵ لەسەر نەریتە تەندروستیەکان بەدەردەکەوێت. هەروەها کاتی سکپڕبوون‌و پێڕەویکردنی نەریتێکی تەندروستیی ڕاست‌و دروست. وێڕای ئەوە، لەو سیستەمی

خۆراك ئامادەكردنەدا دەردەكەوێت كە بۆ خێزانەكەی پێڕەویدەكات. بۆیە پێویستە بایەخی تەواوی پێبدرێت و بەرەوهەموو شتێك ئاراستە بكرێت كە تەندروستە، چونكە كاریگەریی ئەوە لەسەر نەوەكان، بگرە تێكڕای كۆمەڵگەش، دەبێت.

**-جێبەجێكردنی یەكسانی لە كاركردندا:**

وەك بەهەڵە لەناو خەڵكدا باوە، نەخۆشی تەنیا ناساغی جەستەیی نییە بەتەنیا، بەڵكو ناساغی دەروونیشە. چونكە لایەنی دەروونی مرۆڤ ئەوەیە كە كۆنترۆڵی ژیانی مرۆڤ دەكات و وای لێدەكات بەختەوەرو لەخۆڕازی بێت یان دڵتەنگ و بێزار بێت و لەناو ململانێی هەمیشەییدا بژی. لەبەر پێداویستیە زۆرەكانی ژیان و ئەو گرفتانەی ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبنەوە، مرۆڤ بەدەست زۆر فشاری دەروونیی هەمەجۆرەوە دەناڵێنێ كە دەبنە هۆی تێكدانی هاوسەنگیی دەروونی و كاریگەریی لەسەر تەندروستی و سەلامەتیی دەبێت. بۆیە پێویستە نابەرابەری لەناوببرێت و دادپەروەری لەكاردا بچەسپێنرێ. بێگومان مرۆڤ ڕۆڵی گەورەی هەیە لە هێنانەدیی هاوسەنگیی دەروونیدا:

-سازانی خود و تێگەیشتن لەو گۆڕانكارییانەی لە دەوروبەر ڕوودەدەن بۆ كەمكردنەوەی فشار لەسەر خۆی و واقعیبوون لە تاوتوێكردنی هەر تەنگوچەڵەمەیەكدا كە مرۆڤی پیادا تێدەپەڕێ.

-تێگەیشتن لەوەی هەر كێشەیەك مرۆڤ پیایدا تێدەپەڕێت بەری كێشەیەكە خەڵكانی دیكەی پیایدا تێدەپەڕن و شایانی چارەسەركردنن و بەراورد بەو جیهانەی تیایدا دەژین كێشەی زۆر بچووكن.

-فێربوونی دان بەخۆداگرتن، چونكە مرۆڤ پێویستە جیاوازیبكات لەنێوان دڵەڕاوكێ و تووڕەبووندا و واقعبینانە مامەڵە لەگەڵ هەستـــەكانی خۆیدا بكات.

-توڕدانی بیرۆكە خراپەكان، بەڵام بەبێ خۆدانەدەستەوە.

-دڵخۆشی چاكترین چارەسەرە بۆ ژیانێكی هێمنی بێ فشارو بێ گرفت.

-گفتوگۆكردن سەبارەت بە كێشەكان لەگەڵ هەركەسێك كە هەست بەئارامی دەكرێت لەگەڵیدا.

**-مسۆگەركردنی بەرنامەی مسۆگەركردنی تەندروستی:**

ئەمەش مرۆڤ و خێزانەكەی لەهەر مەترسییەك دەپارێزێ كە هەڕەشەی لێ دەكات. پێویستە گەشە بەم بەرنامەیە بدرێت، بەشێوەیەك كەتەبابێت لەگەڵ پێداویستییەكانی ئەو ژیانە سەختەی تیایدا دەژی.

**-مسۆگەركردنی سەلامەتیی خۆراك و ئاوو هەوا:**

ئاوو هەواو خۆراك كاریگەریی زۆریان لەسەر تەندروستیی مرۆڤ هەیە، لەبەرئەوەی جیهان بەگشتی بەدەست پیسبوونی ژینگەوە دەناڵێنێت. بۆیە ئەو خۆراكەی دەیخۆین، ئەو هەوایەی هەڵیدەمژین و ئەو ئاوەی دەیخۆینەوە مەترسیی پیسبوونیان لەسەرە و پێویستە دابینكاریی توند بگرینەبەر بۆ پاراستنی ژیانمان، هەر لە دووركەوتنەوە لە بەكارهێنانی دەرمانی مێش و مەگەزەوە تا دەگاتە بابەتە كیمیاوی و ئەتۆمیەكان و زۆركردنی درەخت و كشتوكاڵ، چونكە دوەم ئۆكسیدی كاربۆن هەڵدەمژێ. وێڕای ئەوە جەغتكردنەوە لەسەر بەكارهێنانی ئامڕازی ژەهرهەڵمژ لە ئەگزۆزی ئوتومبیلەكاندا.

**-پاراستنی ژینگە:**

سنووردانان بۆ پیسبوونی ژینگەو ژینگەپارێزی، بەتایبەتی لەبەر چەندین دیاردە كە

مەترسیی تەنیا بۆ تەندروستی دروست ناکەن، بەڵکو بۆ ئەو ژیانەشی دروستدەکەن کە مرۆڤ دەیگوزەرێنێ، وەك دیاردەی گەرمبوونی جیهان کە هەڕەشە لەو وڵاتانە دەکات کە دەکەونە کەناری دەریاکان، بەکارهێنانی ئەو بابەتانەی زیانیان بۆ ئۆزۆن هەیە، لەوانە ئەو بەرهەمانەی ئاوێتەکانی کلۆرۆفلۆرکاربۆن‌و بابەتە هالۆجینیەکان‌و پلاستیکیەکانیان تێدایەو زیانی زۆر بە بەرگی هەوایی دەگەیەنن‌و ڕێگە بە تیشکی سەرو وەنەوشەیی دەدات بێتە سەر زەوی کە زیانی زۆر بە تەندروستیی مرۆڤ دەگەیەنێ. ئەمە وێڕای کاریگەریی ئەو بەرهەمە ژەهراویانەی لە بابەتە کیمیاویەکان دەکەونەوە.

پوختەی ئەوانەی پێشوو، ژیانباشی بەو شێوازانە دەپێورێ کە مرۆڤ لە ژیاندا دەیانگرێتەبەرو خواستی مرۆڤ بناغەیە بۆ پێوەناڵاندنەکانی‌و هەستکردنی بەئازار، چونکە ئەگەر مرۆڤ شتێکی گەرەك بێت‌و نەتوانێت پێی بگات‌و بەدەستیبهێنێ، ئەوا هەستکردن بە ئازار لەلای سەرهەڵدەدات کە شێوەیەکی دیکەی پێوەناڵاندنە، هەتاکو پێداویستیەکانی مرۆڤیش کەمبن، خواستەکانی زۆردەبن.

**سەرچاوە:**

**ماڵپەڕی فیدو** (***www.feedo.net/quality of life***).

# لەبارەی عەلمانییەت لە ئیسلام ومەسیحییەتدا

## -گفتوگۆ لەگەڵ جۆرج تەرابیشی-

* بەڕۆحانیکردنی ئایین دەروازەیەکە بەرە و مۆدێرنە
* لەتێکستی قورئانیدا وشەی "دەوڵەت" بوونی نییە
* پێویستیمان بە شۆڕشێکی تیۆلۆژی ( لاهوتی ) هەیە و هەروەها
* پێویستمان بەمارتن لۆتەرێکی موسڵمان هەیە

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

ئەم گفتوگۆیە لەگەڵ بیریار و توێژەرو وەرگێڕ (جۆرج تەرابیشی) بەبۆنەی ئەو لێکچەرەوە بوو کەلە زانکۆی ئەمەریکی لەبەیروت پێشکەشی کرد، لێکچەرەکە لەسەر بانگێشتی بەرنامەکەی ئەنیس خوری ئەلمەقدەسی پێشکەش کرا بەناونیشانی (تۆوی عەلمانییەت لەئیسلامدا)) کەچندین مشتومڕو پرسیاری وروژاند.

مۆڤ ناتوانێت بەسەسارمییەوە لەئاستی بەشدارییە گرنگ و پڕ بەهاکانی جۆرج تەرابیشی لەرۆشنبیریی عەرەبیدا نەوەستێت. تەرابیشی لەسەرەتادا دەستی کرد بەوەرگێڕانی بەرهەمەکانی فرۆیدو هیگڵ و هەروەها فەرهەنگی فەلسەفەو مێژووی فەلسەفە و زۆری تریش کەژمارەیان لە (220) کتێب زیاتر بووە، دواتر چەند کتێبێکی ڕەخنەیی چاپکرد، لەوانە (قەسابخانەی کەلەپور لەرۆشنبیریی هاوچەرخی عەرەبیدا) و (خۆرهەڵات و خۆرئاوا: نێرینەیی و مێینەیی) و (لەڕێنیسانسەوە بۆ هەڵگەڕانەوە) تادەگاتە کتێبی (تیۆری ئەقڵ) و زنجیرەی (ڕەخنەی ڕەخنە لەئەقڵی عەرەبی) کەبەرپەرچی تیۆر و بۆچوونەکانی محەمەد عابد جابری دەداتەوە، دوا کتێبی ئەو زنجیرەیەش بریتیە لە: (ئەقڵی دەست لەکارکێشراو لەئیسلامدا).

تەرابیشی لەوتەکانیدا دەچێتە سەر ئیشکالیەتە بنچینەیی و جومگەییەکانی کولتووری عەرەبی، لەئەزموون و کۆششی ڕەخنەیی خۆیشیدا سەرقاڵی بنیاتنانی ڕوانینێکە شوێنی شیاوی ئەقڵ و ئامادەیی میتۆدگەرایی بگەڕێنێتەوە، ئەمە جگە لە بوێری لەوتندا و ڕاستگۆیی

لەپرۆسەدا و کرانەوە بەرامبەر ئەویتر، ئەمانە وەکو چەند کۆڵەکەیەك کەدەبێ لەجەنگی مۆدێرنەدا بوونیان هەبێت.

* بەبۆچوونی تۆ، بۆچی تۆوی عەلمانییەت ، وەك تێکست و وەك پرۆسە، لەئیسلامدا گەشەی نەکردووە؟

– لەبیرمان نەچێت ئیسلام لەبنەڕەتدا بریتییە لە ئاینێك کەلەڕووی مێژوویی و ڕۆحییەوە سەر بە ((درەختی ئیبراهیمی))یە، واتە سەر بەئەسڵی هاوبەشی هەرسێ ئاینە سەرەکییەکەیە: یەهودییەت و مەسیحییەت و ئیسلام کەئیبراهیم سەرەتا و سەلەفی هاوبەشی هەرسێ ئایینەکەیە. گرنگ ئەوەیە بونیادی هاوبەشی ئەو سێ ئایینە کەلەسەر (سروش) و (پێغەمبەرایەتی) ڕاوەستاوە، بە ((یەکێتی یونیادە ئەفسانەییەکان)) ناودەبرێت. پاشان پێم وایە ئەوەی بۆ هەردوو ئاینەکەی تر راستە بۆ ئیسلامیش هەروایە.

باوەڕم وانییە یەهودیەت لەو بوارەدا ئەزمونێکی مێژوویی گەورەی هەبێت، چونکە وەکو ئاینێکی نەتەوەیی مایەوە. ئەگەر بشێت لێرەدا بەراورد لەنێوان ئاینەکاندا بکەین، ئەوا بەراوردی بنچینەیی لەنێوان ئیسلام و مەسیحییەتدایە. مەسیحیەت، وەك هەمیشە دەوترێت، لەهەناویدا تۆوی عەلمانییەتی هەڵگرتووە بەپێی ئەو دەستەواژە ئینجیلییە ناودارەی کەدەڵێت: ((ئەوەی هی قەیسەرە بیدەنە قەیسەر و ئەوەیشی هی خودایە بۆ خودا)) (ئینجیلی مەتتا 22:21)، ئەم رستەیە کەروخسارێکی گەورەی عەلمانیەتە، یان ئیمکانێکە بۆ عەلمانیەت، یان بۆ جیاکردنەوەی خودایە لەقەیسەر ، یاخود جیاکردنەوەی ئایینە لەدەوڵەت.

لەبەرامبەر ئەمەدا، زۆر شت لەقورئان و فەرمودەکاندا هەیە تێڕوانینێکی عەلمانییانە دەردەخات، دیارترینیان فەرموودەی دەرزی ئاژنکردنی دارخورمایە یاخود متوربەکردنی خورما (تأبیر النخل): ڕۆژێکیان پێغەمبەر بەیەکێ لەگەڕەکەکانی شاردا تێدەپەڕێت، گوێی لەزیکە زیکێك دەبێت، ئەو دەنگەی بەلاوە سەیر بووە وتی: ((ئەوە چییە؟)) وتیان: ((دار خورماکان دەرزی ئاژن دەکەن)) واتە دەیکوتن یان متوربەی دەکەن، ئەویش وتی: ((ئەگەر ئەو کارەش نەکەن خۆی باش دەبێت))، ئیدی وازیان لەکوتانی دارخورماکان هێنا، کەچی دواتر – وەك فەرموودەکە دەڵێت – خورماکان پێنەگەیشتن، هاتن بۆلای پێغەمبەر و گلەییان لێکرد و وتیان: ((ئێمە بەقسەی تۆمان کرد کەچی خورماکان نەگەیین))، وەڵامی دانەوە: ((من بەشەرم و کشتیار نیم، ئێوە لەمن باشتر لەکاروباری دونیایی خۆتان شارەزان)). ((أنتم أعلم بشؤون دنیاکم مني). لەفەرموودەیەکی تردا دەڵێت: ئێوە ژیانی دونیاییتان بۆ خۆتان و بۆ منیش ئاخیرەتان (لکم دنیاکم ولی اخرتکم). لە شوێنێکی تردا دەڵێت: ئەوەی لەزمانی خوداوە وتومە ڕاستە و ئەوەیشی خۆم وتوومە ئەوا منیش بەشەرم هەڵەش دەکەم و ڕاستیش دەپێکم (و ماقلته عن الله فهو حق وما قلته من قبل نفسي فأنا بشر أخطيء واصيب).

ئەو شتە جیاوازانەی پێغەمبەر دەیانکات، وەکو کەسێك سروشی خودایی دەگوازێتەوە و وەکو مرۆڤێك هەڵە دەکات و ڕاستیش دەپێکێت و وەکو بەشەرێك مامەڵە لەگەڵ کاروباری دونیاییدا دەکات، ئەگەر بەباشی تەوزیف بکرێت، لەڕووی دەلالەت و ماناوە هیچی کەمتر نییە لەدەلالەتی دەستەواژە ئینجیلییە ناودارەکەی مەسیحییەت. بەڵام جیاوازییە گەورەکە لەوەدایە کەلە مەسیحیەتدا لەو

دەستەواژەیەوە عەلمانییەت دەستی پێنەکردووە، بەڵکو لەو کاتەوە دەستی پێکردووە کە خۆرئاوا بەعەلمانیکرا، دواتر گرنگیی ئەو رستەیەیان لەئینجیلدا بۆ دەرکەوت و لەپێناوی پتەوکردنی عەلمانییەت و پێداگرتن لەسەر جیاکردنەوەی ئایینی لەدونیایی بەکاریان هێنا، نابێ ئەوەش لەیادبکەین کەخودی خۆرئاواش بەسروشتە مەسیحییەکەی بەدرێژایی هەزار و پێنج سەد ساڵ ئایین و دەوڵەتی تێکەڵ کردبوو، بەتایبەتی لەوکاتەوەی کەدەوڵەت لەسەر دەستی قوستەنتین لەساڵی 333ی زاینیدا دەوڵەتێکی ئایینی مەسیحی بوو تا هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسە لەساڵی 1789دا کەئایینی لەدەوڵەت جیاکردەوە. لەو کاتەنەدا دەوڵەت بە ((ئیمپڕاتۆریەتی پیرۆزی ڕۆمانی)) و ((ئیمپڕاتۆریەتی پیرۆزی جێرمانی)) ناودەبرا. باشە، ئەو دەستەواژەیە لەکوێدا کاری لەمەسیحییەت کردووە؟ بێگومان ئەو رستەیە لەپاش بەعەلمانیکردنی خۆرئاوادا پتر بایەخی پێدرا وەك جەختکردنێك لە بوناوبوون (صیرورە)ی عەلمانییەت.

من لەگەڵ پاپا یواکیم موبارەکدا هاوڕام کەتێبینی ئەوەی کردووە زۆربەی خۆرهەڵاتناس و ئەوانەی لەبواری ئیسلامۆلۆجیدا کاردەکەن و تەنانەت هەندێ لەسیاسەتمەدارە بەرژەوەندیخوازەکان، ئەو دەستەواژە ئینجیلییەیان لەدژی ئیسلام بەکاردەهێنا و دەیانوت ئێمە لەبنچینەدا عەلمانین یان ((بەعەلمانیکراوین)) بەڵام ئێوە عەلمانیخواز نین، ئەستەمە ئێوە بتوانن بچنە ناو مۆدێرنەوە وەك ئەوەی ئێمە چووینە ناوی.

* بەڵام ئایا جیاوازییەکان لەئاستی ئەزمونی مێژووییدا چین؟

– جیاوازی گەورە لەنێوان تۆوی یەکەم و بیری یەکەمی عەلمانییەتی ناو هەردوو ئایینەکەدا نییە. چونکە ئەوەی ئیسلام وا پێناسە دەکات کەبریتیە لە ((دین ودەوڵەت)) (ئەو دەستەواژەیەش بەهۆی حەسەن بەنناوە بڵاوبۆوە) زیادەڕەوی دەکات. تۆ تێبینی ئەوە بکە وشەی ((دەوڵەت)) نەلە تێکستی قورئانی و نەلە فەرموودەکانی پێغەمبەردا بوونی نییە، وشەی ((دەوڵەت)) مۆدێرنە هێناویەتی و پاشان لەئیسلامیشدا برەوی پەیداکردووە. کاتێك دەچینە سەر هەزاران هەزار فەرموودەی راست و فەرموودەی دانراو، هیچ جێکەوتێکی وشەی دەوڵەت نابینین.

جیاوازیی گەورە لەئەزموونی مێژووییدا ئەوەیە کە مەسیحییەت – بەرلەوەی قوستەنتین ببێت بەمەسیحی – بەسێ سەدەدا تێپەڕیوە و هیچ پەیوەندییەکی بەسیاسەتەوە نەبووە بەڵکو لەماوەی ئەو سێ سەدەیەدا مەسیحییەت بریتی بوو لەئەزموونێکی تەواو رۆحی و تەنزیهی، بەڵام کاتێك قوستەنتین بوو بە نەسرانی و دەوڵەتی کرد بەدەوڵەتێکی مەسیحی، ئەوسا دین و دەوڵەت ئاوێزانی یەکتر بوون. کەچی لەئیسلامدا ئەو ماوەیەی کەئایین پەیوەندی بەسیاسەتەوە نەبوو تەنها سیانزە ساڵ بووە (لەمەسیحییەتدا سێ سەدەبوو)، واتە قۆناغی مەککە قۆناغی جیاکردنەوەی ئیسلامی رۆحی و ئیسلامی دونیایی بوو، واتە ئیسلامی تەواو رۆحی و تەنزیهی کەئەو قۆناغە دەوڵەمەند بوو بەحیکمەتەکانی ئاخیرەت، بەڵام کاتێك پێغەمبەر لەمەککەوە بۆ مەدینە کۆچی کرد، لەقورئاندا ئەو شتانە دەرکەوتن کەپەیوەندییان بەدونیاو مەرجەکانی عیبادەتەوە هەیە، پاشان سروشتی پەیوەندی نێوان دین و دونیا لەئیسلامی مەدەنیدا گۆڕانکاری بەسەردا

هات. لەدوای دەساڵ ئیتر ئیسلام چووە ناو بواری سیاسەتەوە، کەچی مەسیحییەت بۆماوەی سێ سەد ساڵ ئاینێکی رۆحانیی پەتی بووە دوای ئەوە بوو بەدەسەڵاتێکی زەمەنی بەڵام لەوێشدا توانی پەرە بەرۆحانییەتی ئایینی بدات.

مەسیحییەت ڕووبەڕووی دەوڵەتێك بووەوە کەبریتی بوو لە ئیمپڕاتۆریەتی رۆمانی، بەڵام ئیسلام لەنێو دەوڵەتدا نەبوو و ڕووبەڕووی دەوڵەتیش نەبوو، لەڕۆژگاری ژیانی پێغەمبەریشدا ((دەوڵەت)) دانەمەزرا، بەڵکو لەگەڵ فتوحات و ئەبوبەکر و عومەردا سەرەتاکانی دەوڵەت دامەزرێنرا.

لەبەرامبەر ئەم جیاوازییەی نێوان هەردوو ئەزمونەکەدا، دەبینین ڕێگەی عەلمانییەت لەئیسلامدا دژوارتر و سەختترە تامەسیحییەت. بۆچی؟ چونکە ئیسلام هەر لەسەرەتاوە تێکەڵ بەمێژووی سیاسی و زەمەنی بوو، بێگومان بێئەوەی نکۆڵی لەتۆوە سەرەتاییەکان بکەین. کەسێك شارەزای مێژووی ئیسلام بێت یان مێژووی ئیسلامی بخوێنێتەوە، بەتایبەتی مێژووی پاش خولەفاکانی ڕاشدین، جیاکاریی نێوان سیاسی و ئایینی لەسەرەتاکانی ئیسلامدا دەبینێت، عەلی هاتو پایتەختی گواستەوە بۆ کوفە، موعاویە هاتو دوودڵ نەبوو لەوەی پایتەخت بۆ دیمەشق بگوازێتەوە کەئەوسا زۆرینەی دیمەشق مەسیحی بوون، هەروەها عەباسییەکانیش هەمان شتیان کردو پایتەختیان بۆ بەغدا گواستەوە، پاشان تورکەکان هاتن و گواستیانەوە بۆ قوستەنتینیە کەیەکەمین پایتەختی مێژوویی مەسیحییەکان بوو.

کاتێك سیاسەت هاتە ناوەوە، بەسەر ئاینڈا زاڵ بوو، تەنانەت لەپایتەختی دەوڵەتیشدا. پاشان ئیسلام دووەمین لێکترازانی گەورەی لەنێوان هەردوو دەسەڵاتەکەدا (سیاسەت و ئایین) بەخۆوە بینی، بەتایبەتی لەو فەرمودانەدا کەدواتر درانە پاڵ پێغەمبەر ئەوکاتەی (بەنوئومەییە) خەلافەتیان گرتە دەست و زوڵمێکی گەورەیان لەگەلانی موسوڵمانی ژێر دەسەڵاتیان کرد، ئیدی چەندین فەرمووده لەدژی بەنوئومەییە دەرکەوتن وەکو ناڕەزاییەك، ئەو فەرمودانە جەخت لەوە دەکەن کە پێغەمبەر پێشبینی کردووە کەخەلافەتەکەی سی ساڵ دەخایەنێت و دوای ئەوە پاشاییەکی زۆردار و تەماحکار یان گازگر (ملك عضوض) دێت. کاتێکیش موعاویە ویستی لەرێگەی بەیعەوە پێشوەخت خەلافەتی دوای خۆی بۆ یەزیدی کوڕی جێبهێڵێت، وتی: ((لەسەر سوننەتی خواو پێغەمبەر)) (علی سنة الله ورسولة) ، یەکێك لەهاوەڵان وەڵامی دایەوە: ((نانەخێر، تۆ دۆرزنیت! بەڵکو ئەم بەیعەیە لەسەر سوننەتی کیسراو قەیسەرە، نەموحەممەد و نەئەبوبەکر و نەعومەر کەسیان خەلافەتیان بەمیرات بۆ کوڕەکانیان جێنەهێشتووە)).

تێبینی ئەوە دەکەین لەسەرەتاکانی ئاگایی ئیسلامیدا جیاوازی کراوە لەنێوان کیسرا و خەلافەت و شێوەی دەسەڵات، واتە لێرەدا ناڵێم هەردوو دەسەڵاتەکە لێکدی جیاکراونەتەوە، بەڵکو تۆوی جیاکردنەوەی نێوان دەسەڵاتی سیاسی و دەسەڵاتی ئاینی هەبووە. پاشان من تێبینی ئەوە دەکەم کاتێك ناکۆکی و ململانێی سیاسی لەڕۆژگاری خەلیفەکانی ڕاشدیندا روویدا، سیاسەت کەوتە پێش ئاینەوە. کاتێك موقەدەس یان پیرۆز ڕووبەڕووی شتی ناپیرۆز یان (مودەنەس، پیس و گڵاو) دەبێتەوە، دەبینین ئەمەی دواییان برەوی زیاتری هەیە، تەنانەت ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر کۆچی دوایی کرد و بگرە بەر لەناشتنیشی، ناکۆکییەکی گەورە لەسەقیفەی بەنی ساعدە سەریهەڵدا، لەنێوان

ئەنسار و موهاجیرینەکاندا شەڕە جنێو دەستی پێکردو تەنانەت شمشێریشیان لەیەکتر هەڵکێشا، لەنێوانیاندا دابەشبوون دروست بوو، پێشوەخت عەلی دوورخرایەوە، ململانێیەکی سیاسی توند و بێڕەحم لەسەر دەسەڵات هەڵگیرسا، ئایین لەپێناوی سیاسەتدا بەکارهێنرا و ئەبوبەکریان کرد بەخەلیفە. لەساتەوەختی هەرچوار خەلیفەکەدا خەلافەت بوو بەشوێنی کوشتنی موسڵمانان. موسڵمانەکان — سا لەسەردەمی خەلافەتی راشدین بێت یاخود لەسەردەمی ئومەوی و عەبباسی و فاتمیدا — بەو ئەندازەیە نەکوژران وەك لەو ململانێیانەدا کوژراون. قوربانیانی موسوڵمانان لەو جەنگ و ململانێیانەدا زۆر زیاتر بوو لەو زیان و قوربانییانەی لەفتوحاتدا بەریان کەوت! لەوەش زیاتر، سێ خەلیفە لە خەلیفەکانی راشدین کوژراون و بگرە لاشەکەی عوسمانیان شێواند، یەکێ لەوانەی بەشداریی ئەو کارەی کرد محەمەدی کوڕی ئەبوبەکر بوو کەچارەنووسی ئەمیش کوشتن بوو، گرتیان و خستیانە ناو پێستی گوێدرێژەوە و ئاگریان تێبەردا! هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر و حەسەن و حوسێن کوژران و شاری مەدینە گەمارۆدرا، هەروەها شاری مەککەیش گەمارۆدرا و دایانە بەر مەنجەنیق بێئەوەی حورمەتی هیچ شتێك بگیرێ، کەعبەیش سووتێنرا، ئەم توندوتیژییە لەنەوەی یەکەمی ئەسحابەکاندا بەردەوام بوو کەئەوسا سیاسەت خرایە پێش ئایینەوە.

ئەگەر بڵێین عەلمانییەت، لەهەندێ پێناسەدا، درێژکراوەی سیاسەتە بەشێوەیەکی بەردەوام، ئەوا ئەم دۆخە واقیعی دەوڵەتە لەئیسلامدا. سەرجەمی خەلیفەکانی چەرخی عەبباسی، بەتایبەتی پاش ئەوەی بوەیهییەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، دەسەڵاتی ئاینییان بۆ خەلیفەکان جێهێشت. کەواتە لەئیسلامیشدا ئەو شتە ڕوویدا کەلەخۆرئاوادا لەنێوان پاپاکان و پەتریارکەکان و پاشاکاندا هەبوو. لەئیسلامیشدا ململانێیەکی لەو چەشنە لەنێوان خەلیفەکان و میرەکان و سوڵتانەکاندا ڕوویدا. ئەم جیاوازییە بەڕوونی لەناوەکانیاندا دەرکەوت، بۆ نموونە ناوی خەلیفەکان بەم شێوەیە بوو: (المتوكل بالله، المتعضد بالله، المعتصم بالله) ، کەچی لەلای سوڵتانەکاندا ناوی لەم چەشنە هەبوو: (معز الدولة، سيف الدولة، عضد الدولة). لێرەدا ئەو جیاوازییە ڕوون بووەوە کەخەلافەت سەر بە لاهوتە (تیۆلۆجیا) و سیاسەتیش سەر بەدەوڵەت. لەراستیدا دەسەڵاتیش لەلای خەلیفەکاندا نەبوو، بەڵکو پتر میر و سوڵتانەکان خاوەن دەسەڵات بوون. هەموو ئەم ڕواڵەت و ئەم پێشەکییانە نیشانەی ئەوەن کەئەفسانەی ئیسلام وەکو دەوڵەت، بریتییە لە ئەفسانەیەکی ئایدۆلۆجی کەبەرهەمی مۆدێرنەیە، نەك راستییەکی مێژوویی بێت و لەناو ئاینەوە هاتبێت.

من ئەو هەموو پێشەکییەم هێنایەوە تائەوە بڵێم کە بۆ ئیسلامیش ئەوەندە زەحمەت نییە بچێتە ناو عەلمانییەتەوە، واتە لەوە ئەستەمتر نییە کەمەسیحییەت چووە نێو عەلمانییەتەوە، چونکە لەمەسحییەتیشدا تۆوی عەلمانییەت نەبوو کەپەرەی سەند و بوو بەدرەخت و پاشان باغێکی گەورە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، کاتێك دابڕانی مەعریفی ڕوویدا کەخۆرئاوا لەگەڵ خۆیدا ئەو دابڕانە مەعریفییەفەی پرۆسە کردو و بوو بەعەلمانی، لەو کاتانەدا مەسیحییەتیش گەڕایەوە بۆ مێژووی خۆی تا تۆوی عەلمانییەت بدۆزێتەوە و پاساوی بۆ بهێنێتەوە. باوەڕم وایە ئیسلامیش دەچێتە نێو ئەو قۆناغەوە و دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو و بۆ مێژووەکەی تائەو تۆوە بدۆزێتە و ناوێکی تازەی

پێ ببەخشێت. ئەم مەسەلەیە بۆ ئیسلام زۆر پێویستە، ئەمە یارمەتیی دەدات کەلە ئیسلامێکی سیاسیەوە بگۆڕدرێ و ببێ بەئیسلامێکی رۆحی، رێك وەکو ئەوەی لەمەسیحیەتدا ڕوویدا. بەمجۆرە مەسیحییەت بەهۆی عەلمانییەتەوە لەسیاسەت ڕزگاری بوو. باوەڕم وایە کاتی ئەوە هاتووە ئیسلامی رۆحی سەرهەڵبدات و حاکمەکان و نەیاران و پیاوانی ئایین بخاتە لاوە. رۆحانیکردن دەروازەیەکە بۆ ئیسلام تالەوێوە بچێتە ناو مۆدێرنە، کاتێکیش ئەمە ڕوودەدات، ئەوا هیچ کاردانەوەیەکی توندوتیژانەی وەك ئەوانەی ئەمڕۆ نابینین و توندڕەوی و ڕەق و ڕەتکردنەوەی مۆدێرنە ئاوا دەبن.

* ئایا عەلمانییەت میکانیزمێك یان نیازێکی ئایدۆلۆجییە؟ لەلای ئەو حیزبە ((عەلمانییانەی)) لەکۆمەڵگە عەرەبیەکاندا گەیشتوونەتە دەسەلآت، تا چ ئەندازەیەك ئەو دروشمە خراوەتە پرۆسەوە؟

— نانا، هەرگیز مومکین نییە عەلمانییەت ببێت بە نیازێکی ئایدۆلۆجی، عەلمانییەت باوەڕدار و بێباوەڕ بەیەکسانی پێکەوە کۆ دەکاتەوە. عەلمانییەت بریتییە لەخاڵی لێکگەیشتنی باوەڕداران و ئەوانیتر. دواجار بێباوەڕییش جۆرێکی ترە لەباوەڕ. ئەگەر عەلمانییەت ببێ بەئایدیۆلۆجیا دەبێ بەشتێکی مەترسیدار، باشترین بەڵگەش مێژووی عەلمانییەت خۆیەتی، بۆ نموونە ئەوەی لەدەوڵەتە کومونیستەکاندا ڕوویدا، ئەوانە لەدژی ئایین دەجەنگان، چوونە ناو جەنگێك لەدژی کاتۆلیکی و کەنیسە. لەواقیعدا ئەوانە دەوڵەتێکی عەلمانیی ڕاستەقینە نەبوون، بەڵکو عەلمانییەکی بەئایدیۆلۆجیکراو بوون و دژی ئایین بوون. دەوڵەتی عەلمانیی ڕاستەقینە دژایەتیی ئایین ناکات، بەڵکو ڕێگەی ئازادیی ئایین بۆ هەمووان دەکاتەوە.

* ئەی سەبارەت بەدروشم و کردار لەئەزموونی عەرەبیدا چی دەڵێیت؟ مەبەستم ئەو حیزبە عەلمانییانەیە کەگەیشتنە دەسەلآت؟

— من لەپرسیارەکەتدا ناڕەزایی بەرامبەر وشەی ((عەلمانییەت)) دەردەبڕم، تائەم چرکەساتەش لەجیهانی عەرەبیدا دان بەبوونی هیچ حیزبێکی عەلمانیدا نانێم، ئایا ئەوانە بەڕاستی عەلمانیین؟ نەخێر، بۆ نموونە بەکارهێنانی ئایین لەڕۆژگاری عەبدولناسر و لەسەردەمی یەکێتی نێوان میسر و سوریادا زۆر زیاتر بوو لەوەی ئەمڕۆ لەسوریادا بەکاردەهێنرێت: لەودەمەدا مزگەوت لەفەرمانگە ڕەسمییەکاندا کرایەوە، هەموو بۆنەو کۆڕو کۆبونەوەکانیش بە بیسمیللا دەکرایەوە. دەڵێم ناسرییەکان و بەعسییەکان حزبی عەلمانی نین هەروەکو حزبی ئاینیش نین. لەڕاستیدا تراژیدیای عەلمانیەتی عەرەبی لەوەدا خۆی دەنوێنێت کە حیزبە پێشکەوتنخواز و شیوعی و بەعسییەکان بابەتی عەلمانییەتیان غافڵگیر کرد و لەگەڵ ڕەوتی جەماوەر و ئیسلامییەکاندا دەڕۆیشتن تا بەردیواری هوشیاریی ئیسلامی نەکەون و تابگەنە دەسەلآت. باوەڕم وایە ئەو حزبانە کۆمەڵی حزبی ((هەلپەرست))ن، بەو مانایەی دەیانویست جەماوەر بەلای خۆیاندا رابکێشن بێئەوەی هەوڵبدەن ئاگایی ئەو جەماوەرە بگۆڕن. ئەوانە حزبی پێشڕەو نەبوون بەڵکو حزبگەلێکی ((جەماوەری)) بوون، بۆیە مەسەلەی عەلمانییەت خرایە لاوەو بەجیدی نەخرایەڕوو. باوەڕم وایە هەموو ئەو دیکتاتۆرییانەی دروستیان کردو هەموو دۆڕان و فەشەلەکانیان، هیچ پەیوەندییەکی بەعەلمانییەتەوە نییە، بگرە ئەمە دژی سروشتی

عەلمانیەتە. کاتێك ستەمکاری هەموو پەنجەرەکان دادەخات، تەنها یەك پەنجەرە و یەك دەریچە بەکراوەیی دەهێڵێتەوە ئەویش ئایینە. کاتێك دەرگاکانی سیاسەت بەڕووی خەڵکیدا دادەخرێن و ڕێگە لەکاری سیاسەت دەگیرێت، دیموکراسی ئیفلیج دەبێت. سەرەنجامی ئەمانەش دەبینین ئەمڕۆ ستەمکاری گەورەترین خزمەتکاری شەڕە ئایینیە ئوسوڵییەکانی کۆمەڵگە عەرەبییەکانە.

* لەژێر سایەی ململانێ و ناکۆکییەکانی ئەمڕۆی دنیای عەرەبیدا، چۆن دەشێت لەو ئاستەنگ و سەنگەرانە دەرچن و بەرەو ئومێد و گفتوگۆ هەنگاو بنێن؟

– هەرچەند ململانێکان ئاشتییانە بن سود بەخش دەبن و نیشانەی تەندروستین. من بەهیچ جۆرێك باوەڕم بەیەکێتی نەتەوەیی یاخود وەحدەی ئوممە نییە، دەشێت ئەمە بمانباتە سەر ئاستەنگە گەورەکانی، بمانباتە سەر ئەفغانیەتی تالیبان یان نازیزم. لەدیموکراسیەتدا، بەپێچەوانەوەی نموونەکەی پێشوو، هەر چەندێك بەئاسانی دارەکە بشکێنرێ دیموکراتی پتەوتر و تۆکمەتر دەبێت. دیموکراسی پێچەوانەو دژی یەکێتیی ڕاو بۆچوون و کۆدەنگییە((ئیجماع))، بەداخەوە ئێمە لە کولتورێکدا دەژین لەسەر بیرۆکەی کۆدەنگی ((ئیجماع)) ڕاوەستاوە، ئەم کۆدەنگییە بەرەو مەترسی و ڕەتکرانەوەی ئەویدی و بەرە و ئەو وتەیە دەڕوات کەتەنها لایەنێك ڕاستە و ئەوانیتر هەڵە، ئەمە بەسەر هەمووانەدا دەگونجێت، واتە بەسەر چەپەکان و ناسیونالیستەکان و فەندەمینتالیستەکان. من باوەڕم وایە مادامەکی ململانێکە بەشێوەیەکی ئاشتییانە بەرێوە دەچێت و ڕێز لەڕێسای گەمەی دیموکراسی دەگرێت، ئەوانیشانەی تەندروستی و پێشکەوتن و هەمەڕەنگییە.

* قسەکانت لەبارەی کۆدەنگی یان ئیجماع (کەسەر بەکەلەپورە) و لەبارەی دیموکراسی( کەسەر بەمۆدێرنەیە) بەرە و ئەوەمان دەبات پرسیار لەچۆنێتی بنیاتنانی میکانیزم و بنیاتنانی ئەو پردانە بکەین کە کەلەپور و مۆدێرنە بەیەکتر دەگەیەنێت، بێئەوەی بکەوینە ناو ناتەواویی پەیوەندیمان لەگەڵ واقیعی ئەمڕۆدا. بەبۆچوونی تۆ، بۆچی لەکۆمەڵگە عەرەبییەکاندا ئەو دەستە مێژووییە سەری هەڵنەدا کەپشتیگریی مۆدێرنە بکات و بیپارێزێ و بەرجەستەی بکات؟

– ئەمە لەراستیدا بابەتی کتێبێکە نەك بابەتی پرسیارێك، بەڵام لێرەدا خاڵێکی بنەڕەتی هەیە دەمەوێ جەختی لێبکەم، ئەویش: ئەوەی کۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکان جیادەکاتەوە ئەوەیە کە ئەمانە کۆمەڵگەی ((کەلەپوورین))، یەکێ لە سیفەتە دیارەکانی ئەوەیە کەقورسایی کەلەپورێکی گەورە لەئەستۆ دەگرێت. ژیاری عەرەبی ئیسلامی بریتییە لە کەلەپورێك لەتێکست و لەمێژوو، دەشێت لەمێژووی بەشەریدا یەکێ بێت لەگەورەترین ئە ژیارانەی تێکستی بەرهەمهێناوە، دەشێت قورسایی کەلەپور لەژیاری ئیسلامیدا لەهەر ژیارێکی تر زیاتر بێت. بەڵام ئایا ڕۆڵی کەلەپور چییە؟ کەلەپوور دوو ڕۆڵی هەیە: ڕۆڵی جڵەوگیری و ڕۆڵی ئاوزەنگ ((مهماز)) یان نەقیزە، ئەو ڕۆڵە بەپێی سروشتی خودی کەلەپورەکە نییە بەڵکو بەپێی ئەوەی لەو کەلەپورەوە هاتووە و بەپێی ئەو گۆشەیەی لێیەوە دەڕوانێتە کەلەپورەکە. بۆ نموونە ئەگەر ویستت بۆ دواوە بگەڕێیتەوە کەلەپور قورساییەکی گەورەت پێشکەش دەکات، ئەگەر بشتەوێ بەرەو پێشەوە بچیت ئەوا لەمیانی سەرلەنوێ خوێندنەوەدا

کەلەپور بەکاردەبەیت، کەواتە جۆری خوێندنەوەمان بۆ کەلەپور ئەوە دیاریدەکات کەئەو کەلەپوورە ئاوزەنگییە یان جڵەوگیری. لێرەوە گرنگیی سەرلەنوێ خوێندنەوەی کەلەپور دەردەکەوێ لەتێڕوانینی پێداویستییەك بۆ ئاوزەنگ کەبەرەو مۆدێرنەمان ببات. ناتوانین بەڕووت و قووتی بچینە ناو مۆدێرنەوە. دەچینە ناو مۆدێرنەوە و چەندین جلوبەرگمان پۆشیوە، بەڵام دەتوانین تازەیان بکەینەوە بۆئەوەی نەکەوینە دوو تەرەفی دژ بەیەکەوە و ململانێیەکی نوێ لەنێوان مۆدێرنیستەکان وکەلەپور خوازەکاندا هەڵبگیرسێت.

باوەڕم وایە زەحمەتی و ئاستەنگی گەورە لەوەدایە ئێمە تا ئەمڕۆش بەدیدێکی کۆنەوە کەلەپور دەخوێنینەوە، ئەگەر بەدیدکێی تازەوە بیخوێنینەوە ئەوا دەشێت ببێت بەئاوزەنگ یاخود نەقیزەیەك بۆ بەرەو پێشەوە چوون (( مهماز)) نەك بۆ جڵەوگرتن. دەشێت ئەرکی بنەڕەتیی ئەم وەچەیە، تاماوەیەکی دووردرێژ، بریتی نەبێت لەوەی ببێ بەوەچەی شۆڕش و دابڕان لە کەلەپور، بەڵکو ببێ بەوەچەی سەرلەنوێ خوێندنەوەی کەلەپور. ئێمە پێویستیمان بە شۆڕشێکی لاهوتی (تیۆلۆجی) هەیە و پێویستمان بە(مارتن لۆتەر)ێکی موسڵمان هەیە، هەروەها پێویستمان بە (ڤۆڵتێر)ێکی موسڵمان هەیە کەهەر دێتەدی و ئەمەش مەترسیدار نییە بۆسەر ئیسلام. بەڵام لەم قۆناغەی ئیستاماندا پێویستمان بەمارتن لۆتەرێکی موسڵمان هەیە. هەموو ئەوشتەی ئێمە دەتوانین بیکەین، مەبەستم ئێمەی ڕۆشنبیران کەلەسەر کەلەپور کار دەکەین، دەبێ میتۆدە نوێیەکان بەسەر کەلەپوردا پراکتیزە بکەین و بەرێگەیەکی نوێ بیخوێنینەوە و شتی تازەی لێدەربهێنین و سامان و بەروبومی نوێی بۆ زیاد بکەین. کاتێکیش بەچاوو دیدێکی تازەوە فەرموودە و فیقهو فەلسەفە و مێژوو دەخوێنینەوە، دەوڵەمەندیان دەکەین، خودی کەلەپوریش پێویستی بەمەیە تا نوێ بێەوە و دەوڵەمەند بێت و دوچاری بەستەڵەکی نەبێت و دانەکەوێت.

ئەرکی کەلەپور ئەوەنییە بەسەریدا باز بدەین و بچینە مۆدێرنە، بەڵکو دەبێ سوود لەدەستکەوتەکانی مۆدێرنە وەربگرین تا شتی تازە بەناو کەلەپوردا بڵاوبکەینەوە. من نابم بەکارکردێك لەخزمەتی کەلەپوردا و لەجەنگیشدا تەوزیفی ناکەم، بەڵکو لەخزمەتی کەلەپوردا خۆم تەوزیف دەکەم و لایەنی ڕەونەقداری تیادا دەدۆزمەوە، لایەنی دەوڵەمەندو پڕ بەهاو پڕشنگدار کەوەکو ئاوزەنگێك قابیلی بەکارهێنان و تەوزیفکردن بێت بۆ گەیشتن بەمۆدێرنە یاخود بۆ جێهێشتنی قۆناغی مۆدێرنە.

* ئەو سنوورە جیاکارییانەی نێوان ڕزگارکردنی دەق لەدەق و لەپیرۆزی، و نێوان ڕزگارکردنی ئەقڵ لەدەق، چین؟

– ئەمە ئەو بابەتەیە کەبەشێوەیەکی تایبەتی و بەرفراوان لەکتێبی ((چارەنووسی فەلسەفە لەنێوان مەسیحییەت و ئیسلامدا)) خستوومەتە ڕوو، ئێمە ئێستا لەقۆناغی ڕزگارکردنی تێکستین لەتێکست. شکست و دۆڕانی شۆڕشەکانمان بۆ ڕوون بۆتەوە، بەتایبەتی ئەوکاتەی شۆڕشی سۆشیالیزمیان هەڵگیرساند و بەبیانووی ((سووتاندنی قۆناغەکان)) چەندین ڕژێمی دیکتاتۆرییان دامەزراند. دەرەنجامەکەیش وەك بینیمان برتیی بوو لەوەی شۆڕش خۆی سوتاند و قۆناغەکانی نەسووتاندا! من لەو کەسانە نیم بانگەشەی سووتاندنی قۆناغەکان بکەم، بەڵکو دەبێ قۆناغ لەدوای قۆناغ هەنگاوەکان ببڕین. ئەرکی مێژوویی ئەمڕۆیش

بریتییە لە ڕزگارکردنی تێکست لەتێکست، ئەمەیان ئەرکێکە دەکەوێتە قۆناغی داهاتووەوە. نامانەوێ واهیمەدار بین و بچینە نێو جەنگە دۆنکیشۆتییەکانەوە. دەشێت ڤۆڵتێرێك لەدنیای عەرەبی ئیسلامیدا سەرهەڵبدات، بەڵام تەنانەت ڤۆڵتێریش ئەقڵی لەتێکست ڕزگارنەکرد، ئەو سەربەو کەسانەبوو کەبانگەشەی بەخوداییکردنی سروشتی دەکرد نەك بەخوداییکردنی ئایین.((بەخوادییکردنی سروشت)) دەڵێ: ((خودا بوونی هەیە نەك سروش، ئێمە بەئەقڵ دەگەینە خوداو نکۆڵی لەبوونی ناکەین)). تەنانەت ڤۆڵتێریش نکوڵیی لەخودا نەکردووە وەك پڕوپاگەندەیان بۆ دەکرد.

ئێمە ئێستا لەقۆناغی ڕزگاریداین. بۆچی؟ چونکە باوەڕم وایە تراژیدیای گەورە بریتیە لەچەرخی شکست و داکەوتن کەئەمڕۆ تیایدا دەژین. بەداخەوە ڕێنیسانس لەو داکەوتنەی ڕزگارنەکردین بەهۆی تاوانی سوتاندنی قۆناغەکان (شۆڕشەکان). ئەوەی کە گورزێکی لەچەرخی ڕێنیسانس وەشاند پەلەکردنی زەمەنی بوو لەڕێنیسانس، بەمجۆرە هەم خۆیان و هەم ڕێنیسانسیان سووتاند. دەڵێم چەرخی داکەوتن تا ئەمڕۆش تیاماندایە. مەبەستم لە لۆجیکی داکەوتنە لەمانا مەعریفییەکەیدا، لەم دوو دەیەی دواییدا فشار و توندوتیژییەکی پتری بۆ هێناوین.

لەئەزموونی عەرەبی ئیسلامیدا چی ڕوویداوە؟ شپنگلەر دوو جۆر ژیاری جیاکردۆتەوە: ((ژیاری بازنە)) و ((ژیاری تیر))، شپنگلەر دەڵێ: زۆربەی ژیارە کۆنەکان لەدەوری سێنتەرێك یاخود چەقێکدا لەبازنەی بچوك بچووك یان فراواندا خۆیان دامەزراندبوو، تا ژیاری خۆرئاوایی هات و لەبازنەوە گۆڕدرا بۆ تیر، بۆ پێشەوە .

بەگەڕانەوە بۆ ئەزموونی مێژوویی عەرەبی ئیسلامی، بیرۆکەی تیر لەلای ئێمە سەری هەڵنەداوە. چەرخی زێڕین لەنێوان سەدەی دووەم و سەدەی چوارەمی کۆچیدا بوو، بەرلەوەی بچینە ناو سەدەی حەوتەم و هەشتەم وداکەوتن، ئێمە لەچەق یان لەسێنتەردا بووین، لەم خاڵەوە بازنەکانی زانستی زمان و فیلۆلۆجیا و تەفسیر و فەرموودە و کەلامناسی و فەلسەفە و زانستەکانی سروشت و نوژداری و ئەنترۆپۆلۆجیا دروست بوون، بازنەکان بەردەوام گەورە و دەوڵەمەند دەبوون، پاشان چی ڕوویدا؟ لەسەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچیدا بەیانی باوەڕی قادری دەرچوو، کەبەیانێکی فیقهی بوو، لەو بەیانەدا موعتەزیلە و زانستی کەلام قەدەغەکران، پاشان وردە وردە بازنەکان بەرتەسك بوونەوە، لەبازنەی فەلسەفە درا و تەکفیرکرا، پاشان بازنەی کەلام و بازنەی تەسەوف کەدەوڵەمەندترین بازنەی کولتووری عەرەبی بوو، (حەلاج) لەسێدارە دراو (سوهرەوەردی) کوژرا، تەنانەت بازنەی فیقهیش داخرا، شەڕێکی گەورە لەنێوان حەنەفییەکان و حەنبەلیەکاندا ڕویدا، لەوساتەدا سۆفیگەری ناودار (ئەلقشیری) پەیامێکی بڵاوکردەوە بەناونیشانی: ((شکوى اهل السنة في رواية ماأصابهم من الجنة)). هەروەها لەئەشعەری و حەنەفی و شافعیش درا، ئاگری دووبەرەکی لەنێوان مەزهەبەکاندا هەڵگیرسا. کاتێکیش مەنسور هات، مەزهەبی مالکی لەناوبرد کەتاکە مەزهەب بوو لەمەغریبدا. لەمانەش زیاتر، کیمیا و وەرگێڕانیشیان قەدەغەکرد، هەر لە سەدەی پێنجەمی کۆچییەوە یەك کتێب وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی بەبیانووی ((پەلاماری ڕۆشنبیری یان داگیرکردنی ڕۆشنبیری))، کەئەو لۆجیکە تائەمڕۆش بەردەوامە! لەهەردوو سەدەی

حەوتەم و هەشتەمی کۆچیشدا بازنەی نوژداری تەکفیرکرا و زنجیرە کتێبی ((پزیشکی پێغەمبەری)) دەرچوو، چەند فەرموودەیەکی سەرەتاییان لەبارەی نوژداری دایە پاڵ پێغەمبەر. ئەم داکشانە گەورەیەی بازنەکان بریتییە لەخودی چەرخی داکەوتن (انحگاگ).

*بەڵام چ ڕێگەیەك هەیە بۆ دەرچوون لەم داکشانە، یان ئەوەی تۆ بە ((داخستنی بازنەکان)) ناوت برد؟

—ئەمە بەنوێکردنەوەی بازنەکان و بەئازادکردنی بازنەکان دێتەدی، مەرج نییە بەقۆناغ لەو داکشانە دەربچین، چونکە مومکین نییە لەگەڵ سێنتەردا پێکدادادن ڕوویدات، بەڵکو دەبێ جارێکی تر تەئویلی سێنتەر بکرێت و بازنە و پەنجەرەکان بکرێنەوە. تەنها بەفەلسەفە و زانستی کەلام و تیۆلۆجیا وازنەهێنین، بەڵکو پێویستمان بەزانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان هەیە. باوەڕم وایە چارەنووسی ڕۆشنبیریی عەرەبیی ئەمڕۆ دەشێت سبەینێ وەکو چارەنووسی رۆشنبیریی خۆرئاوایی بێت، واتە دەشێت لەپاشماوەی سێنتزالیزمەوە رۆشبیرییەکی ((تیرئامێز)) بەرهەم بهێنرێت، لێرەدا ئیمکانێکی ڕاستەقینە بۆ ئەوشتە هەیە. لەو باوەڕەدام عەلمانییەت، بەو پێیەی ئازادیی ئایینی دەرەخسێنێت، ڕێگەدەدات سێنتەر بمێنێ و هەرکەسێ بیەوێت وەکو تیر بەرەو پێشەوە بچێت بەڵام بەچەشنە هاوگونجانێك لەنێوان ((سێنترالیزم)) و ((تێرئامێز))دا.

* ڕاڤەکردنی تۆ چییە بۆ پاشەکشەی ئەقڵی عەرەبی ئیسلامی، و پتریش رۆشنبیریی عەرەبی؟

— لەو باوەڕەیام ئەقڵی عەرەبی ئیسلامی، لەپاش کراونەوە و ئامادەبوونێکی گەورە، و لەمیانی چەند میکانیزمێکی ناوەکی و خودیدا، بەداخران و گرمۆڵەبوون و بەستەڵەك و داکەوتن حوکمی بەسەر خۆیدا داوە. ئەو میکانیزمە بریتییە لە میکانیزمی داخستنی بازنەکان کەپێشتر کراوەبوون.بەڵام گرفتی هرمسیەت و گنۆسیەت، ئەمانە گرفتێکن ئەقڵی عەرەبی ئیسلامی ڕووبەڕوویان نەبۆتەوە، بەڵکو مەسیحییەت ڕووبەڕوویان بۆتەوە.

محەمەد عابد جابری خۆرهەڵاتناسەکانی خوێندۆتەوە و تێڕوانینی ئەوانی لە ((پەلاماری هرمسی)) وەرگرت. لەواقیعدا گنۆسیەت بریتییە لە لێکترازانی عیرفانی لەناو مەسیحییەتدا، هرمسیەتیش بریتییە لەزیندووکردنەوەی پەیگانیزم یان بت پەرستی (وەسەنیەت). کاتێك وەسەنییەکان ڕووبەڕووی ڕەوتی ڕوولەهەڵکشانی مەسیحییەت بوونەوە، هەوڵیاندا تێکستگەلێکی ئایینی بۆ ئاینێکی بێ تێکست بهێننە بوون. کێشەکە کێشەی ململانێیە لەنێوان وەسەنیەتی یۆنانی و مەسیحییەتی هەڵکشاودا. لەڕۆشنبیریی ئێمەدا و لەدەرەوەی بەزۆر سەپاندندا یەك هرمسی بوونی نییە. پاشان لێرەدا ململانێیەکی مێژوویی دیکە هەیە لەنێوان کەنیسە وەك دامەزراوێکی ڕەسمیی هەرەمی و لەنێوان ڕاهیبەکان کەتەنها بەئیرادەی خۆیان ئینتیما بۆ ئایین دەکەن. ململانێیەکی گەورە لەنێوان ڕاهیبەکانو کەهنوتدا هەڵگیرسا. ڕەهبەنەکردن بریتی بوو لەگنۆسیەت، گنۆسیش بریتییە لەزانین و گەیشتن بەخودا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و لەڕێگەی ئینجیلەکانەوە و بەبێ هەموو ئەو ناوەندانەیش. وەك ئەوەی ڕاهیبەکان بەر لەلۆتەر، لۆتەر بوون، کەنیسە کردوونی بە ((ئیبلیس)) و کردوونی بەدوژمنی خۆی.

محەمەد عابد جابری لەئاکامی بەزۆر سەپاندنەکانی خۆیدا، کەوتۆتە ناو چەندین هەڵەی

مێژووییەوە، هەردەبوو ئەوهەڵانە ڕاست بکرێنەوە، بەڵام ئامانجم لەو کارەدا تەنها لەپێناوی ڕاستکردنەوەدا نەبوو، بەڵکو بنیاتنانی کارێك بوو کەنزیکەی 18 ساڵی خایاند، تا ئێستا چواربەشم لەوکتێبە چاپکردووە (مەبەست لەکتێبی ڕەخنە لەڕەخنەی ئەقڵی عەرەبییە کەتیایدا ڕەخنە لەبۆچوونەکانی جابری دەگرێت) و بەشی پێنجەمیش لەژێر چاپدایە. ئەمە پرۆسەیەکە بۆ سەرلەنوێ بنیاتنانەوە.

لەدوا کتێبمدا بەناوی ((ئەقڵی دەست لەکارکێشرا و لەئیسلامدا)) لەبارەی کتێبێك دواوم لەکەلەپووری ئێمەدا، ئەویش کتێبی (الفلاحة النبطية)یە لەکەلەپوری بابلیدا، یەکێکە لەگرنگترین ئەو کتێبانەی لەکەلەپووری دێرین و کەلەپوری سامیدا هەمانە، ئەم کتێبە لەژیانمدا کەشفێکی گەورەی بۆ کردمەوە چونکە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بەکەلەپورەکەمان و بەکەلەپوری ناوچەکە بەر لەئیسلام. ئەو کتێبە کۆمەڵێ بۆچوونی فەلسەفی لەخۆ دەگرێت کەپێش سەردەمەکەی خۆی دەکەوێت، دەشێت لەجەنگی مۆدێرنەدا بەکاری بهێنین. جابری هەندێ شتی کەمی لەبارەی ئەو کتێبە نووسیوە کەتەنها سێ بەشی لاپەڕەیەك دەگرێتەوە، من 90 لاپەڕەم لەبارەوە نووسیوە. جابری تەنها لاپەڕەونیوێکی لەبارەی ئیخوان سەفا نووسیوە و پێی وایە ئەمانە عیرفانی و هرمسین و دوژمنی ئەقڵن، من 125 لاپەڕەم لەبارەوە نووسیون کەشوێنی ئەقڵانی ئیخوان سەفام گەڕاندۆتەوە، ئەمە تەنها وەڵامدانەوە نییە، بەڵکو گەڕاندنەوە و لەبەرچاوگرتنی شوێن و پایەی ئەوانە و هەروەها بنیاتنانەوەیەکی تازەشە.

ئەگەر پرسیاری ئەوەم لێبکەیت: بۆچی جابری‌و کەسێکی تر نا، ئەوا دەڵێم لەبەرئەوەی جابری ڕۆڵێکی گەورەی بینی – وتا ئێستاش ئەو ڕۆڵە دەبینێت – لە پێکهێنانی ئەقڵی دەستەبژێری عەرەبیی ڕۆشنبیر. پاشان وەڵامدانەوەی پرۆژەکەی جابری، بریتییە لەململانێیەك لەپێناوی پێشکەشکردنی ڕوانینێکی نوێ بۆ دەستەبژێری عەرەبی، سا ئەو ڕوانینە نوێیە لەخوێندنەوەی بۆ کەلەپوردا بێت یاخود بۆ تازەگەری (مۆدێرنە)، هەروەها یەکێ لەو خاڵە بنچینەییانەی کەمن و ئەو لەیەکتر جیادەکاتەوە بەچەشنێك لەفەندەمینتالیزم کۆتایی هات. جابری بۆماوەی پانزە ساڵە داوا دەکات وشەی ((عەلمانییەت)) لەفەرهەنگی فیکری هاوچەرخی عەرەبیدا نەهێڵرێت و بەکارنەهێنرێت، کەچی من باوەڕم وایە عەلمانییەت، لەدیاریکردنی هەڵوێستی ڕۆشنبیری عەرەبیدا لەبەرامبەر کێشە ڕاستەقینەکانی، مەسەلەیەکی یەکلاکەرەوەیە.

## سەرچاوە:

ئەم چاوپێکەوتنە لەڕۆژنامەی (النهار)ی بەیروتی لە 8 و 2005/6/9 بڵاوکراوەتەوە و (سلیمان بەختی) ئەنجامی داوە.

# واقیعێك لەبەرامبەر واقیعی جیهاندا

-گفتوگۆیەكی بڵاونەكراوە لەگەڵ هۆشەنگی گوڵشیریدا-

لەفارسییەوە: محەمەد كەریم

هۆشەنگی گوڵشیری لەكەسە دیارەكانی نەوەی دووەمی چیرۆكی هاوچەرخی ئێرانییەو یەكێكە لەو ئەدیبانەی لەم چەند دەیەیەی دواییدا زۆرترین مشتومڕی خوڵقاندووە كە لەساڵانی كۆتایی تەمەنیدا، وەكو كەسێكی سیاسی دەركەوتبوو ئەمە ببووە ڕێگرێك لەبەردەم ڕەخنەو شیكردنەوەی جدی بەرهەمەكانیدا، وێڕای ئەوەش گوڵشیری لەو نووسەرە دەگمەنە هاوچەرخانە بوو كە لەدەرەوەی ئێران توانی روخساری كەسێكی شایستە بۆ خۆی رەسم بكات، بەهۆی ئەمەوە چەند بەرهەمێكی بۆ زمانە زیندووەكانی جیهان وەرگێردران، گوڵشیری یەكێكە لەكاریگەرترین چیرۆكنووسانی ئێران كە لەگەڵ بەرهەمەكانی سەرەتایدا لەگەڵ ئەدەبی ریالیستی رۆژگاری خۆیدا كەوتە جەنگەوەو بە وتارە گرنگەكەی (سی ساڵ رۆماننووسین) رەخنەی لەكارنامەی چیرۆكنووسینی ئێران گرت تا ئەوكاتەو لەوە بەدواوە وەكو كەسێك كەچیرۆك بەئاوێنەیەك بۆ تەماشاكردنی خۆی لەپەیوەندیی لەگەڵ كەسانی دیدا دەزانی، لەگەڵ بەرهەمە ریالیستییە مامناوەنییەكاندا كەوتە جەنگەوە.

لەو نێوانەدا رەخنەكانی گوڵشیری لەنووسەرانی وەكو مەحمودی دەوڵەت ئابادیو ئەحمەد مەحمودو سیمینی دانشوەر و رەزای بەراهەنی لەو رەخنانە بوون كەزۆرترین مشتومڕیان لێكەوتۆتەوە، جگەلەوەش گوڵشیری بەرابەریكردنی زنجیرە ئەدەبییە هاوچەرخەكان، ئامادەبوونێكی وای بەجێهێشت كەقابیلی نكۆڵی لێكردن نییەو دەتوانرێت زۆر لەچیرۆكنووسانی نەوەی سێیەمی ئێران بەپەیڕەو كەرانی ئەو لەقەڵەم بدرێن، ئەم ئامادەگییەی گوڵشیری نووسەرێكی وایان لێدروست كرد كە كەمتر بوارو دەرفەت بۆ نووسەرانی تر بهێڵێتەوە كەڕەخنە لەبەرهەمەكانی بگرن و بەرهەمەكانی شیبكەنەوە. ئەمەی لەخوارەوە دێت گفتوگۆیەكی بڵاونەكراوەی گوڵشیری نەمرە

**کەکاسێتەکەی یەکێك لەهاوڕێیانم ماوەیەك لەمەوبەر لەناو کتێبخانەکەیدا دۆزیبوویەوە، بەڵام سەبارەت بەناوەڕۆکەکەی هیچی لەبیر نەمابوو. وادیارە ئەم گفتوگۆیە هی سالانی دوای شۆڕشی ئێرانە "1979" کە دووکەس لەخوێندکارانی کلاسی چیرۆکنووسینی هۆشەنگی گوڵشیری لەئەسفەهان لەگەڵیان سازداوە کەبەداخەوە ناوی ئەو دوو کەسە روون نییە، ئەو دۆستانەش کەگوێیان لەکاسێتەکە گرت نەیانتوانی دەنگی ئەو دوو کەسە بناسنەوە.**

*ئەدەب لەجیهانێکدا کە برسییە ئیشی چییە؟ پەیوەندیی ئەدەب لەگەڵ واقیعدا لەگەڵ سیاسەتدا.. هتد چییە؟

**—من باوەڕموایە ئەدەب ناتوانێ وەکو خۆی واقیع عەکس بکاتەوە کەواتە ریالیزم...**

*ببوورە جەنابی گوڵشیری ئەگەر لەکۆتاییەوە دەستپێبکەی باسەکە زۆر لقو پۆپی لێدەبێتەوە، باسەرەتا بڵێین ئەدەب چییە بۆئەوەی دوایی بچینە ناو وردەکارییەکانەوە؟

**—باشە تەنانەت ئەگەر من وەڵامی ئەمەش بدەمەوە دیسان دەگەڕێینەوە بۆ هەمان خاڵی پێشوو، ئەدەب بریتییە لەدروستکردنی واقیعێك لەبەرامبەر واقیعی جیهاندا، ئێستا رەنگە بپرسن ئەم ئەدەبە کەڵکی چییە کەناتوانێ واقیع عەکس بکاتەوە، ئەگەرچی ئاواتیشی ئەوەیە؟ لەوەڵامدا دەبێت بوترێت ئەوە ئەڵتەرناتیڤی جیهانی واقیعییە کە بەرامبەر بەو واقیعە دەوەستێتەوە، دەیخاتە ژێر پرسیارەوەو بەوشێوەیە ئێمە دەتوانین گومان لەو واقیعە بکەین کە هەیەو بیگۆڕین، هەربۆیە ئەدەب لە سیاسەتو لە باقی مەسەلەکاندا تەرح دەکرێت، بەڵام ئەگەر وابیر بکەینەوە کەئەدەب کەرەسەیەکی خاو بۆ کۆمەڵناس یان بۆ دەروونشیکار ئامادە دەکات ئەمە وێناکردنێکی راست نییە، لەبنەڕەتدا شتی وا نییە، بەکورتی لەبەرئەوەی لەکۆمەڵگای ئێمەدا کۆمەڵناسێك نییە یان بۆ نموونە توێژەرەوەیەك نییە دەربارەی گوندەکان توێژینەوەیەکی کردبێت یان دەربارەی فلان چین لێکۆڵینەوەی هەبێت، ئەوسا هەندێ وابیریان کردۆتەوە کەهەموو ئەم ئەرکانە کەوتۆتە ئەستۆی چیرۆکنووسو چیرۆکنووسەکانیش خەریکی ئەنجامدانی ئەم کارەنو لەچیرۆکەکانیاندا وردە بورژواکان نیشاندەدەنو دێهاتییەکان نیشاندەدەن و هتد، بەڵام من باوەڕم وایە کەچیرۆکنووسەکان تەنانەت ئەگەر وایدابنێین لەنیشاندانی ئەم مەسەلانەشدا سەرکەوتووبن (کەقەت سەرکەوتوو نابن) دیسان خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە چ شتێك خراوەتە سەر جیهان؟ هیچی نەخراوەتە سەر، لەکاتێکدا کەئەدەب شتێ دەخاتە سەر جیهان، یان دەبێت بیخاتەسەری، ئەو شتەی کەبۆشاییەکەی بەر لەخوڵقاندنی ئەو بەرهەمە ئەدەبییە دیار نییە، بەڵام دوایی ئاشکرادەبێت کەشتێك زیادکراوە.**

*ئەو واقیعەی کەڕوونتکردەوە، واتە واقیعێ لەبەرامبەر جیهاندا یان واقیعێ لەبەرامبەر واقیعدا، چ جۆرە واقیعێکە؟ پەنجە خستنە سەر کام شوێنە؟ ئایا دەبێت شتێکی بخەینە سەر بۆئەوەی پێی بگەین؟

**—هەر کەسێ روانینێکی وای هەبێت، بەناچاری تەواوی رۆشنبیریی و فیکری بۆ ئەو کۆمەڵگایەی خۆشیدەوێت هەبێتو ئەو ناڕەزاییانەی لەواقیعی هەیە، ئەمانە هەمووی لەکارەکەیدا رەنگدەداتەوە.**

*تۆ زیاتر هەست بەکام بەشیان دەکەی؟

**-باشـە بەحسـابکردن بۆئـەوەی کەغەمـەکانی هـەر کەسـێ جیـاوازەو هـەر کەسـێکیش کێشـەی جیاوازی هەیە، بۆ نموونە لە (برە گمشدەی راعی- بـەرخی ونبـووی شـوان) دا دەمویسـت ئـەوە ئاگادارکردنەوە بێت، هاواری ئەوە بێت: کە تا سەر ئێسـقان هـەموو شـتێك وێـران بـووە، رابـردوو پێویسـتییەکانی مرۆڤـی ئـەمڕۆ دابـین ناکـات، ئەزموونـەکانی بیسـت سـی سـاڵی رابـردووی ئێمـە لەمەسـەلە سیاسـییو کۆمەڵایەتییەکانـدا لەڕەگوڕیشـەوە هەڵـەبوون، ئەنجامـەکان غـەمناك بـوون، ئـەو وەڵامانـە ئـەمڕۆ نـاتوانن وەڵام بـن بـۆ پێویسـتییەکانی ئێمـە، بەهـەرحاڵ دەمویسـت ئـەم کۆمەڵەیـە لەتـەك خەیاڵـدا، واتـە ئـەو بەرهەمـەی کـەمرۆڤ دەیـداتو واقیـع دەگـۆڕێ، بەخوێنـەر بـدەم بۆئەوەی تێبگـات لـەچ تەڵەزگەیەکدایە، یـان دەبێـت خـۆی بکـوژێ، یـان رابکـات، یـان گۆشـەگیربێت (هەڵبەتـە هێشـتا مـەعلوم نییـە چـی دەکـات وەکـو شـوان لـەم قۆناغـەدا گـیری خـواردووە) سـەبارەت بـەوەی کـەکاری بکـات کـارێکی تـر بێـت، بەڕاسـتی مەسەلەکە ئەمەیە، واتە لەم شوێنەدا ئەو ئامانجەی من بەشوێنییەوە بووم ئەوە بوو بەو دابڕینەی کە لەواقیعدا کراوە واتە بەخستنەسەرو لێ فڕێدان، ئەو ئاگادارییـە بەخوێنـەر بـدرێ کـە لـەو گۆشەیەشـەوە تەماشـای جیهـانی ئێمـە بکـات، نـەك تـەنها لەگۆشەنیگای خۆیەوە.**

*بەهـەرحاڵ هـیچ نووسـەرێ نـاتوانێ واقیـع بنووسێتەوە، واتـە واقیـع بـەو شـێوەیە بنووسـێتەوە کـە لـەدەرەوەی زیهنیـدا هەیـەو دەگـوزەرێ، چـونکە یەکـەم واقیع شتێکی جێگیر نییـە، هەمیشـە لەجوڵەدایـەو دووەم هـەر نووسـەرێ بـۆ ئـەوەی شـتێ بنووسـێت دەبێـت رێـك بـەزەینی بێگەردیـدا گـوزەر بکـات، لـەکتێبی (وڤیفـە ادبیات- ئەرکی ئەدەب)دا ئەوە دەخوێنمەوە: "من کاتێ (بابەگۆڕیۆ) دەخوێنمەوە لەپاریسی زەمانی (بابەگوڕیۆ)دا ناجوڵێمـەوە، لەپاریسـی بەلزاکـدا دەجوڵێمـەوە" واتـە ناکرێـت لەسـەر بەرهەمـەکانی بـەلزاك پاریسـی ئـەو سـەردەمە دروسـت بکرێتـەوە، دەکـرێ پاریسـی بـەلزاك دروست بکرێت.

**-وادیـارە دەگەینـە ئـەو ئەنجامـە شـیاوەی کەئەمە هـیچ پەیوەندییـەکی بـەو واقیعـەوە نییـە کـە لـەزەمانی بەلزاکـدا هـەبووە. لەکاتێکـدا وانییـە، دانوستاندنێك هەیە لەنێوان تاكو ئەو کۆمەڵگەیـەی تیایدا دەژی، تەنها جیاوازیی ئەوەیە کەمەسەلەکان لـە (نـاوەوە) بینـراون نـەك لـە(دەرەوە) بـۆ نموونـە کەسـێك کەئـەهلی زانسـتە ئـەو کەسـە لـەدەرەوە شـتەکان دەبـینێ، هەربۆیـە دەڵـێین واقیعـی ئـەدەب بەقـەد خـودی واقیـع بایەخـدارە، واتـە وانییـە کەپاریسـی بـەلزاك هـیچ پەیوەندییـەکی بە پاریسـی واقیعـەوە نییـە، لەبەرئـەوەی چـەند رەگـەزێکی لێوەرگرتـووە، بـۆ نموونـە لـەکتێبی (صـومعە پـارك- دێـری پـارك) لەپـەراوێزی کتێبەکـەدا وەرگێـڕ بەپـەیڕەوی لەکتێبەکـە یـان بەپـەیڕەوی لەڕەخنـەگرێك، یاداشـتێکی نووسـیوە کەئـەم پارکـە بەو شـێوەیەی کـە "سـتاندال" باسـی دەکـات لـەفلان شار نییەو نموونەی نییە، وەك ئەوەی بیەوێت بڵێت ئەم پارکە مەعلوم نییە لەکوێیە، لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین -ستاندال- خۆی پارکەکەی دروست کردووە، بەڵام سادەیی مەسەلەکە ئەوەیە کە ستاندال هاتووە لەتەواوی ئەو پارکانەی دیویەتیو بەپێی پێکهاتەی چـیرۆکەکەیو رەفتـاری کارەکتـەرەکانی و... پارکێکی دروستکردووە کەچەند شتێکی بەقەرز لەو پارکانـەی لەواقیعـدا هـەن وەرگرتـووە، بـەڵام پارکەکەی ئەم هیچ یەکێك لەو پارکانە نییە.**

دەبێ ئاگامان لەوەبێت کەمەبەست لەواقیع وێنەگرتنی واقیع نییە، رەنگە یەکێك بتوانێت زۆرباش کۆڵانەکانی کۆمەڵگەکەی نیشان بدات، زۆرباش خێزان نیشان بدات، ژیانی جوتیاری زۆرباش نیشانبدات، بەڵام ئاشکرانییە ئەو کەسە توانیبێتی واقیع عەکس بکاتەوە. دەتوانین بەکامێرایەکی ڤیدیۆیی هەموو واقیع عەکس بکەینەوە. مەسەلەکە ئەوەیە کەبتوانێ ئەوە دەستنیشان بکات کەئەو هێزانەی لەناو کۆمەڵگادا سەرچاوەی کاریگەریین کامانەن و ئەو هێزانەش کەڕووەو مەرگن کامانەن، ئەوەش نەك بەهات و هاوارو ئەو شتانە بێت و لەسەر بنەمای ئەو کتێبانەی خوێندوویەتییەوە چەند کەسێك بکات بەڕەمز کەئەسڵەن رەنگە هەر بوونیان نەبێت.

*تۆ چ جۆرە واقیعێ هەڵدەبژێری؟ بۆ نموونە چیرۆکی (بەخدا من فاحشە نیستم–بەخودا من سۆزانی نیم) ئایا بەڕای تۆ پێویستییەکە؟ چونکە هەڵبژاردنی واقیع دەبێت بەپێی پێویستییەك ئەنجامبدرێت و لەم چیرۆکەدا تۆ تەنها ئاماژەت بۆ توێژێکی تایبەتی کردووەو ئەسڵەن مەسەلەیەکی تر لەچیرۆکەکەدا نییە.

–دەربارەی بەشی یەکەم، کە بەڕاستی کورتە چیرۆك چییە؟ ناکرێ بەشێوەیەکی سەلمێنراوو بێ ئەملاو ئەولا قسە بکرێت، چونکە زۆر قورسە، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەو شتانە چین کەهاتنە ناو چیرۆکەوە ئیدی چیرۆك نییە، بۆ نموونە کاتێك ئێمە تائەزموونی موپاسانمان لەبەردەستدا بێت، دوای ئەو ئەگەر کەسێك گوێ بەئەزموونەکانی موپاسان نەدات و بەشێوەیەك چیرۆك بنووسێت کە لەخوار پێوەرەکانی موپاسانەوە بێت، کەواتە چیرۆکی ئەو کەسە لاوازە، مەسەلەی کورتە چیرۆك بەلای منەوە ئەوەیە کەئێمە وردە وردە هەندێ کورتە چیرۆکمان نووسیوەو هەندێ کارمان کردووە کەدەکرێت لای چیرۆکنووسانی خۆرئاوا نموونەی زۆر باشتر لەوەی ئێمە هەبێت. کەواتە وادیارە دەبێت ئێمە جۆری چیرۆکێکی ئێرانی بهێنینە ئاراوە، بەڵام شتێکی وا وجودی نییە، لەهیچ جێگایەکی دنیادا جۆرێکی تایبەتی چیرۆك نییە کەتایبەت بێت بەجێگایەکی تایبەتەوە. لەبەرئەوەی چیرۆك چەند خاسیەتێکی جیهانی هەیە، هەڵبەتە بەڕەنگ و ڕووی ناوچەیی و ڕووداوی ناوچەیی و مەسەلەی ناوچەیی و عادەت و تەقالیدی ناوچەییەوە، دەنا شێوەو فۆرمە سەرەکییەکەی بەتەواوی جیهانییە. وەکو سینەما وایە وەکو مۆسیقا وایە، ئەو پێوەرانەی کە بەلای منەوە لەکورتە چیرۆکدا لەئارادایە ئەوەیە کەهەردوو لقی موپاسان–چیخۆف لەبەرچاو بگرم، من بینای پتەوی موپاسانم قبوڵەو دەمەوێ ئەو بینا پتەوە بەشێوەیەکی نادیار لەناو چیرۆکەکانمدا بهێڵمەوە، بەڵام بەڕووکەش تەسلیمی ئەو بینایە نابم. لەسەر ئەو بینایەی کەڕەنگ و بۆیەکی کاڵی هەیە کارەکانی خۆم ئەنجام دەدەم. ئەمە لەڕووی شێوازەوەیە، واتە کاتێك چیرۆکەکە دەخوێنیتەوە هەم هەست بکەیت کە یەك بینای هەیەو هەم هەستی پێنەکەیت. ناتوانی بڵێیت بێ بینایە، واتە پێکهاتەیە لەو دوو بینایەی کەوتم، بەڵام مەسەلەی دووەم کەئاماژەت بۆ کرد، لەچیرۆکی (بەخودا من سۆزانی نیم) کەتوێژێکی تایبەتی رۆشنبیریی هەیە لەوساڵە پڕ ئازارانەی ئێمە بەسەرمان برد، بڕوانە هەندێ جار مرۆڤ دەبێت وەڵامی پێویستییە کاتییەکانیشی بداتەوە، بۆ نموونە پێویستییە دووساڵەو سێ ساڵەو پێنج ساڵەو شەش ساڵەکان، لەڕووی تەکنیك و توانای چیرۆکنووسینەوە پێموایە کەئەو چیرۆکە یەکێکە لەتەکنیکترین چیرۆکەکانم. دوو

**کەسی تریش لەچیرۆکنووسانی هاوچەرخ لەسەر ئەم مەسەلەیە چیرۆکیان نووسی و سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام هۆی هەڵبژاردنی ئەم مەسەلەیە بەلای منەوە ئەوەبوو کە لەو کاتەدا کە کاتێکی زۆر خراپیش بوو چەند کەسێك دەیانویست مرۆڤ رسوا بکەن کە تەواوی وجودیان فرۆشتووە کەچی هەروا هاوار دەکەن کەئێمە وانین و خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن.**

**بەهەرحاڵ دەشێ دەساڵی تر پانزە ساڵی تر یان بیست ساڵی تر مەسەلەیەکی وا لەئارادا نەبێت، یان هەرئێستا کە من دەمەوێ ئەم چیرۆکە بڵاوبکەمەوە رۆشنبیرانی ئێمە زۆریان ئەوەیان نیشانداوە کە بەو شێوەیەی چیرۆکەکە دەڵێت خراپ نین، بەڵام باشە دەبێ ئەم ئاگادارییە لەو کاتەدا بدرایە، دەبوو ئەم قسەیە بکرایە، ئەسڵەن مرۆڤ ناتوانێ لەپێشدا ئەوەبزانێ یان ئەوە دیاری بکات، کەچ ناوەڕۆکێ، چ بابەتێ، چ هەڵبژاردنێ بۆ هەمیشە لەئارادا دەبێت، نووسەر هەموو هەوڵێ دەدا کە تا ئەو شتەی کاری تێکردووە، ئەو شتەی لەکۆمەڵگەکەیدا هەیە، بیکات بەچیرۆك و بیخاتەڕوو بۆئەوەی پاشان بچێتە ناو ئەزموونەکانی تریەوە، ئێستا ئیدی یان بەڕاستی فەرامۆش دەکرێت کەغەمی لێناخورێ یان دەمێنێتەوەو کۆن دەبێت، هەربۆیە دەشێ نووسەرێك دوای سی ساڵ، پەنجا ساڵ، سەدساڵ بەتەواویی فەرامۆش بکرێت و هیچ مایەی غەم خواردن نییە. مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەو نووسەرە لەسەردەمی خۆیدا هەڵوێست و کاردانەوەی نەبووە، کاتێك هەیە کەخەڵکی دەچن یەخەی یەکێك دەگرن و دەکێشن بەبناگوێیداو جوێنی پێدەدەن تەنانەت دەشێ ئەو کەسە سەربڕن، بەڵام کاتێك نووسەر دەیەوێت ئەو تووڕەیی و هەڵچوونە نیشانبدات، هەقی ئەوەی نییە دروشم بەرزبکاتەوەو بیکات بەهاتوهاوار، دەتوانێ وەکو بابەتێ ئەو چیرۆکە بخاتەڕوو، ئەوسا ئەگەر لاوازبوو فەرامۆش دەکرێت و ئەگەر بەهێزیش بوو چیرۆکەکەی دەبێتە نموونەیەك بۆ ئەو مەسەلەیە کەتەنانەت دەکرێ قسە ئاسایی و رووکەشەکانیش لەچیرۆکەکەدا بەیان بکرێت.**

*واتە چیرۆکنووس ئەرکی ئەوەیە ئەو رووداوانەی کاری تێدەکەن بیکات بەچیرۆك، ئایا لەهەلومەرجی فیعلی ئێمەدا تێزێکی ئاوا دەکرێ راست بێت؟

**-نەخێر! ئەوە زۆر خۆپەرستییە ئەگەر بڵێین (ئەوانەی کاری تێدەکەن بکات بەچیرۆك) بۆ نموونە وایدابنێ کەمن لەکێشەیەکی تایبەتی ناڕەحەت بم و پاشان بیکەم بەهاتوهاوار، راست وەك ئەوەی مەلای مەشهور وایە کەدەرزی دەکرد بەگیانی خۆیدا، ئەگەر چیرۆکنووس وابێت نەیتوانیووە کێشە تایبەتییەکانی خۆی بکات بەگشتی یان کێشە گشتییەکان لەبێژنگی تایبەتی خۆی بدات و دووبارە بیخاتەوە ئاستی گشتی.**

*حاڵیبووم، یەکێك لەباشترین چیرۆکەکانی تۆ کەدەتوانم لێرەدا وەکو نموونە بیهێنمەوە چیرۆکی (عروسك چینی من- بووکەشووشەی چینی من) کە بەوردی کات و سەردەمی تێدایە، واتە ئەو واقیعەی کەباسی دەکەین دەتوانێ لەبەرامبەرجیهانی واقیعدا هۆشیاریمان بداتێ. بەڵام لەڕووی خوێنەرەوە باوەڕموایە بارودۆخەکە گۆڕاوە. من پێموانییە خوێنەرانی ئەمڕۆ وەکو خوێنەرانی پێنج ساڵ بەر لەئێستا بن، ئایا ئەم گۆڕانە لەچیرۆکی هاوچەرخی ئێمەدا، بەتایبەتی لەچیرۆکەکانی تۆدا بەرچاو دەکەوێ؟

**-ئافەرین! ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە، بڕوانە ئەو کێشەیەی کە لە(بووکە شووشەی چینی من)دا بڕیارە بخرێتەڕوو، لەو زەمانەدا بەهیچ هۆیەکەوە**

ناگاتە گوێی خوێنەر، بەڵام ئێستا هەمان مەفهوم کە (بووکە شووشەی چینی مـن) دەیـەوێت بیگەیـەنێ زۆر بەئاسـانی بـەگوێی هـەمووان دەگـات، کەواتـە وادیارە بەهای ئەو چیرۆکە ئەمڕۆ کـەمترە، بارێکی کـەمتر هەڵـدەگرێ. واتـە پێشـان بـارێکی هـەواڵی هـەبووە کەئێسـتا ئـەم بـارە هەواڵییـەی کـەمترەو دەکرێ ئەوە لەنووسینەکانی تردا زۆر دەوڵەمەندتر دەسـتبکەوێت. کەواتـە ئـەو کێشـەیەی لێـرەدا دەخرێتـەڕوو ئـەم نموونەیـەش نموونەیـەکی باشـە بـۆی ئەوەیـە تـەکنیك بنـەماو بناغەیـە، شـێوازی خسـتنەڕووە، هەڵبەتـە ئـەم مەفهومـە ئـەوە نییـە کـەدەکرێ شـتی بـێ بـەها بـە تـەکنیکی بـاش وەکـو کـارێکی بـاش بخرێتـەڕوو، چونکە شـتی وائەسـڵەن کـاری کـردە نییـە، بـەڵکو مەسـەلە ئەوەیـە کـەدەکرا ئێمـە هـەمان بابـەت بەتـەکنیکێکی خراپـی ئابڕووبـەر بخەینـەڕوو ئەوسـا تـەنها بـارێکی هـەواڵی دەبـوو. لەکاتێکدا کەچیرۆکی (بووکە شووشەی چینی مـن) ئێستا باری هەواڵی لەدەستداوەو هێشتا بایەخیشی هەیـە. چـۆن؟ لەبەرئـەوەی ئێمـە دەچـینە حاڵـەتی منـداڵێکی پێـنج شـەش سـاڵەوەو دەچـینە قـاڵبی ئەوەوەو لەڕێگەی یارییەکی زۆر سادەی منداڵانـەوە کە بەبووکە شووشـەو دەنکە شـقارتەکانی دەیکـات هەموو کارەساتەکە دروست دەکەینەوە بەبێ ئـەوەی ئەو بزانێت و کچەکە سـەرقاڵی یارییەکـەی خۆیـەتی کەهەسـت دەکـات بـاوکی لەناوچـووە، وەك ئـەوەی ئێمـە بـەهۆی بڵاوکـراوەوە هەواڵەکـە دەگەیـەنین، هەڵبەتـە ئـەم چـیرۆکە کـاتێ بڵاوبـۆوە، ڕەواجـی زیـاتری هـەبوو، ڕەواجـی هـەواڵی زیـاتر بـوو، بـەڵام ئێستا ڕەنگە ڕەواجی هونەریی زیاتر بێت، چونکە چیرۆکەکە نەیویستووە تەنها کارەسات باس بکـات، بەڵکو ویستوویەتی کارەساتەکە بباتە قوڵایی زەینی نەوەی داهاتووشـەوە بۆئـەوەی بـزانن چـی بەمنـداڵێ کراوەو دەکرێ و لەداهاتووشدا دەکرێ.

*ئـەو کەسـانەی چـیرۆکەکانی تۆیـان خوێنـدبۆوە پێیـان وابـوو کـەتۆ زۆر بایـەخ بـەکارەکانی نووسـەرانی ڕۆمـانی نـوێی فەرەنسـی دەدەیـت و زۆر سـوود لەتەکنیکەکانی ئەوان دەبینیت. بۆ نموونە ئـەو بایەخـەی بەشتت داوە لەڕۆمانی (شازادە ئیحتیجاب)دا یان شێوازی مۆنولۆگ، ئایا تەنها ڕیزکردنی تـەکنیکێ بەسـە بۆئـەوەی یەکێك شتێك بنووسێت و بڵاویبکاتەوە، ئەگەر ئەمـە نییـە ئەو کێشەیەی کەچیرۆك تەرحی دەکات کامەیە؟

—مـن پێموایـە ئـەم چیرۆکنووسـەی کەئێسـتا لێـرەدا دانیشـتووە هـەموو دەسـتکەوتەکانی بەشـەریەت لـەبواری چیرۆکنووسـین و ڕۆمـان نووسـیندا لەبەردەسـتیدایەو دەبێـت سـوود لەهەموویان وەربگرێ و هۆشیاریی سەبارەت بە هـەر کامیـان مـاڤ خۆیـەتی. باشـە کەسـێك ئەگـەر زانیارییـەکی وا بـەرفراوانی لەبەردەسـتدابێت دەتوانێـت ببێـت بەمامۆسـتای ڕۆمـان نووسـین و دەرس بڵێتـەوە، بـەڵام ئـەو مەسـەلەیەی کەئێسـتا تەرح دەکرێت ئەوەیە لەبەرچی سوود لـەو تەکنیکە وەردەگـرێ، دەبێـت هۆیەکـەی لـەخودی کارەکـەدا بێـت، بـۆ نموونـە ئەگـەر بایـەخ بـە بـەوردی تۆمارکردنی شتەکان دەدات، کێشەکە ئەوە نییە کە بەکام شێوازی ڕۆمان نووسین یان کام قوتابخانەو کام ستایل ئەم کارە ئەنجامدەدات، کێشـەکە ئەوەیە کەئەو تەکنیکە بۆ ئەو ڕۆمانە تایبەتە گونجاو بێت، واتە هەر ڕۆماننووسێ دەبێت لەسەر قوڵلـەی ڕۆمان نووسـین دابنیشـێت و سـوود لەهـەموو شـتێ وەربگـرێ، ئەمـە بەشـێکە لەڕۆشـنبیریی مـرۆڤ ، بـۆ نموونـە لە(بـەرخی ونبـووی شـوان)دا کـەبێگومان نووسەرەکەی هەم ڕۆمانی نوێی خوێندۆتـەوەو هـەم

ئـەو چـیرۆکانەی بەشـێوەی مونولـۆگ نووسـراون، ئێسـتا سـەرنجی وەسـفکردنی شـتەکان بـدەین لـەم ڕۆمانەدا، شوانەکە لەجێگایەکی ڕۆمانەکەدا دەچێتە مـاڵی تەنیاییـەوە، ماڵەکـە شـتی تێدانییـە، شـوێنی بـەتاڵی شـتەکان دیـارە، بەشـێوەیەکی ورد وەسـفیان دەکـاتو تەنانـەت تـەپوتۆزی سـەرمێزەکەش بـاس دەکــات، ئاشــکرایە بۆچــی ئــەم کــارە دەکــات، هەرچـەندە زیـاتر وەسـف بکـات هەڵبەتـە هـەتا ئـەو شــوێنەی کەخوێنــەر مانــدوو نــەبێت، زیــاتر لەکارەسـاتەکە حـاڵی دەبێـت. نموونەیـەکی تـر دەهێنمـەوە، لـەکۆتایی کتێبی (کریسـتین و کیـد)دا کارەکتەرەکــە جگەرەکــەی دەســتێتی، لەکاتێکــدا کەلایــەنی پەیوەندیــدار ئیــدی ڕۆیشــتووەو ئــەو تێـدەگات عەشـق لـە گاڵتەجاڕییـەك زیـاتر نـەبووەو تەنها هۆکارێك بووە بۆ گەیشتن بە(کریستین و کید) بەیـەکتری، لـەم سـاتەدا تـەواوی سـەرنجی دەچـێتە ســەر جگەرەکــەی‌و وەســفکردنی ســووتووی جگەرەکــەو وەریــنی ســووتووەکە، کەواتــە ئەگــەر وەســف لەئارادایــە، ئاراســتەکردنەکەی لەخۆیدا خۆی حەشارداوە.

## سەرچاوە:

ڕۆژنامەی (همشهری)

2002/6/22

# خەڵکسالاری‌و زلهێزەکان

-گفتوگۆ لەگەڵ (مارك پلاتنەر)دا-

لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

مارك پلاتنەر کۆمەڵەنوسینێکی فراوانی هەیە، نوسینەکانی ئەو کە ئوستادی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی تۆرۆی نیویۆرك بووە، پتر تایبەتە بە بواری خەڵکسالاری‌و لە لایەنە جۆراوجۆرە سیاسی‌و کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکسالاری دەکۆڵێتەوە. ئەو زۆرینەی وتارەکانی لەبڵاوکراوەی لۆکاڵی (خەڵکسالاری) بڵاودەکاتەوە کە خۆی لەساڵی (1998)ەوە سەرنوسەرێتییەکەی لەئەستۆ گرتووە. ئەوەی لێرەدا دێت، بەشێکە لە گفتوگۆی (رامین جەهانبەگلو) لەگەڵ پلاتنەردا.

*ئێمە ئێستا لە بارودۆخی نوێی بەجیهانیبوونی دوای جەنگی ساردداین، جیهانێکی جمك لەگەڵ مەشروعییەتێکی سیاسی، واتا خەڵکسالاری‌و لەگەڵ یەك زلهێزدا واتا وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەڵام ئەم بارودۆخە تاکەی بەردەوام دەبێت؟ خەڵکسالاری تاکەی دەتوانێ وەك سیستەمێکی سیاسی بێڕکەبەرو بێ نەیار لەمەیدانی جیۆگرافیای سیاسی‌و یا ئایدۆلۆژیدا بمێنێتەوە؟

–ئەمە پرسیارێکی گەلێك دژوارە، کاتێك هەلومەرجی دوای جەنگی سارد لەساڵە بەراییەکانی دەیەی (1990) هاتەئارا، من وتارێکم لە گۆڤاری (خەڵکسالاری)دا نوسی‌و ئەم پرسیارەم هێنایەپێش کە ئایا ئێمە گەیشتووینەتە قۆناغێکی کورتی نوێبوونەوەی ژیانی خەڵکسالاریی کە تارادەیەك بۆتەجێی پەسەندی جیهان، یا ئەوەیە کە ئارامیی دوای گەردەلولەو ڕکەبەرێکی ئایدۆلۆژی جددی سەردەردەهێنێت. بەڵام وادەزانم کە بەوزووانە هێڵ‌و نیشانەی ڕکەبەرێکی جددی ئایدۆلۆژی دەرناکەوێت کە بتوانێت لەگەڵ ئەو دیدگایەی خەڵکسالاریدا سازش بکات کە لە جیهاندا قبوڵ کراوە.

بێگومان، کۆمەڵە گروپ‌و دیدگاگەلێکی بەرفراوان هەیە کە بەتەواوەتی لەگەڵ کۆمەڵگەی خەڵکسالاریدا دوژمن‌و ناکۆکن‌و بەشێوەیەکی توندوتیژانە ڕووبەڕووی دەبنەوە. بەڵام ئەوان زۆر لەوە دوورترن کە توانستی پێشکەشکردنی

**چەمكێكی ئەلتەرناتیڤو خاوەنی هەقانییەتێك بن كە بەشێوەیەكی سەرتاپاگیر قبوڵ بكرێت. لەمڕووەوە، پێشبینی من ئەوەیە كە تەنانەت ئەگەر پێشبینی دەركەوتنی ئایدۆلۆژییەكی نوێ تا ئەم ئەندازەیە دژوار نەبێت، لایەنی كەم خەڵكسالاریی تا چەندین دەیەیتر وەك بنەمایەكی متمانەپێكراو و لەسەرهەق لەمەیدانی سیاسەتی جیهانیدا هەرپایەدار دەبێت. بەڵام لەتەك ئەوەدا، جیاوازی تێڕوانینەكان لادانێكی فراوانیشی لەگەڵ بارودۆخی ئێستای خەڵكسالاریدا دەبێت كە نمونە بەرجەستەكەی دەكرێ لە دەسەڵاتی ولاتەیەككگرتووەكانی ئەمریكادا بدۆزرێتەوە.**

* هەندێ لە شیكاران‌و لێكۆڵەرەوان لەم بڕوایەدان كە كاروباری ئیتیكی‌و هێزی سیاسی بێڕكەبەری خەڵكسالاریی لە خووخەسڵەتی بەجیهانیبوونەوەكەیەوە سەرچاوە دەگرێت، تۆ چۆن بیردەكەیتەوە؟ چ ئاستەنگگەلێك لەبەرامبەر ئەم خەسڵەتەی بەجیهانیبوونی خەڵكسالارییدا هەیە؟

**–من لەو بڕوایەدام كە شەڕی خەڵكسالاریی لەمەیدانی بەجیهانیبووندا، شەڕێكی لەهەق‌و دروستەو بنەمای بەجیهانیبوون بۆ ڕەگەزو سیفاتە بەهێزەكانی مرۆیی دەگوازێتەوە. هەڵبەتە خۆیشی لەژێر كاریگەری كلتورو مێژووشدایە. بەڵام ئەو خەڵكەی كە ئاشنای بەهاكانی خەڵكسالاری دەبن، مەیلی ئەوەیان هەیەو پێیان خۆشە كە مەسەلەكە زۆر سەرنجڕاكێش بێت. ئەم كارەش بەومانایە نییە كە ڕەگەزەكانی خەڵكسالاریی بڵندترین ڕەگەزەكانی ناو مرۆڤن، بەڵام بەدڵنیاییەوە بەهێزترینیانە. بۆنمونە، دەكرێ بوترێ سیستەمی خەڵكسالاریی لیبراڵ لەهەر سیستەمێكی تر زیاتر پاڵنەرە بۆ دابینكردنی ئازادی‌و خۆشگوزەرانی.**

*ئایا تۆ پێتوایە كە خەڵكسالاریی لیبراڵ لەگەڵ هەموو شێوە كلتورییەكانی جیهانی ئێمەدا ڕێكدەكەوێت؟

**– هەموو كلتورەكان لەگەڵ خەڵكسالاریی‌دا دەگونجێن، بەڵام هێشتا دەبێ بڵێم لە كلتورە جیاوازەكاندا كۆمەڵەڕەگەزێك هەن كە دەبنە مایەی ناكۆكی تێڕوانین‌و دژایەتی لەگەڵ خەڵكسالاریدا، بۆنمونە لەمێژووی نوێدا، خۆرئاوا تێڕوانینێكی دوژمنانەی لەگەڵ خەڵكسارییدا هەیە كە ئەم سیستەمەی بە (خەڵكسالاریی بۆرژوا) ناوبردووە. لەخۆرئاوا ناكۆكی لەگەڵ خەڵكسالاریی لیبراڵدا هەمیشە پڕلە ئاستەنگی بووە. بڕوام وایە خەڵكسالاریی لیبراڵ لە هەر سیستەمێكی تر زیاتر وا لە خەڵك دەكات تا بەختیارترو ئازادانەتر بژی، بەڵام لەهەمانكاتدا لەڕۆڵی ڕووناكبیران كەم دەكاتەوەو ئینتیمای بۆ ئاستێكی نزمتر لە پێوەرە كلتورییەكان هەیە. لەمڕووەوە، من بڕوام وانییە هەموو شتێكی خەڵكسالاریی شیاوە. لەمبارەیەوە توكویل ڕێنماو سەرمەشقی منە كە لە دیدگایەكی كلتوریی‌و هەروا دیدگاكانیترەوە، سەبارەت بە هەندێ لەكاریگەرییەكان‌و دەرەنجامەكانی خەڵكسالاریی بۆسەر كۆمەڵگای مرۆیی زۆر نائاسودەو ڕەشبین بوو. بەڵام توكویل خەڵكسالاریی وەك دادپەروەرانەترین شێوازی ئەنستیتۆ سیاسییەكان دادەنا، چونكە بەشێوەیەكی سەرتاپاگیر خەڵكێكی بێشومار لەخۆدەگرێت. توكویل دەیوت بەهۆی هەمان ئەو كاراییەوە، خەڵكسالاریی بەردەوام بەهێز بووەو بەئەركی خۆی زانیوە تا هێندە نیگەرانی خەڵكسالاریی بێت كە ئەم سیستەمە نەك تەنها هەمیشە بەئازاد دەمێنێتەوەو بەرەو تۆتالیتاریی نەڕوات، بەڵكو ڕەگەزە تازەو بەهادارەكانی پاشماوەی سیستەمی ئەشرافەكانی**

پێشوو کە لەگەڵ خەڵکسالاریدا دەسازێن، لەخۆبگرێت و ئیزافەی سەرخۆی بکات.

*دەمەوێ دەربارەی ئەو مەترسیانە بدوێین کە لەجیهانی ئێمەدا هەڕەشە لە خەڵکسالاریی دەکەن، یەکێك لەوانە بەرفراوان بوونی ناسیۆنالیزمە لەسەرتاسەری جیهاندا کە نمونەکەی دەکرێ لە جەنگی ساڵانی دەیەی (1990) لە یۆگۆسلاڤیا ببینرێت. هەڕەشەیەکی تر تیرۆریزمو توندوتیژییە تاوانکارەکانە کە نمونەی ئەمەشمان لە ڕووداوی (11) یانزدەی سێپتامبەردا بینی. سێیەمیان، هەژاریو زیادبوونی دانیشتوانەو سەرەنجام، ناڕەوایی و کەم تەحەمولی مەزهەبییە.

-دەبێ یەك بەیەك ئەم هەڕەشانە شرۆڤە بکەین. من لە ناسیۆنالیزمەوە دەست پێدەکەم. من ناسیۆنالییزم وەك چەمکێك هەژمار دەکەم کە دەبێ کەڵەکە نەبێت و لەتەنگەبەریدا بمێنێتەوە. من دەبێ لەنێوان (ناسیۆنالیزمی تایبەتی) و هەستی ئینتیما بۆ سیستەمی خەڵکسالاریی لیبراڵدا جیاکارییەك بکەم. پێموایە کە دووەمیان (وابەستەبوون بە سیستەمی خەڵکسالاریی لیبراڵ)ەوە نەك تەنها هەڕەشەکەر نییەو بێمەترسییە بەڵکو تا ئەندازەیەکیش پێویستە. ئەگەر بڕیاربێ خەڵکسالاریی بەدروستی کاربکات، دەبێ هاووڵاتیان هەندێ هەستی وابەستەبوونی تایبەتیان بە هاوڵاتیانیترەوەو هەروەها بەو وڵاتەوە هەبێت کە تیایدا دەژین. ئەمە خۆی یەکێکە لە ڕەگەزەکانی بەجیهانیبوونی لیبراڵ لە خەڵکسالاریی لیبراڵدا. تۆ هەڵبەتە لە خەڵکسالاریی لیبراڵدا ناتوانیت هاوڵاتیەکی تەواو نیشتیمانی دەستەبەربکەیت، ئەوان زیاتر پێویستیان بەوە هەیە کە پابەندی هاونیشتیمانانی خۆیان بن تا خەڵکی ناوچەکانی تری جیهان.

گومان لەوەدانییە کە ناسیۆنالیستی بنیاتنراو لەسەر نەتەوایەتییەکی تایبەت، هەڕەشەیەکی ڕاستەقینەیە، ئەگەرچی پێویستە بڵێم کە پێدەچێت لەیەکێك لەو شوێنانەی هەڕەشەی ناسیۆنالیستی هەیە، واتا لە یۆگۆسلاڤیای پێشوو، هەنوکە پوکاوەتەوە.

بەڵام دەربارەی هەڕەشەی خەڵك یا تیرۆریزم، پێموایە تیرۆریست هەڕەشەیەکە بەرەوزیادبوون دەچێت و لەهەمانکاتدا زۆر مەترسیدارە. بەڕای من، تیرۆریزم هەڕەشەیەکە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەگەڵ ئێمەدا ماوەتەوەو سیستەمەکانی خەڵکسالاریی لیبراڵیش ماوەیەکی درێژخایەن ئەوی لەگەڵدا بووە، بەڵام ئەوەی لەمڕۆدا جیاوازە گەورەیی و قەوارەی مەزنی ئەو وێرانکارییە کە ژمارەیەکی کەم هێندە بەتوانان بەهەمانشێوەی کە دەزانیت، لە دوو دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ژمارەیەکی زۆری ڕووخسارە بەرجەستە سیاسییەکان بەزۆریی بەدەستی ئانارشیستە ئەورووپاییەکان کوژراون. بەدڵنیاییەوە ئەوان بوونەتەمایەی زەرەرو زیان، بەڵام ژمارەی قوربانیان لەگەڵ ئەوەشدا کەم بووەو مردنیشیان بەئەندازەیەك کاریگەر نەبوو کە ژیانی کۆمەڵگاکان بەچەشنێکی بنەڕەتی بگۆڕێت، بەڵام ئەمڕۆ قەوارەی وێرانکەرانەی تیرۆریستەکان بەئەندازەیەکی گەورەیە. خەڵکانێك بە بیروباوەڕی توندڕەویی و بیر وشکەوە، دەکرێ بۆ خەڵکسالاریی زۆر مەترسیدار بێت. دەکرێ وادابنرێت ئێستا هەر مرۆڤێکی ئاسایی دەتوانێ شتێکی گچکە بخاتە گیرفانییەوە کە لەڕاستیدا هەروەك بۆمبێکی بەهێز بتوانێ شارێك وێران بکات. ئەگەر وابێت، هەموو جیهان دەگۆڕێت، بەڵام خۆشبەختانە هەلومەرجەکە بەم چەشنە نییە.

هەڕەشـەیەکی تـر کـە تـۆ هـەژمارت کـرد، هـەژاریو زیادبوونی دانیشتوان بوو. بێگومان ئەم کـارە بـۆ ئـەو وڵاتانـەی بـەدوای دەسـتەبەرکردنی خەڵکسـالاریدا دەگـەڕێن، کۆمەڵـە دژوارییـەکی زۆر فەراهـەم دەکـات. هەنـدێ لـە وڵاتـە دانیشـتوان زۆرەکـان توانیویانـە لـەم ڕێگەیـەدا سەرکەوتوو بن. خاڵێکی تر دەمەوێ بیڵێم ئەمەیە کـە بـەهای جیهـانی زیـادبوونی دانیشـتوان، بـەرەو کەمبوونەوە دەچێت.

ئێمـە ئێسـتا فریـودراوی هەڵـە سۆسـیۆلۆجییەکانی قۆناغـەکانی پێشـووین. بـەڵام لەهەمانکاتدا، لـە زۆرینـەی وڵاتـە گەشـەکردووەکانی جیهـانو تەنانـەت لـە جیهـانی تازەگەشـەکردوودا، بارودۆخەکـە لـەم ڕوانگەیـەوە بـەرەو باشـبوونەوە دەچـێتو بـەهای گەشـەی دانیشـتوان کـۆنترۆڵ دەکرێـت. تـەنها ژمارەیـەکی کـەم لـەو ناوچـانەی جیهان هەن کە هێشتا تۆ دەتوانی گەشـەی خێرای ژمارەی دانیشتوانیان تیادا ببینیت. لەمڕووەوە من پێموایـە لەدرێژمـەودادا، دیـاردەی زیـادبوونی دانیشـتوان بەئەنـدازەی دەیـەکانی پێشـوو هەڕەشـەیەکی گـەورە نابێـت. دەربـارەی هـەژاریش، ڕوونە کە یەکێك لە کێشەکانی خەڵکسالارییە. بەڵام ئـەم دیاردەیـەش لەکۆنـەوە هـەژاریی لەگـەڵ ئێمـەدا بـووە، مـن پێموانییـە ڕێـژەی هـەژاریی زۆرتـر بێـت لـەماوەی دەیـەی ڕابـردوو، بـەڵکو بـە تێڕوانینـی مـن لەئاستێکی جێگیردا ماوەتەوە.

ناڕەوایی و کەم تەحەمولیش لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕابـردووە دوورەکانـەوە بۆئێمـە ماوەتـەوەو هەڕەشـەیەکی زۆر جدییـە کـە جگـە لەچـەند شـەپۆلێکی مەترسـیداری، هەنوکـە بەشـێوەیەکی سەرەکی بێدەنگ دەردەکەوێت.

گـەورەترین مەترسـی نـاڕەوایی ئەوەیـە ئـامرازێکی وێرانکـەر بکەوێتـە دەسـت ژمارەیـەك خـەڵکی نـاڕەواوە. بۆنمونـە سـەیری جـەنگی نێـوان موسڵمانانو هیندۆسـەکان لـە هیندسـتان بکـەین کە تائێستا هـەزاران کـەس بۆتـە قوربـانی، لـەم چەشـنە کێشمەکێشمانەدا ئەگەری بەکارهێنانی ئەو چەکانە هەیـە کـە دەتوانـێ کارەسـاتێکی ڕاستەقینە ئـەنجام بـدات، بـەڵام هەرئەمـەش وەك مەسـەلەکانی تـر لەکۆنەوە بەردەوامەو من نازانم ئایا ئەم دیاردەیە هەلومـەرجێکی خـراپتری لـە سـاڵی (1949) لـە نیمچەقارەی هیندستان هەیە یاخود نا.

**سەرچاوە:**

سایتی (جمهوریخوازان) ڕۆژ 2006/6/8

# ڕۆمان سنوورەکانی ئەوروپا درێژ دەکاتەوە

ئۆرهان پاموك

لە سویدییەوە: هیوا قادر

**دەبوو ئەوروپا بەبێ ڕۆمان چی بوایە؟ هیچ.**

**کاتێك ئۆرهان باموك خەڵاتی ئاشتی لە ئەڵمانیا وەرگرت، باسی ئەوەی کرد کە چۆن رۆمان ئەوروپای گواستەوە بۆ ناو تورکیا و تورکیاشی گواستەوە بۆ ناو ئەوروپا.**

مێژووی رۆمان مێژووی بزوتنەوەکانی مرۆڤایەتییە، ئێمە کاتێك دەتوانین بڵێین ئازادیمان بردۆتەوە کە بتوانین قاچمان بخەینە ناو پێڵاوی ئەوانی ترەوە، بۆ ئەوەی بتوانین لە ڕێگای فەنتازیاوە خۆمان لە شوناسی خۆمان رزگار بکەین. هەر ئەم شێوە بیرکردنەوەیە بوو کە بووە هۆی ئەوەی رۆمانە گەورەکەی (دانیال دیفۆس) نەك هەر بە تەنها (رۆبنسۆن کرۆس) بخوڵقێنێت بەڵکە توانی کۆیلەیەکی وەك (فرایدەی)ش خەلقبکات. "دۆن کیخۆت"یش وەك سوارچاکێك کە لەناو دنیای کتێبەکاندا دەژیا هەمان هێز و توانای خەڵقکردنی لە پشتەوە بوو کە تەنانەت بووە هۆی خولقاندنی "سانچۆ پانزا"ی خزمەتکاریشی. من بۆ خۆم حەزدەکەم (ئانا کارین)ی تۆڵستۆی بخوێنمەوە تا بزانم چۆن پیاوێکی ژنهاوردووی وەك تۆڵستۆی توانیوێتی خۆی بخاتە جێگای ژنێکەوە کە ژیانە ناخۆشەکەی هاوسەرێتی خۆی تێکدەشکێنێت و دواتریش خۆی لەناو دەبات. دیارە تۆڵستۆیش لە ژێر کاریگەری ڕۆماننوسێکی پیاوی تردا ئەم رۆمانەی نووسیوە کە ئەویش (فلۆبێر) بووە. لە ڕاستیدا فلۆبێر خۆی ژنی نەهێناوە کەچی سەرکەوتوانە توانیوییەتی خۆی بخاتە ناو هۆشمەندی ئافرەتێکی ناڕازی وەك مەدام بۆڤارییەوە.

**هەرە جوانترین کاری گەورەو پڕلوغزی ناو مێژوو رۆمانی (مۆبی دیک)ە، (هیرمان میلڤل) لە فیگوری نەهەنگە سپییەکەدا سەرتاپای ئەو ترسە دەخاتە ڕوو کە لە سەردەمی زوودا ئەمەریکا دووچاری بووبوو، ئەو ترسەش بەشێوەیەکی گشتی ترسبوو لە کلتووری کەسانی غەریبە. هەر بۆیە ئەو کەسەی کە دنیا تەنها لە ڕێگەی کتێبەوە دەناسێت ناتوانێت بیر لە دەوڵەتێکی وەك ئەمەریکای خوارووو بکاتەوە بەبێ ئەوەی بیر لەو ڕەشپێستانە نەکاتەوە کە لە رۆمانەکانی (فۆکنەر)دا هەن. بە هەمان پێودانیش پێموایە گەر نووسەرێکی ئەڵمانی بیەوێت بە گشتی باس لە ئەڵمانیا بکات و کەچی لە رووبەری باسەکەیدا تورکەکان فەرامۆش بکات ئیدی بە هەرچ بیانوویەکی وەڕسکەرەوە بێت کە گوایە دووری دەخاتەوە لە باسەکەی، لە دیدی مندا بەرهەمی ئەو نووسەرە بەرهەمێکی سەرکەوتوو نییە، هەر بە هەمان پێودانگیش گەر نووسەرێکی تورك سەرکەوتوو نەبێت لە باسکردنی کوردەکان و کەمە نەتەوایەتییەکانی تری ناو تورکیادا، یاخود ئەو سەرکوتکردن و بێدەنگکردنانەی تر فەرامۆش بکات کە پارتە تورکەکان لەناو مێژووی ئەو وڵاتەدا کردوویانە. لە دیدی مندا ئەو نووسەرەی کە خۆی دەخاتە ناو فەرامۆشییەکی لەم جۆرەوە بەرهەمێك دەخوڵقێنێت کە لە هەناویدا هەڵگری شەبەقێکی گەورەیە لە نوقسانی.**

**بە پێچەوانەی زۆر لەو کەسانەی کە پێیان وایە بیر و بۆچوونی ڕۆماننوس دەستنیشانی دەکات کە سەر بە چ گروپ و حیزبێکە، من پێموایە بیروبۆچوونی سیاسی رۆماننوس لەو هێزی فەنتازیایەوە سەرچاوە دەگرێت کە خۆی خاوەنییەتی، لەو توانایەوەی کە خودی نووسەر دەکاتە کەسێکی جیاواز لە کەسانی تر، دیارە تەنها ئەو توانایە ئەو ناکات بە کەسێك کە توانای کەشفکردنی دیوە نادیارەکانی ئەو ئینسانانەی هەیە کە لە واقیعدا هەن، بەڵکە ئەو دەکاتە کەسێکی قسەکەر لە بری ئەو کەسانەی کە خۆیان ناتوانن قسە بکەن، خۆیان ناتوانن ئەو دەهریبوون و قسە تاسێنراوانەی کە هەیانە بیخەنە ڕوو، لەبەر ئەمەیە کە من پێموایە بیروبۆچوونی سیاسی رۆماننوس هیچ رۆڵێکی ئەوتۆ نابینێت.**

**با ئێمە نمونەیەك وەربگرین لەناو هەموو ئەو بیروباوەڕە سیاسیانەی کە لەسەردەمەکانی پێشودا بۆ رۆمان کراوە، دەبینین ئێمە چیتر رۆمانی (ڕۆحە شەڕانییەکان)ی دیستۆیفسکی وەك ئەو بیروبۆچوونەی کە دیستۆیفسکی خۆی هەیبووە بۆ رۆمانەکەی نایخوێنینەوە، دیستۆیفسکی وەك رۆمانێکی "جەدەلی" سەیری رۆمانەکەی خۆی کردووە و وەك ئاوڕدانەوەیەکیش بۆ کەسە گۆشکراوەکانی وڵاتانی خۆرئاوا، بە تایبەت رووسە نهلیستییەکان.**

**بەڵام کە ئێمە لە ئێستادا ئەم رۆمانە دەخوێنینەوە وەك رووداوێکی رابردووی رووسیا تەماشای دەکەین کە کەشفی ئەو نهێنییە گەورەیەی ناو رۆحی ئینسانی سلاڤی کردووە. ئەمە جۆرە نهێنییەکە کە تەنها رۆمان لە توانایدا هەیە کەشفی بکات، چونکە ئێمە ناتوانین بەخوێندنەوەی رۆژنامە و سەیرکردنی تەلەفزیۆن ئەم نهێنیانەمان چنگ بکەوێت. تێگەیشتن لە نهێنیەکانی تایبەتمەندێتی خەڵك و مێژووی نەتەوە، هەروەها تێگەیشتن لەو بەشەی ژیان کە توشی راچڵەکینمان دەکات کە لە هەمانکاتدا بە قوڵییەکەی دەمانترسێنیٚ و هەم بەو سادەییەشی کە هەیەتی توشی شۆکماندەکات. لە ڕاستیدا گەیشتن بەم حەقیقەتانە تەنها بەهۆی خوێندنەوەیەکی**

پشوودرێژو سڵکەرەوەی ئەو ڕۆمانە گەورانەوە دەبێت کە هەن.

کاتێك ڕۆمانی ڕۆحە شەڕانییەکانی دیستۆیفسکی بە چرپە ئەو نهێنییە شاراوانە بە گوێی خوێنەرەکانیدا دەچرپێنێ کە لەناو قوڵایی مێژوودان و لەناو شانازییەکان و شکستەکاندان یاخود لەناو شەرمەزاریی و ڕقوکینەدا خۆیان شاردۆتەوە، لە هەمان کاتدا ئەو نهێنییانەش دەدرکێنێت کە نهێنی ناو مێژووی ژیانی دایستۆیفسکی خۆی بوون. بەڵام لە پشت لادانی ئەم پەردەپۆشکردنەشەوە نووسەرێکی نائومێد وەستاوە کە بە هەمان ڕێژە ڕق و خۆشەویستی بەرامبەر خۆرئاوا هەیە. ئەو خۆی بە تەواوەتی بە کەسێکی خۆرئاوایی نەزانیوەو کەچی ڕووناکی ئەو شارستانییەتەش لە ناوەوەیدا بڵاچەی داوە، پیاوێك بووە هەستیکردووە لە نێوان ئەو دوو دنیایەدا بەندکراوە.

وا ئێمە وردە وردە نزیکدەبینەوە لە پرسیاری خۆرهەڵات و خۆرئاوا. کاتێك ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە هەزار و هەشتسەدەکاندا ڕەوینەوەی سێبەری خۆی بەسەر دینامیکیەتی خۆرئاوادا دەبینێتەوە هەروەها دەشبینێت کە چۆن شکستە یەك لە دوای یەکەکانی دووبارە دەکاتەوە لەبەردەم لەشکری ئەورووپادا، گرووپێك دێنە مەیدان و ناوی خۆیان دەنێن "تورکەلاوەکان".

تورکە لاوەکان زۆر لەو دواهەمین وەچەیەی سوڵتانە عوسمانییەکان دەچن کە تێکەڵەیەکبوون لە لایەنگرانی پێشکەوتن و ریفۆرمخوازانی خۆرئاوا.

هەمان ئەم مۆدێلە بووە سەرەتایەك بۆ بناغەی تورکە کۆمارییە مۆدێرنەکان و ریفۆرمەکانی کەمال ئاتاتورك. لە پشتی ئەم شێوە بیرکردنەوەیەشەوە قەناعەتێك هەبوو کە گوایە لاوازی و هەژاری تورکیا پەیوەندی بەو ترادیشن و کلتوورە کۆن و بونیاتە کۆمەڵایەتییەوە هەیە کە دیین دەیبات بەڕێوە. دەبێت لێرەدا دان بەوەدا بنێم کە تەنانەت ڕەگوڕیشەی منیش کە ئەستەمبوڵییەکی خۆرئاوانشینە لەگەڵ ئەم بیروڕایەدا بووین، بۆیە هەندێك جار ئەبووینە قوربانی ئەو قەناعەتە ئەگەرچی نیەتێکی باشیشی لە پشتەوە بوو بەڵام نییەتێکی یەك لایەنە و سنووردارانەبوو.

خۆرئاواناسەکان، ئەوانەی پەروەردەی خۆرئاوابوون، لە ڕێگەی لاسایکردنەوەی خۆرئاواوە خەویان بە گۆڕان و دەوڵەمەندکردنی وڵاتەوە دەبینی. چونکە ئامانجی ئەوان دروستکردنی وڵاتێکی دەوڵەمەندتر و ئاسوودەتر و بەهێزتر بوو لە هەمانکاتیشدا وڵاتێکی باوکسالار و نەتەوەپەرست و سەربازی، ئەم مەیلە زۆر بە ئاشکرا لای ئەو تورکە لاوانە زاڵبوو کە لایەنگری خۆرئاوابوون لە ناو تورکە لاوە کۆمارییەکاندا. بەڵام لەبەرئەوەی بزوتنەوەکەیان بەرگێکی خۆرهەڵاتیانەی پۆشیبوو لە بەرامبەر خۆرئاوادا، ولاتەکەیان و کلتوری وڵاتەکەشیانی ڕاکێشایە ناو ئەو قەیرانە قوڵانەی کە لە سەرەتای بنیاتنانەوە دروستبوون: سەرباری ئەمەش ڕەخنەکانی ئەوان بە ئاراستەیەکی تردا دەڕۆیشت کە جیاواز لەو ڕەخنانەی کە لە خۆرئاوادا بەدوای چاودێریکردن و گوزارشتکردنیەوە بوون لەسەر کلتووری خۆیان، بەڵام لای لاوە تورکەکان هەندێك جار تەنانەت وەك شتێکی بێ بەها و هیچ تیا بەسەر نەبوو سەیری کلتوری وڵاتی خۆیان کردووە.

ئەم شێوە ڕەخنەگرتنەش بەجۆرێك لە جۆرەکان بووە هۆی جۆرە هەستکردنێکی قوڵ بە شپرزەیی: شەرمەزاربوون، من هەندێکی لەو شەرمەزاربوونە لەو پەرچەکردارانەدا دەیبینمەوە کە

بەرامبەر بە ڕۆمانەكانی من كرا. كاتێك كە ئێمە لە توركیا گفتوگۆ لەسەر پەیوەندی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا دەكەین یاخود باس لەو گرژییەی نێوان ترادیشن و مۆدێرنیتە دەكەین (كە بەڕاستی لە دیدی مندا پرسیاری خۆرهەڵات و خۆرئاوا ئەمەیە)، یاخود كاتێك پەیوەندی نێوان وڵاتی خۆمان و ئەوروپا چەند بارە دەكەینەوە، هەمیشە فێڵ لەو شەرمەزارییە دەكەین و لە ناو دێڕەكانماندا دەیشارینەوە بۆ ئەوەی نەبینرێت. كاتێك كە من دەمەوێت لە ڕوانگەی ئەو شەرمەزارییەوە باس لە خۆم بكەم خێرا پێچەوانەكەشی پیشاندەدەم كە شانازیكردنە. ئێمە هەموومان ئەو ڕووە دەناسین: هەرچ كاتێك بتەوێت تۆ سەروەتێك لە شانازیت هەیە، هەرچ كاتێك بتەوێت زیاد لە پێویست ئینسانت هەیە كە نوێنەرایەتی ئەو شانازییە گەورانە بكات، وە سێبەرێك لە شەرمەزارییەكانی ئەوەی بەرامبەریشت هەیە بۆ ئەوەی سوكایەتی پێبكەیت. ئێمە لە هەموو شوێنێكدا كەسانێك دەدۆزینەوە كە بە قوڵی هەست بە سوكایەتیپێكردن دەكەن و هەروەها ئەو ناسیۆنالیستە لوتبەرز و بەفیزەش دەبینین كە هاتۆتە ناو مەیدانەكەوە.

بابەتی ناو ڕۆمانەكانی من لەناو ئەو پانتاییە تاریكەوە هێنراون، لەو شەرمەزاریی و شانازی بە خۆكردنانەوە، لەو دەهریبوون و هەستكردن بە دۆڕاندنانەوە هێنراون. هەروەها لەبەرئەوەشی كە من سەر بە نەتەوەیەكم لە دەرگای ئەوروپا دەدات زۆر بە باشی هەستبەوەش دەكەم كە چەندە ئاسانە بەبێ كۆنترۆڵكردن ئەو هەستكردن بە شەرمەزارییە بوروژێنرێت تا هەموو شتێك تەفروتوونا بكات.

من باس لە شەرمەزارییەك دەكەم كە لە باری ئاسایدا تەنها وەك چرپە چرپێك سەیر دەكرێت. یەكەمجار من ئەم چرپەچرپكردنەم لە ڕێی ڕۆمانەكانی دەستۆیفسكییەوە گوێلێبوو لەسەر نەهلیستییەتی سەردەمی خۆیی‌وخۆرئاوا ناسەكان. بۆ ئەوەی ئێمەش بەیەكجاریش خۆمان ڕزگار بكەین دەبێت بە تەواوەتی وازبێنین لە چرپە چرپكردن و بەكراوەیی باس لە شەرمەزارییەكانمان بكەین.

كاتێك ڕۆماننوس یاسای كۆمەڵگا دەشكێنێت، كاتێك ئەو بنی بەڕە دێنێتە سەر بەڕە بۆ ئەوەیە كە ژیان لە ناو ئەو ئەندازە شاراوەیەدا ڕزگار بكات، كاتێك كە ئەو وەك منداڵێكی فزوڵی لێدێت كە بە تەواوەتی نازانیت ووزە و توانای چەندە، هەڵدەستێت بە پشكنینی ئەولایە شاراوانەی دنیا، ئەمە چاوپۆشیكردن نییە لە خێزانەكەی و هاوڕێ و دۆست و خەڵكانی وڵاتەكەی و هەروەها وەڕسكردنی هەندێكیان. چونكە ئەم جۆرە جاڕسكردنە شتێكی باشە. ئەم كارەش تەنها لە ڕێگەی خوێندنەوەی ڕۆمان و چیرۆك و ئەفسانەوە دەبێت كە ئێمە دەتوانین بگەین بەو ئاسانكارییە كە بزانین چ بیرۆكەیەك ئەم دنیایەی ئێمە دەبات بەڕێوە كە تیایدا دەژین: ئەم لایەنانە دەمانخەنە سەر ئەو ڕێگای حەقیقەتانەی كە لەناو خێزان و قوتابخانە و كۆمەڵگاكەماندا شاراونەتەوە و فەرامۆشكراون. هونەری ڕۆمان ڕێگەمان پێدەدات كە پرسیاری ئەوە بكەین كە لە ڕاستیدا ئێمە كێین.

هەندێك جار من هەوڵدەدەم خۆم بخەمە جێگای زۆر لەو خوێنەرانە، كە هەر یەكەو بە جیا لەگەڵ ڕۆمانێكدا لە سوچێكدا دانیشتووە، یان لای مێزەكەیەوەیەتی، یان لەسەر قەنەفەكەی خۆی گرۆمۆڵە كردووە و دەخوێنێتەوە. هەروەها هەوڵیشدەدەم بچمە ناو ژیانی ڕۆژانەشیانەوە. بۆ ئەوەی بە چاوی ناوەوەی خۆم هەزاران، دەیەها هەزار خوێنەر ببینم كە بە هەموو

کونجوکەلەبەرێکی ئەم شارەدا بڵاوبوونەتەوە، کاتێك ئەوان دەخوێننەوە لە هەمانکاتدا خەونی ڕۆماننووسەکەش دەبینن، بەم شێوەیە ژیان و حەقیقەت دەکەن بەبەری پاڵەوانەکانی ناو ڕۆمانەکانیشدا.

کاتێك هەموو ئەو خوێنەرانە وەك خودی ڕۆماننوسەکەیان لێدێت، بیر لە ڕووداوێکی تر دەکەنەوەو خۆیان دەخەنە جێگای ئەوانی ترەوە. وە کاتێکیش من فەنتازیا بە هەموو ئەو خوێنەرانەوە دەکەم و ئەوانیش فەنتازیای خۆیان بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی بچنە جێگایەکی تر، کاتێك کە من دەگەم بە دنیاکانی ئەوان، شەقام بە شەقام، کۆڵان بە کۆڵان، لەو ساتە نزیکدەبمەوە کە بەرهەمەکەی من فەنتازیا بەوەوە دەکات کە چۆن کۆمەڵگا یان گرووپێك لە خەڵکیی یان هەموو نەتەوە، "نازانم چۆنی ناو بەرم" فەنتازی بە حەقیقەتی خۆیانەوە دەکەن.

کۆمەڵگا مۆدێرنەکان و نەتەوەکان لە هەرە قوڵایی خۆیاندا سەرەتای دروستبوونیان لە خوێندنەوەی ڕۆمانەوە دەستپێکردووە. کاتێك کە ڕۆمان دەخوێنیتەوە تۆ خۆت گۆشدەکەیت بۆ کێبەرکێکردن لەسەر ئەوەی کە بزانیت ئەوانەی تر کێن، تەنانەت ئەگەر بێت و ئێمە بۆ کات کوشتن یان بۆ پشودانێکی زۆر کەمیش بێت دەستبدەینە ڕۆمانێك، بێ ئەوەی پێبزانین دەستدەکەین بە بیرکردنەوەیەکی دەستەجەمعی و نەتەوەیی لە کۆمەڵگایەکدا کە ماڵی ئێمەشی تێدایە.

لەبەرئەمەیە کە ڕۆمان بە تەنها نابێتە دەنگی شانازییەکان و خۆشییەکانی نەتەوە، بەڵکە لە هەمانکاتدا دەنگی دەهریبوونەکان و زەحمەکان و ئابرووچوونەکانیشە. ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە ڕۆماننووس دێت و ئەو ئابرووچوونانە بیری خوێنەرەکانی دەخاتەوە، شانازییەکان و ئەو بوونە فشەڵەی خۆشیان بیر دەخاتەوە کە هەندێك جار دەهریبوون و سەرقی نەزەرنەکردنەکانیان بەخەبەر دەهێنێتەوە کە تا ئێستاش دەبێتە هۆی ئەوەی نووسەر ڕابکێشێتە ناو دادگاوە. من لە ماڵێکدا گەورە بووم کە هەموویان ڕۆمانیان دەخوێندەوە. باوکم کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو کاتێك کە من منداڵ بووم ئەو گفتوگۆی لەسەر ڕۆماننووسە گەورەکانی وەکو تۆماس مان، کافکا، دەستۆیفسکی، تۆڵستۆی دەکرد. ئەویش وەکو هەموو باوکێکی تر باسی لە گەورەیی و پیرۆزی جەنراڵەکان دەکرد. لە ساڵەکانی سەرەتاوە من هەموو ئەو ڕۆماننووسە گەورانەم دەبەستەوە بە بوونی بیرۆکەی ئەوروپا خۆیەوە. ئەمەش تەنها پەیوەندی بەوەوە نەبوو کە من لە خێزانێکەوە هاتبووم کە سەر بە بەشە ئەوروپییەکەی ئەستەمبوڵ بوو. بەڵکە لەبەر ئەوە بوو کە هونەری ڕۆمان یەکێك بوو لە داهێنانە هونەرییە گەورەکانی ئەوروپا. لە دیدی مندا ڕۆمانیش وەك ئۆکسترای مۆسیقی و نیگارکێشانی ڕێنیسانس وەهایە و بەردێکە لە بەردەکانی بناغەدانانی شارستانییەتی ئەوروپا. ئەوە ڕۆمانە کە ئەوروپای کردووە بەوەی کە ئێستا هەیە. من ناتوانم بیر لە ئەوروپا بکەمەوە بەبێ ڕۆمان. من لێرەدا باس لە ڕۆمان دەکەم وەك فۆرمێکی بیرکردنەوە، وەك شێوەیەك بۆ تێگەیشتن و فەنتازیاکردن، هەروەها وەك شێوازێك کە خۆی دەخاتە جێی ئەوی تر. منداڵان و لاوانی دنیای دەرەوەی ئەوروپا یەکەم تێڕوانینی قوڵی خۆیان بۆ ئاشنابوون بە ئەوروپا کاتێك دروستدەکەن کە دەستدەکەن بە خوێندنەوەی ڕۆمانەکان. من یەکێك بووم لەو جۆرە منداڵانە کە ڕۆمانێکم دەهێناو خۆم دەخزاندە ناو سنوورەکانی ئەوروپاوە، دەچوومە

ناو کیشوەرێکی نویٚ و کلتورێکی نویٚ و شارستانییەتێکی نوێوە. لە میانەی ئەو سەفەرکردنانەی خۆمەوە بەناو دنیای ئەو رۆمانانەدا فێری ئەوەبووم کە چۆن گوزارشت لەو ویستە نوێیە بکەم بۆ پشکنینی نویٚ. ئەمەش دەرئەنجامێك بوو لە کۆی هەموو ئەو بیروباوەڕانەی کە هی ئەوروپا خۆیبوون، من ئاوا هەستم پێدەکرد.. وە هەروەها با ئەوەش لە بیرنەکەین کە رۆمانە گەورەکانی روسیا و ئەمەریکای لاتینیش سەر بە هەمان رێچکەی کلتوری ئەوروپان، کە رۆمانێك دەخوێنینەوە بۆ ئەوەیە کە دووپاتی ئەوە بکەینەوە کە سنوورەکانی ئەوروپا هەروەها مێژوو جیاوازییە نەتەوایەتییەکانی هەمیشە لە باری گۆڕانکاریدان.

ئەو ئەوروپا کۆنەی لە ناو رۆمانەکانی کتێبخانەکەی باوکمدا باسکرا بوو تەواو ئەو ئەوروپایەی دوای جەنگ بوو. ئەوروپای سەروەختی منداڵی من و ئەوروپای ئێستا جێیەکە کە هەمیشە گۆڕانی بەسەردا دێت، بە هەمان شێوە تێگەیشتنەکانی ئێمەش بەرامبەر مانای ئەوروپا دەگۆڕێت.

من بۆ خۆم تا ئێستاش دیدێکی نەگۆڕم لەسەر ئەوروپا هەیە، کە دواتر لە کۆتایدا دەمەوێت هەندێك قسەی لەسەر بکەم. ئەوروپا بۆ کەسێکی تورك پرسیارێکی زۆر هەستیارە. ئێمە لە دەرەوەی دەرگاکەیدا وەستاوین، بە نیەتێکی باش و هیوایەکی گەورەوە لەم دەرگایە دەدەین و پرسیاری ئەوە دەکەین کە ئایا بۆمان هەیە بێینە ژوورەوە. بەڵام لە هەمان ساتیشدا شپرزەین و دەترسین کە دەربکرێین. ئەم هەستە لە ئاستێکی بەرزدا لەو شەرمەزارییە بێدەنگە دەچێت کە من پێشوتر باسمکرد. تورکیا لە دەرگای ئەوروپای داوە، ئێمەش بەردەوام هەر چاوەڕوان دەکەین و ئەوروپاش هەر پەیمان دەدات و دواتریش لە بیری دەچێتەوە کە چی وتووە. لە هەمان کاتیشدا بەربەستەکان لە بەردەم تورکیادا زیاتر بەرزدەکرێنەوە لەگەڵ توندکردنی مەرجەکاندا بۆ بەئەندامبوونی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپادا، ئێمە بە داخین لەوەی کە دەبینین چۆن هەستی دژە تورك لە هەندێك بەشی ئەوروپادا بەهێز دەبێت، هیچ نەبێت لەناو دەستەیەك لە سیاسەتمەدارانی ئەوروپادا.

زۆر لە سیاسەتمەدارە ئەوروپییەکان بە جۆرە خوتبەدانێکەوە هێما بۆ تورکیا و تورکەکان دەکەن کە هێندەی ئەو دژایەتیکردنە ترسناکە کە لەلای هەندێك لە سیاسەتمەدارەکانی وڵاتی ئێمە هەیە. ئەوە جیایە کە تۆ ڕەخنە لە نوقسانی دیموکراتییەتی دەوڵەتی تورکیا بگریت یاخود هێما بۆ کێشە ئابوورییەکەی بکەیت، بەڵام ئەمە شتێکی هێجگار جیاوازترە کە تۆ کلتوری تورکی بە کەمبگریت یاخود زۆر جار هێما بۆ ئەو جالییە تورکەی ئەوروپا بکەیت کە هەڵگری کلتورێکی دواکەوتوون. کاتێك تورکەکانی ناو تورکیا دەبینن کە بە چ دڵڕەقییەکەوە هەڵدەسەنگێنرێن لەو کاتەدا ئەوەیان بیردەکەوێتەوە کە ئەوان هێشتا هەر لەبەردەم دەرگاکەدا وەستاون و لە دەرگا دەدەن و چاوەڕوانن بکرێنە ژوورەوە. بێگومان لێرەدا ئەوان هەست بە نەویستەیی خۆیان دەکەن. بەڵام گاڵتەجاڕی هەرە گەورەش لە بەرامبەر شەپۆلی ناشیۆنالیست و دژە تورك لە ئەوروپادا لەوەدایە، کە خراپترین ئاست و شێوازی ناسیۆنالیستی لە تورکیادا هێناوەتە گۆڕیٚ، کە بۆ خۆی ئەمەش بە شکستێکی گەورە دادەنرێت.

گرنگترین شتێك كە توركیا و خەڵكی تورك دەتوانن پێشكەشی ئەوروپای بكەن، بەبێ دوو دڵی ئاشتییە: تەمەنا دەكرێت كە ئەو ئارامی و هێزەی كە لە وڵاتێكی ئیسلامی وەك توركیادا هەیە لەگەڵ ئەوروپادا یەكبخرێت و ئەو نییەتی ئاشتیەشی لێقبوڵبكرێت. ئەو ڕۆماننوسانەی كە من لە منداڵی و گەنجێتیدا خوێندوومنەتەوە ئەوروپایان لە دەرەوەی بیروباوەرە مەسیحییەكەیەوە پێناساندووم، ئەو بیروباوەڕە ڕۆشنبیرییەی كە خاوەنێتی. ڕۆمانەكانی ئەوان بەو چەشنە قسەیان بۆ دڵی من دەكرد كە ژیانیان لە ڕێگەی ڕۆمانەكانیانەوە بەخشیوە بە ئەوروپا، ئەو پاڵەوانانەی كە تێكۆشاون تا خۆیان و داهێنانەكانی خۆیان رزگار بكەن و ئەو خەونانەی كە هەیانە بیهێننەدی.

ئەوروپا ڕێزی خۆی لەبەردەم وڵاتانی غەیرە ئەوروپیدا لەوەوە دەستكەوتووە كە پەروەردەكەری ئایدیاكانی: ئازادی و یەكسانی و برایەتییە. ئەگەر ڕۆحی ئەوروپا ڕۆحێكی ڕۆشنگەربێت بۆ یەكسانی و دیموكراتی، وە ئەگەر ئەم یەكگرتنە یەكگرتنێكی ئاشتیانەبێت، ئەوا توورركیاش جێگای تێدا دەبێتەوە. خۆ گەر ئەوروپا تەنها لە ڕێگەیەكی بەرتەنگی بیروباوەڕی مەسیحییەتەوە خۆی پێناسە بكات، ئەوا بە تەواوەتی وەك ئەو توركیایەی لێدێت كە هێزی خۆی تەنها لە ڕێگەی دیینەوە پیشاندەدات كە ئەمەش دەیباتەوە سەر هەمان جێگەی جاری جارانی و دوور لەم ئێستایەی كە هەیەتی دەیبەستێتەوە بە ڕابردووەوە.

بــۆ كـــەسێـــــكی وەك مـــــن كە پەروەردەی ڕۆژئاوایەكی خۆرهەڵاتیانەی ناو خێزانێكی سیكولاری ئەو بەشە ئەوروپییەی ئەستەمبوڵم، هیچ سەیر نییە كە باوەڕم بە یەكێتی ئەوروپا هەبێت. ملیۆنان تورك هەن وەك من وان، كە بەدڵ و بە گیان باوەڕیان بە یەكێتی ئەوروپا هەیە. بەڵام بەدەر لە زۆرینەی ئەم تێڕوانینانەش دەبینین زۆرینەی كۆنەپارێزەكانی ئێستاو موسڵمانە توركەكان، قەناعەتی سیاسیان بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەچێت كە ئەوانیش دەیانەوێت توركیا لەناو ئەوروپایەكی یەكگرتوودا ببینن كە ئێستا لە بەرنامەی داهاتووی ئەوروپادایە، هەروەها ئەوان یارمەتی هاتنەدی ئەم خەونەش دەدەن. ئەوەتانێ دوای سەدان ساڵ جەنگ و ململانێ ئێستا وا دەبینین كە هاوپشتییەك بۆ بڕواكردن بە یەكتری هاتۆتە پێشەوە.

بۆیە دەبێت ئەو هاوپشتییە بێ نرخ سەیر نەكەین تا نەبێتە دەركردنی توركیا لەناو ئەو یەكگرتنەدا بۆ ئەوەی دواتر پەشیمانی لە دوانەبێت. هەر لەبەر ئەمەشە كە من باوەڕی تەواوم بە توركیا نییە بە بێ ئەوروپا، وە باوەڕم بە ئەوروپاش نییە بەبێ توركیا.

## سەرچاوە:

ئورهان باموك لە 23ی ئۆكتۆبەری 2005دا خەڵاتی ئاشتی لە ئەڵمانیا وەرگرت، ئەم وتەیەش كە كورتكراوەیەكی وتەكەیەتی و وەرگێڕاوەتە سەر زمانی سویدی، لە بەشی كلتوری ڕۆژنامەی (داگزنیهێتەر) دا لە 29ی ئۆكتۆبەری 2005 دا بڵاوكراوەتەوە. ئەم وەرگێڕانە كوردییە هەموو ئەو بەشەیە كە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی سویدی. (هـ.ك)

# پێشبڕکێ

ناهیدی تەباتەبایی

لە فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد

مرد. لەو سەر پەنجەرەیەوە کەوتە خوارەوە و مرد. هەروا سووک و ئاسان. ئەمەش بەهۆی منەوە بوو. بەهۆی منەوە کە شووشەکانی چاویلکەکەیم چەسپاند بوو، بەهۆی منەوە بوو کە لەو سەر پەنجەرەیەوە کەوتە خوارەوە و مرد. زۆر دەمێك بوو دەهات و دەچوو و کەس هەستی بە بوونی نەدەکردو گوێی پێنەدەدا. بالاّ بەرز و ئێسقان پان بوو، قژێکی ماش و برنجی کورت و رەپی پێوە بوو، چاویلکەیەکی ئەستووری لەچاو دەکرد. تاقە هەستێکیش کە ئەگەر بیتوانیبایە لەلای مرۆڤ دروستی بکات بێ حەوسەڵەیی بوو، چونکە ئەوەندە بەو دەستە گەورانەی ئەو پارچە چڵکن و بواردووەی دەهێنا بە هەموو لایەك و بە هەموو شتێکدا بێتاقەت دەبووی. هەر بەو پارچە پەڕۆیەی کە چڵك خواردبووی مێزی پاك دەکردەوە، کتێبەکانی پاك دەکردەوە، هەروەها تەلەفۆن و رۆژژمێر و هەموو شوێنێك و هەموو شتێکی پاك دەکردەوە. هەندێجار بیرم دەکردەوە ئەگەر بێجوڵە دانیشم و نەبزوم ئەوە پەڕۆکە بەسەروچاوی منیشدا دەهێنێ. بێدەنگ دەهات و بێدەنگ دەچوو، هاتوچوونەکەشی شێوەیەکی خشکەیی هەبوو چونکە بەدەم ئەو هاتووچوونەشەوە هەر شوێنەکانی پاك دەکردەوە.

دوایی تێگەیشتم کە ئەم داماوە بەهۆی کزی چاوەکانییەوە تووشی ئەو واسواسییە بووە و دەترسێ خاك و خۆڵ بەسەر شوێنێکەوە بمێنێتەوەو ئەمیش بەو هۆیەوە کارەکەی لەدەست بدات.

* * * * * *

یەکەمین ڕۆژ کە هەستم بە بوونی کرد لە ئاکامی دەنگێکەوە بوو. بەستەزمانە شووشەبەندی دەرگای ژوورێکی نەدیبوو و یەکڕاست بەسەرەوە تێی چووبوو، ئەو رۆژە رۆژێکی شووم و ناخۆش بوو، بۆ منیش و بۆ ئەویش. ئەو رۆژە، لە هەمووان

زووتر گەیشتمە سەرکار، کە چوومە بەشەکەی خۆمان هێشتا چراکان دانەگیرسابوون. هەڵبەتە دەمتوانی بچمە سەروەختی سنووقی کارەباکە و پلاکەکان پێکەم، بەڵام تاقەتم نەبوو، بۆیە هەروا لە تاریکییەکەداو لەسەر یەکەمین کورسی رارەوەکە دانیشتم. کورسییەکە ساردبوو. جووڵەم نەکرد. پاش یەکدوو دەقەیەک تۆزێک خۆم لەسەر کورسییەکە خزان، سەرم نا بە پشتییەکەیەوەو قاچەکانم درێژکرد. یەکەمین کەسیش کە دەگەیشت بێگومان هەر جەنابی لەواسانی بوو. بەلای منیشەوە گرنگ نەبوو ئەگەر بەم شێوەیەش بمبینێ. چاوەکانم نووقاند و هەوڵمدا بیر لە هیچ نەکەمەوە. ماندوو بووم. رقم لە دائیرە بوو، لە هاوکارەکانم و لە مێزەکەشم کە شووشەکەی درزی بردبوو. لە سەرۆکەکەم و لە هەموو شتێکیش زیاتر رقم لە پەنجەرەی ژوورەکەم بوو کە رووەو پەنجەرەکانی تر دەکرایەوە. ئەو پەنجەرانەی کە لەودیو هەریەکێکیانەوە فەرمانبەرێك هەبوو رقی لە شوێنی کارەکەی و لە هاوکارەکانی و لە سەرۆکەکەی بوو، لەوانەش زیاتر رقی لە پەنجەرەی ژوورەکەی بوو کە رووەو پەنجەرەکانی تر دەکرایەوە، کە لە پشت هەریەک لەوانیش...، دانیشتم و چاوەکانم نووقاند و هەوڵمدا بیر لە هیچ نەکەمەوە، بەڵام وەکو هەمیشە یەکەمین شتێك کە بە بیرمدا هات ئەمە بوو کە من چەندە تەمبەڵم و چەندەش باش دەبێ کە ئەگەر وەکو ئەو کاتانەی ئاوا بێتاقەت نەبووم، دووبارە شتێ بنووسم و بۆ هاورێکانمی بخوێنمەوە، ئەوانیش یان بڵێن باشە، یان نا.

تاقەتم لەم بیرۆکەیەش چوو، چاوەکانم کردەوەو لە بەردە مەرمەڕەکانی زەوییەکە وردبوومەوە. رەش و خۆڵەمێشی بوون، نیگام کەوتە سەر پێیەکانم. پێڵاوەکانم رەش بوون، گۆرەوییەکانیشم خۆڵەمێشی. ویستم پێیەکانم بجوڵێنم نەمتوانی، پێیەکانم خەوتبوون. ببوون بە بەرد. بەردگەلێك کە درێژەی بەردە مەرمەڕەکانی ڕاڕەوەکە بوون. هێشتا سەیری پێیەکانمم دەکرد کە رۆشناییەکی شیریی رەنگ هەموو لایەکی رووناك کردەوە. ڕووناکییەکی بێ چاو و ڕوو سەرسووڕهێنەر، جەنابی لەواسانی هاتبوو و چراکانی داگیرساندبوو. هەوڵێکی ترم دایەوە و لە جێی خۆم هەستام. ژێر پێیەکانم سوڕ ئاژن دەبوو. رۆژ دووبارە دەستی پێکردبووەوە.

هەر ئەو رۆژەش بوو کە بۆ یەکەمین جار هەستم بە بوونی کرد. قەڵەمێك و چەند لاپەڕەیەکی سپی لەسەر مێزەکەی بەردەممدا بوو. منیش لە درزەکانی نێوان پەڕە پەڕەی پەردە پلیسێکەوە سەیری پەنجەرەکانی بەرامبەرمم دەکرد کە لە پڕێکدا دەنگێك هات. ترسام و بەرەو دەنگەکە وەرگەڕام. کلۆڵە دەرگا شووشەییەکەی ژوورەکەی نەدیبوو. سەری دای بە شووشەکەدا و چاویلکەکەی پارچە پارچە بوو. لە ڕاڕەوەکەدا دەنگی پێکەنینێکی زیق و ژنانە بەرەو بنمیچەکە لوولی خوارد. بەرەو لای چووم. ئەی خۆزگە هەر نەچوومایە. لەسەر زەوییەکە دانیشتبوو و دەستی بۆ پارچەکانی چاویلکەکەی دەگێڕا. سەیری چاوەکانیم کرد لێڵ بوون. دەتووت پەردەیەکی تەنك بەسەر گلێنەی چاوەکانیدا دراوە. پارچەکانی چاویلکەکەیم هەڵگرت و دامنەدەستی. نەمدەزانی ئیتر ئێشی ناوچەوانی زیاترە یان خەمی شکانی چاویلکەکەی، هەواڵی حاڵ و وەزعیم پرسی، شتێکی وت کە تێنەگەیشتم. فارسی نەدەزانی.

سەرێکی لەقاند کە یانی باشە. ئیتر هەر بەو جۆرەی کــە لەســـەر زەوی دانیشــتبوو هەوڵیــدا پارچــە شووشەکانی چاویلکەکە بخاتەوە پاڵ یەکتر. داماوە بەبێ چاویلکە هیچ کوێیەکی نەدەدی. کە تیرەکەم لەسەر مێزەکە هەڵگرت و بەرەو لای ڕۆشتم پارچە شووشــەکانی چــاویلکەکەم پێکــەوە لکانــد و دامــە دەســتی. چــاویلکەکەی کــردەوە چــاوی، هــیچ نــەبێ ئێســتا لــە نێــوان درزەکــان و دڵۆپــەی کەتیرەکــەوە بەرپێی خۆی دەبینێ.

یــەکێك لــە هاوکارەکــان، ئــەوی کــە پێکــەنیبوو، دەستپێشـــکەری کـــرد و پـــارەی لـــە هـــەمووان کۆکردەوەو پێیدا. سێ ڕۆژ دواتر چاویلکە تازەکەی لــە چــاو کردبــوو. بــە لاســتیکێکی ئەســتووریش بەستبووی بە پشتی سەرییەوە. لەو ڕۆژە بەدواوە ئــیتر بــە بینــینی بێتاقــەت نــەدەبووم. دڵــم بــۆی دەسووتا چونکە زۆری کار دەکرد. ڕۆژی دووجار مێزەکــەی دەســڕی، ڕۆژی ســێ جــار ســەتڵی ژێــر مێزەکــەی بــەتاڵ دەکــرد و ڕۆژی هــەزار جــار هــەموو شـــوێنەکانی گســـك دەدا. یەکـــدوو جـــار ویســـتم تێیبگــەێنم کــە ئــەم هــەموو ئیشــکردن و ســڕینەی دەیکــات بــە هــیچ[1] کوێیـــەکی ناگەیـــەنێ بـــەلاَم نەیدەزانی چی دەڵێم. بە یەکێ لەو هاوکارانەم وت کــە زمــانی ئــەوی دەزانــی قســەکانمی بــۆ تەرجەمــە کــرد. لــە وەلاَمــدا پێکــەنی و وتــی ئەگــەر یــەك تــۆز خاكو خۆڵ لە شوێنێکدا بمێنێ، ئەو کارەکەی لە دەست دەدات.

ســادە بــوو، ســادە و پــاك و بــێ ئــازار. بێدەنگ دەهات و دەچوو، بزەی دەهاتێ و هــەموو شــوێنێکی پاك دەکردەوە، هەستم دەکرد کە مێشك و زەینیشــی هــەروا لاپەڕەیــەکی پــاکو بێگــەردە، پــاکی پــاك. هــەر نەتدەوت کە چل ساڵ ژیاوە. نەتدەوت ژنێك و چوار منالّی هەیە. نەشتدەوت کە قەت خراپەی کردبێ یان خراپەی دیبێ.

* * * * * *

دەدوانـــزە ڕۆژ دوای ئـــەو ڕووداوە هـــات و شتێکی لێم پرسی تێنەدەگەیشتم چی دەڵێ. لــەناو قســەکانیدا تــەنیا لــە وشــەی چاویلکە تێدەگەیشتم. پــاش چــەندێك پرســین و بــە ئیشــارەت قســە کــردن تێگەیشتم ئەوە دەپرسێ کە ئاخۆ ئەو ڕۆژە من بووم شووشــەکانی چــاویلکەکەیم بــۆ چەســپاندووەتەوە؟ پێکــەنیم و وتم بــەڵێ مــن بــووم. پێکــەنی و ڕۆشــت، ئــەك خۆزگــە قــەت ئــەوەم نەکردبایــە، تــۆزە تــۆزە لەگەڵمــدا میهرەبــان بــوو. هەڵســوکەوتی لەگەڵمــدا هەڵســـوکەوتێکی بەرامبەرانـــە بـــوو، منـــیش ئـــەم حاڵەتــەم پێخــۆش بــوو. چــەند ڕۆژێــك دواتــر کــە کیســەیەکی بچــوکی گــوێزی بــۆ هێنــام و لــە پــەنای ڕۆژژمێــری ســەرمێزەکەوە دایـنــا، ئــەو گوێزانــەش خۆشــترین و بــەتامترین گوێزێــك بوون کــە تــا ئێســتا خواردوومــە، ئــیتر دڵــم بــۆی نەدەســووتا. لەگەڵیــدا هەستم بە هاودەردی دەکرد. ئەی ئەوە نییــە منــیش وەکــو ئــەو لــە بەیانییــەوە تــا ئێــوارە لەگــەڵ نــووکی قەڵەمەکەمــدا بەســەر دۆســییە و لیســت و نامەکانــدا دەخشێم؟

ورده ورده خۆشمدەویســت. بــوونی ســادە و ساکاری و پاکێتی مێشك و زەینی بەشێوەیەکی زۆر سەیر پێچەوانەی داروباری نــاو فــەرمانگا بــوو، ئــەو لەگــەڵ هەمووانــدا جیــاواز بــوو. نــەوەکو جــەنابی ســــــەرۆك خــــــۆی دەگــــــرت[2]، نــــــەوەکو خانمــە ســـکرتێرەکەش زۆر بڵــێ بــوو. نــەوەکو خەڵکی تریش کاری بەسەر کەسەوە بوو. بووین بە

هاوڕێ و بە زمانێك كە لە خۆمانەوە دروستمان كردبوو دەستمان بە قسەكردن كرد. تێگەیشتم چەند منالّی هەیە، منالّەكانی لە پۆلی چەندن، لەوەش گەیشتم كە ژنەكەی پشت ئێشەی هەیە. ئەویش ئەوەی زانی كە من دوو منالّم هەیە و مێردەكەم لە كوێ كار دەكات و چەندە مووچە وەردەگرێ. زۆر بە سادەیی پرسیاری دەكرد و بەسادەییش لەو شتانە دەگەیشت كە خانمە سكرتێرەكە لە پاش سالآنێك و زۆر بە دەردەسەریو كونجكۆلّی لێی دەگەیشت.

* * * * * *

ڕۆژێك داوام لێكرد كە ئیتر مێزەكەی من پاك نەكاتەوە، ئەویش لە وەلآمدا وتی كە ئێمە خوشكو براین. هەلّبەتە من ئێستاو ئێستاش تێنەگەیشتووم كە لە پشت ئەم وەلآمەوە چ مەنتق و لۆجیكێكی هەبوو. هەندێجار مێشك و زەینی لەوە سادەتر و پاكتر بوو كە لە مەنتق و لۆجیكەكەی بگەم.

بە بوونی ئەوەوە جێی ئیشەكەمم بەلاوە خۆشتر دەبوو. میهرەبان بوو و حزوریشی هەمیشە زەینمی تازە دەكردەوە، وەكو منالّێكی گەورە وابوو كە دەورو خولی دەدام، هەر جارەش كە شتێكی دەوت بەلای منەوە زۆر تازە و تاسووق بوو و شەوقێكی تری پێدەبەخشیم. هەر ڕۆژەی شتێكی بۆ دەهێنام. ڕۆژێكیان چەند چلّە یاسێك، ڕۆژێكی تر بەهێیەكی گەورە و ڕۆژێك چەند دانە سێوی سووری بچووك، منیش حەزمدەكرد شتێكی بۆ بكەم بەلآم نەمدەزانی چی بۆ بكەم. دەترسام پارەی پێبدەم چونكە نەمدەزانی ئەم كارەی من لای ئەو چۆن دەكەوێتەوە، نەمدەویست بیڕەنجێنم. ئەی خۆزگە ڕەنجاندبام. جارێك كچەكەمم لەگەلّ خۆمدا بردە دائیرە. بە بینینی كچەكەم ئەوەندە خۆشحالّ بوو دەتووت خۆشەویستێكی زۆر عەزیزی دیووە. بەرزی كردەوە و خولاندییەوە، ئینجا دانیایەوە، دوایش دەستی بە گیرفانیدا كرد و پاشان تومەنییەكی دەرهێناو پێیدا. من بەسەرسامییەوە سەیرمكرد بەلآم ئەو وتی: "ئاخر چونكە كچی چاكە".

* * * * * *

چەند ڕۆژێك دواتر دیسانەوە لە پشتی مێزەكەم دانیشتبووم و لەو كاغەزە سپیانە ورد دەبوومەوە كە هەستم كرد دلّم زۆر گیراوە. سەیرم لێهات، ئەم دلّتەنگییەم لە كوێوە هاتبوو. سەرم هەلّبڕی و ڕوانیمە پەنجەرەكانی بەرامبەر و ویستم بە بیر خۆمی بهێنمەوە كە چ شتێكم بە مێشكدا هاتووە و بیرم لە چی كردوەتەوە، دوایی بیرم كەوتەوە كە ئەو نەهاتبوو و منیش لە بەیانییەوە لەگەلّ كەسدا نەدوابووم. قەلّەمەكەم هەلّگرت و ئەی سەد شەلّلا دەستم بشكایە، نووسیم: "زۆر دەمێك بوو دەهات و دەچوو و كەس هەستی بە بوونی نەدەكرد و گوێی پێنەدەدا. بالاّ بەرز و ئێسقان پان..." ڕستەكان بە دوای یەكدا دەهاتن. هەموو شتێكم دەربارەی نووسی، سەبارەت بە ڕەفتاری، بە مێشك و زەینی پاكی، دەربارەی میهرەبانییەكانیشی نووسیم و ئاسوودە بووم، ئیتر گرێكەم كرابووەوە.

سبەی بەیانییەكەی كە چوومە ژوورەكەم خەریكبوو مێزەكەی پاك دەكردەوە. خۆشحالّ

بوومو پێم وت كە دوێنێ چەند جێگای دیار بووە، كاتێكیش لە ژوورەكە چووە دەرەوە كاغەزەكانم دەرهێناو دووبارە خوێندمنەوە. كەسایەتی ئەو دەیتوانی زۆر بە ئاسانی باری چیرۆكێك لە كۆڵ بگرێ. دەبوایە رووداوێكم بۆ دروست كردبا وەكو، بۆ نمونە رووداونی دزییەك لە دائیرەكەدا و گومان كردن لەو، ئینجا بەرگریكردنی من لە بێتاوانی ئەو، بەڵام نا ئەمە شتێكی زۆر ناماقوڵ دەبوو، حەزم لێینەبوو. دەبوایە سەبارەت بە پەیوەندی خۆم لەگەڵیدا شتێك بڵێم، پەیوەندی ژنێكی فەرمانبەر بە خزمەتگوزارێكی دائیرەكەوە. پەیوەندییەك رەنگە بكرێ پێی بوترێ دایكانە كە پەیوەندی ئەو دووانەش پەیوەندییەكی ... نا، ئەمەشیان هەر لە دڵ نەدەنیشت، تا لە پرێكدا بیرم بۆ میهرەبانییەكانی چوو، بۆ ئەوەی كە هەر رۆژە و شتێكی دەهێناو منیش هەموو كاتێك دەمویست قەرەبووی بۆ بكەمەوە. ئەو گوڵی حوسنی یوسفی بە گڵێنەكەیەوە بۆ دەهێنام و منیش كۆپوونی بەشە شەكرەكەی خۆمم پێدەدا. ئەو لەلادێوە گەڵامێوی بۆ دەهێنام و من پارەم بەو دەدا. ئەو شتێكی دەكرد و من شتێكی تر. ئیتر ئەم خۆشەویستییە دەیتوانی ببێتە كێبەركێیەك و هەموو بیرو هۆشی ئێمەش ئەوە بێ كە باشتر یەكتر بەسەر بكەینەوە تاوەكو شتێك روویدەدا و ئیتر.. زۆریش باش بوو چونكە بەراستی نەمدەتوانی لەوە زیاتر بەردەوام بم. دووبارە دەستم بە نووسین كردەوە و رۆژانەش ئەوی روویدەدا لە نووسینەكەمدا جێم دەكردەوە. ئیتر دەتووت واقیع و راستیش لەگەڵ چیرۆكەكەی مندا پێشبڕكێی دەكردو هەر رۆژەی شتێكی دەخستە بەردەستم تا پێش بەویتر بگرێ. دەمنووسی تا بزانم بە كوێ دەگەم چونكە دەمزانی دوایی دەتوانم هەرچییەكم بوێ لێی لادەبەم.

رۆژێكیان داماوەكە خەریكبوو ژوورەكەی گسك دەدا پشتی راست كردەوەو وتی: "ئەم ئیشە، ئیشی ژنە، نە پیاو.." چونكە هەمیشە گسكی بە دەست ژنانەوە دیتبوو. بیرم كردەوە ئەگەر بێتو بە گسكی كارەبایی گسك بدات چەندە خۆشحاڵ دەبێ. دەمزانی گسكێكی كارەباییان بۆ كتێبخانە كڕیوە، چووم بۆ كتێبخانەكەو گسكە كارەباییەكەم بە ئەمانەت لێوەرگرتن و بۆم هێنا. بەستەزمانە بە بینینی گسكە كارەباییەكە داچڵەكی. شێوەی بەكارهێنانەكەیم فێركرد. پێكەنی و دووبارە تێكڕای ژوورەكەی گسك دایەوە. كە كارەكەشی تەواو بوو زۆر سەرو دڵخۆش بوو. هەڵبەتە ئەو رووداوەشم هەر لە چیرۆكەكەمدا نووسی. رۆژی دوایی چەپكێ گوڵی كێوی بۆ هێنام و وتی كە گوایە هی باخچەی ماڵەكەی خۆیانە. ماڵیان لە جادەی وەرامین بوو. گوڵەكانم خستە پەرداخەوە. گوڵەكان زەردی زەرد و سووری سوور و وەنەوشەیی وەنەوشەیی بوون. ڕێك سێ رۆژ دوای ئەوە بوو من خەریكبووم كارم دەكرد كە هات و پەنجەی پیشاندام. پەنجەی بڕابوو و بە تیپ پێچابووی، لێی توورەبووم، ئینجا لەزگەیەكی برینم بۆ تێوە پێچا، پێكەنینێكیش گرتبوومی چونكە دەمزانی كە بەیانی شتێكم بۆ دەهێنێ.

چیرۆكەكەم نیوە ناچڵ مابووەوە. دەبوایە دووبارە بمنووسیبایەتەوەو مەسەلەی پەیوەندی خۆم و ئەو بەشێوەی پێشبڕكێیەك بۆ نواندنی خۆشەویستی بەرجەستە بكەم. هەڵبەتە چیرۆكێكی شیرین و پێكەنیناوی دەبوو. خۆ بووش، پێشبڕكێ، سەر ئێشە و ماندوێتی، پێشبڕكێكە دەیتوانی وردە

ورده ببێتە جۆرێك لە تۆڵەسەندن، ئەی مەگەر وانییە کە هەندێجار مرۆڤ لە خۆشەویستی و دڵسۆزی بێئەندازە لەگەڵیدا بێتاقەت و ماندوو دەبێ، چونکە ناتوانێ قەرەبووی بکاتەوە؟

ئیتر تۆزە تۆزە هەوڵی ئەوەمان دەدا کە هەر یەکەمان جۆرە دڵسۆزی و خۆشەویستییەك بنوێنێ کە بەرامبەرەکەی دەرەقەتی پڕکردنەوەی نەیەت و دەستەپاچە بێت.

کاری چیرۆکەکە بە باشی دەچووە پێش. هەر کاتێك ژنەکە خەمبار بوایە پیاوەکە دەیهێنایە پێکەنین. هەر کاتێك پیاوەکە بیویستایە لەگەڵ براکەیدا کە لە شارەدێدا دەژیا بە تەلەفۆن قسە بکات، ژنەکە بێدەنگ ژمارەکەی بۆ وەردەگرت. ئینجا ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو کە چیرۆکەکە بگاتە دوا پلە و تەواو بێت. بۆ ئەم کارەش پێویستم بە خۆشەویستی یان گیان بەخشینێك بوو. گیان بەخشینی لایەکیان کە من تیا مابووم چیبکەم.

* * * * * *

دوو سێ ڕۆژ دواتر گوڵدانێکی گڵینی بۆ هێنام کە چەند چڵێك گوڵی حوسنی یوسفی تیا بوو. پەڕەی گوڵەکان جەرگیی و لێوارەکانیان زەردێکی زۆر جوان بوو. هەر کە دیم ئەبڵەق بووم و خەریکبوو شاخم لێ بڕوێ چونکە لە چیرۆکەکەشمدا هەمان گوڵدانی بۆ هێنابووم. ماوەیەك هەروا بیرم لێکردەوە پاشان خۆم دایە دەست ئەو بۆچوونە کە گوایە ئەمە هەر ڕێکەوتێك بووە. ئەی ئەمە نییە زۆربەی کارەکانیم بە هەمان شێوە دەهێنایە ناو چیرۆکەکەمەوە؟ کەواتە لێکچوونی کارەکانی پیاوی ناو چیرۆکەکە و کارەکانی ئەو ئەوەندە ئەستەم نەبوو. دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە هەروا دانیشتبووم و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد کە هاتە ژوورەوە. هەر کە منیشی دی وا ئەبڵەقانە دەڕوانمە پەنجەرەکە، ئەویش ڕوویکردە ئەو لایەو وتی: "پەنجەرەکە زۆر پیسە". لە خۆوە دڵم داخورپا. نەکا بییەوێ پەنجەرەکە پاك بکاتەوە و لەو سەرەوەو لە نهۆمی حەوتەمەوە بکەوێتە خوارەوە، تەنیا لەبەرئەوەی پەنجەرەکە پیس بووە. پێم وت: "پەنجەرەکە زۆریش پاکە و من هیچ ئارەزووی بینینی ئەودیوی شووشەکانم نییە و ئێرەش نهۆمی حەوتەمە.."

ئینجا بەڵێنم لێوەرگرت کە پەنجەرەکە پاك نەکاتەوە. لە هەمان کاتدا پێم وابوو کە کۆتاییەکم بۆ چیرۆکەکەم دەستەبەر کردووە. ژنەکە دەڵێ پەنجەرەکە پیسە، پیاوەکە دەیەوێ پەنجەرەکە پاك بکاتەوە و لەو سەرەوە دەکەوێتە خوارەوە. ئیتر ئەمە دەبێتە خۆشەویستییەك کە قەرەبوو ناکرێتەوە. تا عەسر چیرۆکەکەم تەواو کرد و سەرو دڵخۆش گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. لە ماڵیشەوە چیرۆکەکەم بۆ مێردەکەم خوێندەوە، ئەویش خۆشحاڵ بوو لەوەی کە ئاخرییەکەی دوای ماوەیەك شتێکم نووسی. ئەو شەوەش هەر وەکو شەوانی تر ڕێك لە سەعاتی یانزەدا چوومە ناو جێوە. وەکو هەموو شەوێکیش زوو خەوم لێکەوت بەڵام تا بەیانی خەوم دەدی کە ئەو لە پەنجەرەکەوە هەڵدەدرێتە دەرەوەو دەکەوێ و هەر دەکەوێ و ناگاتە سەر زەوی. بەیانی بەدەم سەر ئێشەوە خەبەرم بووەوە، هێشتا دڵەڕاوکەم هەبوو، لەسەر ڕێمدا بەرەو دائیرە چیرۆکەکەم لە جانتاکەم

دەرهێنـا، دڕانـدم و خسـتمە جۆگەلـەی ئاوەکـەوە. هەرکــە گەیشــتمە شــوێنی کارەکــەم و دەرگــای ژوورەکـەمم کـردەوە سـەیرمکرد وا لەسـەر لێـواری پەنجەرەکەدا دانیشتووەو خەریکە شووشەکان پاك دەکاتـەوە. جانتا لـە دەستم داکـەوت و بـۆ یەکـەمین جار بەسەریدا قیژاندم و هاوارم لێکرد کە دەبێ هـەر ئێسـتا بێتـە خـوارەوە. بـەڵام ئـەو پێکـەنی و وتـی: "ژن، هەمیشــە دەترســێ". ئینجــا چوارچــێوەی پەنجەرەکــەی بــەردا و دەســتەکانی راوەشــاند بــۆ ئەوەی بە منی بسەلمێنێ کە چەندە ئازاو لێهاتووە. دامــاوە هێشــتا فریــای ئــەوە نەکــەوتبوو دووبــارە ســەیرێکی مـن بکاتـەوە کـە لـە پەنجەرەکـەوە کەوتـە خوارەوە. مـرد. لـەو سـەر پەنجەرەیـەوە کـەوت و مـرد. هەروا سادەو ئاسان. کە ئەوەش هەر لەبەر مـن بوو. لەبـەر مـن کـە تـەنیا شووشـەکانی چاویلکەکەیم بـۆ چەســپاندبوو. هــەر لەبــەر منــیش بــوو کــە لــە پەنجەرەکەوە کەوتە خوارەوەو مرد.

* * * * * *

## پەراوێزەکان:

1-واتە دادێکی نادات

2-خۆ گرتن: بە مانای خۆ بە زل زانین.

## سەرچاوە:

لە کۆمەڵە چیرۆکی (حضور ابی مینا)وە وەرگیراوە.

# گوڵێکی زەرد

خۆلیۆ کۆرتازار
لە عەرەبییەوە: سابیر شاکر مەلوول

پێموایە دەستەواژەی –ئێمە نەمرین – گاڵتەو جەفەنگێکە بەلاّم من فانییەك دەناسم بەڵێ گیای مردنێك کە لە مەیخانەیەك لە مەیخانەکانی شەقامی کامبرون حیکایەتی خۆی بۆ گێڕامەوە و شتێکی وای گوت، سەرخۆش بوو لەبەر هەندێ ڕاستی دەگوت گەرچی مەیخانەچی و مشتەرییە کۆنەکان تا ئەو وای دەگوت قاقایەکی بەرزیان لێدەدا و ئەوەندە پێی پێکەنین خوڕان خوڕان مەی لە چاویان دەهاتە خوار، بە گوێرەی خۆشم هەر دەبێ نیشانەی حەپەسان و واقوڕمانێك لەسەر سیمام نەخش بووبێ چونکە شێلگیرانە گەمارۆی دام و تەنگی پێهەڵچنیم و لە کۆڵم نەدەبوەوە تا دواتر دوو بە دوور لە خەڵکی لە گۆشەیەکدا لە دەوری مێزێك دانیشتین تا بتوانین بە دڵی خۆمان مەی بنۆشین و هێدی هێدی و ئارام ئارام بدوێین و سەری قسە دامەزرێنین.

بۆی گێڕامەوە: جاران لە شارەوانی کاری دەکرد و ئێستا خانەنشینەو ژنەکەی ماوەیەکە گەڕاوەتەوە ماڵە باوان، یانی لای دایە و باوە و بەجۆرێك لە جۆرەکان هاتوەتە سەر ئەو ڕایە کە ژنێژگە تۆراوەو دەستی لەم هەڵگرتووە!.. لەو جۆرە مرۆڤانەبوو کە نەپیر دەبن نە شێت و نە گێل. ڕوخسارێکی وشك و زبری هەبوو هەروەتر جووتێك چاو کە دەتگوت چاوی دەردەدارێکە تووشی نەخۆشی سیل بووبێ.. بۆ بیرچوونەوەو فەرامۆشی دەیخواردەوە، دوای پێنج پێك وای وت. هەستم بەو بۆنە نەکرد کە پاریسی پێ بەناوبانگە، لەوە دەچێ ئێمە هەر بۆنی بێگانەو غەوارە بکەین، نینۆکەکانی ساغ و پتەوبوون و قژی خاوێن..

–بۆی گێڕامەوە لە پاسێك لە پاسەکانی هێڵی ژمارە (95)دا کوڕێژگەیەکی تەمەن سیازدە ساڵانی بینیوە، لە یەکەم نیگادا بۆی دەرکەوتوە کە مێرد منداڵەکە کوتومت لەو دەچێ، یان لانیکەم لەو شێوەیە دەچێ کە ئەم دەربارەی خۆی لەو تەمەنەدا دێتەوە یادی. وردە وردە بڕوای بەخۆی هێنا کە ئەو بە تەواوی لەم دەچێت، ڕوخسار و دەست و

پەنجەکانی، تاڵە مووەکانی سەر هەنیە و ناوچاوانی، چاوە قووڵەکانی و هەروەتر شەرمەکەشی لەو دەچێ، شەرمێك لە ئاپ و ئاشکرا بە خۆشاردنەوەیدا لەودیو گۆڤارێکی مێژووییەوە دەردەکەوت، تەنانەت شێوەی هەڵدانەوەی قژەکەی بۆ دواوە و خاوو خلیچکییە نەزۆك و بێ کەڵکەکەی بە کورتی ئەوەندە لەم دەچوو پێکەنین گرتی.. بەڵام کاتێ لاوەکە لە شەقامی ڕێنەنس دابەزی، ئەویش بە دوایدا هاتە خوارێ و هاوڕێیەکی لە مۆنتبارناس لە چاوەڕوانیدا هێشتەوە، لە هۆیەك گەڕا کە کوڕەکە بدوێنێ و ناوی شەقامێکی لێپرسی و بەبێ هیچ گومانێك دەنگێکی بیست، دەنگی منداڵیی خۆی. مێرد مناڵەکە بەرەو ئەو شەقامە دەرۆیشت ماوەیەك بەشەرمەوە بەیەکەوە ڕێیان کرد، لەم ماوەیەدا جۆرێك لە ئیلهامی بۆهات، شتێکی ناڕوون، درەوشانەوەیەکی ڕاڤە هەڵنەگر، گەمژەوکەرە گەر ڕۆژێك هەوڵبدا راڤەی بکات و سەری خۆی پێوە بیەشێنێ وەك ئێستا دەیکات پوختەی مەبەست ئامادە و ساز لەخۆی نووساو کەڵکەڵەی ئەوە کەوتە سەری ماڵی کوڕە بزانێ، ڕابردووی کۆنی وەك چاوساغێکی گەشتیاری دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخساند بەرەو ئەم قەلاَ قایمە یانی گەڕەکی فەرەنسی یان ڕێگەیەك بۆ خۆی بکاتەوە. ماڵێکی بینی تۆزێك شپرێو و هەژار، دایکێکی پیر، مامەیەکی تەقاویت و دوو پشیلە، دواتر بێ هیچ باجێك، سووك و ئاسان گوتی، برایەکی لە مێژە کوڕە چواردەساڵانەکەی بەم سپاردووە و هەردوو کوڕێژگەکە بوونە هاوڕێ و هۆگرییان بەیەکەوە گرت. ئەم و برازاکەی هەموو هەفتەیەك سەردانی ماڵی "لۆك" یان دەکرد، باسی جەنگیان کرد، باسی سەردەمی داگیرکاری، هەروەتر دەربارەی لۆك دوان. ئەوجار ئەو شتەی کە وەك جۆرێك لە ئیلهام دەرکەوت، شێوەیەکی ئەندازەیی وەرگرت یانی ئەو بارە نەگۆڕەی کە خەڵکی پێیانخۆشە ناوی لێبنێن قەدەر، قەدەرێك کە دەکرا بە قسە و باسی ڕۆژانە جوان و پوختە تەکووزی بدرێتێ. لۆك جارێکی تر بووە ئەو و نەمرییەك لە ئارادا نەما یانی نەك هەر تاقە نەمرییەك، ئێمە هەموو نەمر بووین.

—ئێمە نەمرین، تۆ بڕوانە پیرەمێرد، هیچ کەسێك نەیتوانی لەگەڵ مندا بەراوردی بکات، منێك کە نەوەت و پێنج ساڵ تەمەنمە، هەڵەیەکی بچکۆلە بوو لە چەرخ و ئامێرەکەدا لە خولێکی ڕۆژگاردا، لۆك دەبایە دوای مردنی من بێتە دنیاوە — لە بەرامبەریشدا بەبێ ئەوەی ئەو ڕێکەوتە ئەفسانەییە بگێڕمەوە کە لە پاسەکەدا ئەوم بینی، وا بزانم باسی ئەوەشم کرد — جۆرێك بوو لە ئەمان و دڵنیایی بەبێ هیچ وشەیەك ئەمە بوو کە ڕوویداو بڕایەوە. بەڵام دوای ئەوە گومانەکان دەستیان پێکرد و کەوتنە کنە، لە باری وادا مرۆڤ عەقڵی لە دەستدەدا و دەبێ دەرمانە ئارامبەخشەکان بخوات، ئاخر لە تەك ئەم گومانانەدا دەبوایە بیسەلمێنم کە من لە هەڵەدا نەبووم و لە هەڵەدانیم و هۆیەك نیە بۆ دڵ لە دڵ دانەکان. کەچی ئەم گەمژانە قەشمەریم پێدەکەن، کاتێك قسە دەکەم بە قاقا شین و مۆر دەبنەوە کاتێك باسی ئەوەیان بۆ دەکەم کە بەسەرمدا هات و ڕوویدا.

لۆك جارێکی تر نەبووە من نەخێر، ئەم بەدبەختە نەیدەتوانی ببێتە من، ئەم کلۆڵەی کە حەزم نەدەکرد وازی و گەمان بکات نەوەك بەربێتەوەو قاچی یان ملی بشکێ — ئەم هەستانەی مچوڕکە بە لەشدادێنن — ئەم شەرمنەی کاتێك پرسیاری شتێکم لێدەکرد تا بنانگوێی سوور هەڵدەگەڕا. وای خوایە چەندە نەدوان و شەرمن بوو، بە پێچەوانە دایکی حیکایەتخۆش بوو، زۆری حەز

له قسان دەکرد هەموو شتێکی دەگێڕایەوە. له کاتێکدا کورێژگە له شەرماندا دەمرد، دایکی حیکایەتی چزەی هەوەڵین ددانی لۆکی گێڕایەوە، وێنەکانی له تەمەنی هەشت ساڵیدا، نەخۆشییەکانی.. خانمی میهرەبان گومانی له هیچ نەدەکرد ئاخر لەگەڵ مامەدا شەترەنجم دەکرد، ببوومە یەکێك له خێزان و بنەماڵە جارناجارێکیش بۆ خەرجیی مانگانە هەندێك پارەم دەدانێ..

زانین و پەیبردن بەرابردووی لۆك زۆر نەکەوت له سەرم، ئەمەندەم بەس بوو له نێوان ئەو قسانەدا که پیرێژنەکان حەزی پێدەکەن، رۆماتیزمی مامە، نەفرەتەکانی دەرگاوان، سیاسەتدا – چەند پرسیارێك بکەم، ئا بەمجۆرە له نێوان کش مەلیك و نارەزامەندی له نرخی گۆشتدا رابردووی لۆکم دەناسی و بەمجۆرە راستییەکان تێکیان دەکردەوە! بەلأم له کاتێکدا که ڕاماندەسپارد سەرو بادەی ترمان بۆ بێنن تێیگەیاندم و ڕوونی کردەوە: لۆك من بوو کاتێك که منداڵ بووم، بەلأم حەیف که ناتوانی وێنای له یەکچوونەکان بکەیت، تاڕادەیەکی زۆر شێوەی یەکمان دەدایەوە، کوتومت له گەوهەر و سروشت و شێوەدا لەیەك دەچووین، تێدەگەی! ئەتوانم بڵێم: له حەوت ساڵیدا گەمانەو وازیچەکەی خۆم شکاند و لۆکیش ملی گەمانەکەی خۆی، له نۆ ساڵیدا هەردووکمان سورێژە و سوورەتامان گرت، هەروەها حیکایەتێکی دێرینیش هەیە بابمێنێ بۆ دوایی. بە گوێرەی من سورینجەکە پانزە رۆژی کێشا و هەرچی لۆکیشە چوار رۆژ پێوە بوو و بەریدا، ئەمەش بەڕەچاوکردنی جیاوازیی جۆری سورێژەکە و پێشکەوتنی دەرمانسازی، جیاوازییەکی بەرچاو نیە و هەر یەکە!

با نمونەیەکی ترت بۆ بێنمەوە، ڕەنگە ڕوویدا نانەواکەی ئەوسەر کۆڵان له ناپلیۆن بچێ، ڕەنگیشە بەخۆی نەزانێ چونکە ناتوانێ له پاسێکدا حەقیقەتی دەستکەوێ بەلأم ئەگەر بەڕێگەیەك له ڕێگاکان وریای حەقیقەت بێ دەتوانێ تێبگا که دووبارە بوونەوە شیاوە و ئەو دووبارە بوونەوەیە که بۆ وێنەی ناپلیۆن و ئەو بە گۆڕانکارییەکی زۆردا تێپەڕیوە: له قاپشۆرەوە تا خاوەنی نانەواخانە و فڕن تێدەگا خۆی هەمان ئەو وێنەیەیە که له کۆرسیکاوە بازدەدا و دەفڕێ بۆ سەر تەخت و عەرشی فەرەنسا. ئەگەر بە وردبینییەوە له مێژوو بکۆڵێتەوە ئەو چرکە ساتانە دەدۆزێتەوە که تیاندا شالأوی بردەسەر میسر، ئەمجار گەیشتە ئۆستەرلیتز و کاتێکیش که چەند ساڵێك له دوکانەکەیدا دەمێنێتەوە دوای ئەوە سەرەنجام له سانتاهێلینا کۆتایی دێ یان له باشترین حاڵدا له شووقەیەکدا له قات و نهۆمی شەش بەلأم هەر بە سەرکەوتوویی دەمێنێتەوە و له هەمانکاتیشدا له چەمبەر و گەمارۆی ئاوەکانی دوورەپەرێزی و تەنیاییدایە و سەربەرزە بەو نانەواخانەیەی که دەتگوت لانەداڵە!

لەمە تێدەگەی یان نا؟

من تێدەگەیشتم کەچی دەگوت بەلأم لاموایە ئێمە هەموو له منداڵیدا تووشی نەخۆشی دەبین له شوێنی جیاجیادا و ئێمە هەموو له تۆپێندا شتێکمان شکاندووە!

–دەزانم، من باسی ڕێکەوت و هەڵکەوتی زەق و بەرچاوم بۆ نەکردوویت "لۆك" له من دەچێ ناچێ بەلامەوە گرنگ نیە، بەلأم جیلوەو درەوشانەوەی پاسەکە شتێکی گرنگە و ڕاڤەکردنیشی سەختە چونکە پێوەندی بەیادەوەرییە تەماوییەکان، بە شێوەو خوراڤاتەکانی منداڵییەوە هەیە.. ئەو کات، ئەمەوێ بڵێم کاتێك له تەمەنی لۆکدا بووم بە وەرزێکدا رابردم که بەنەخۆشییەکی درێژخایەن

دەستی پێکرد دواتر کە ئاهێکم تێگەڕاو چاك بوومەوەو لەش ساغیم بەسەرپیّ گرتەوە ڕۆیشتم لەگەڵ هەندێك لە هاورێکانمدا وازیم کرد و قۆڵم شکا دواجار هەر کە قۆڵم گیرسایەوە خوشکی هاوکلاسێکی خۆم خۆشویست، دەرد و ڕەنجی ئەوینم دیت، لەتاو سۆزی عەشقێکی یەکلایەنە گڕم دەگرت و ئازارم دەکێشا، ئازاری کەسێك کە ناتوانیّ تەماشای چاوی ئەو کچە بکا کە گاڵتەی پێدەکا و کەچی ئەم خۆی لە پێناودا داناوە.

لۆکیش تووشی هەمان نەخۆشی بوو و لە کاتی چاکبوونەوەدا بۆ تەماشای سێرك داوەتیان کرد، کاتێك لە پلیکانەکان شۆردەبۆوە، خلیسکاو گوێزینگی پێی شکا، ماوەیەك دوای ئەوە دایکی بەسەریدا هات و بینی لە پەنای پەنجەرەکە دەگریی و خوڕان خوڕان فرمێسك هەڵدەوەرێنیّ و دەستە سرێکی شینی تەڕی لە نێو چنگدایە — دەستە سرێکی نامۆ بە ماڵ! بەوەدا کە مرۆڤ دەبیّ لە ژیانیدا چەندین هەڵوێستی لێکدژی هەبیّ گوتم عەشق و ئەوینی منالآنە وەك زیپکەو جوانەرۆ شتێکی حەتمییە بۆ تازە لاوان.

بەلأم حیکایەتی فرۆکەکە — چونکە شتێکی دیکە بوو — بە دلّمەوە نووساو ڕەزامەندیمی بەدەستهێنا، کۆپتەرێکی زەمبەلەکدار، ئەوەی کە ئەم لە جەژنەزای لۆکدا لەگەڵ دەستی خۆیدا بەدیاری بۆی هێنا!

—کاتیّ باسی سندوقە میکانیکەکەم بۆ کردیت، ئەو سنوقەی کە دایکم لە چواردەساڵیدا بە دیاری بۆی هێنام، ڕۆژێکم هاتەوە یاد بەڵیّ ئەوەم هاتەوە بیر کە لەو ڕۆژەدا ڕوویدا،: گەرچی ڕەشەبایەکی هاوینەی دەهات من لە باخچەکە بوومەو گوێم لە هەورە تریشقە دەگرت، پێشتر لە نزیك دەرگای سەرشەقام مێزێکم دروست کردبوو، یەکێك لە ماڵەوە بانگمی کرد، دەبوایە بۆ چرکەساتێك بچمە ژوورەوە، کاتیّ کە چووم بینیم میکانیکەکە دیار نیە، دەرگاکەش کرابوەوە، پەرۆش و بیّ قەرار هاوارم کرد و لە حەژمەتان هەڵهاتمە سەر شەقامەکە، بەملا و بەولادا چاوم گێڕا کەسم نەبینی، لە هەمان چرکەساتدا برووسکەیەك لە شیروانییەکەی ئەوبەری دا ئەمە هەمووی لە ساتێکدا ڕوویدا کاتێك کە فرۆکەکەم دەدایە لۆك ئەوەم هاتەوە یاد، شاد و خۆشحاڵ تەماشای فرۆکەکەی دەکرد و لە پێستی خۆیدا نەدەحەواوە وەك من کە پێشتر لە تەماشای میکانیکەکە لە خەنی خۆشیان ئۆخژنم کەوتبوە دلّ. دایکی هات و فنجانێکی قاوەی بۆ هێنام، چەند قسەیەکمان بەیەکەوە کرد، قسەی سادە و ئاسایی ئەو کات هاوارێکمان بیست، لۆك بەرەو پەنجەرەکە ڕایدەکرد دەتگوت دەیەویّ خۆی فڕێداتە خوارەوە، سپی هەڵگەڕابوو، فرمێسکی بە لووزە و دادەباراند و پچڕ پچڕ بەلاڵەپەتە دەیگوت: فرۆکەکەم فڕی و لە کەلێنی پەنجەرەکەوە دەرچوو و کەس نازانیّ ڕۆیشت بۆ کویّ!.. پێی بەزەویدا دەکوتا و هەر دەیگوت و دەیگوتەوە: چیتر چاوم پیّ ناکەوێتەوە لە هەمان کاتدا هاوار هاوارێکمان لە قاتی خوارەوە دەهاتە گویّ، مامەی بە هەڵەداوان خۆی کرد بە ژووردا و گوتی خانووەکەی ئەوبەر ئاگری تێبەر بووە.

ئێستا تێگەیشتی یان نا؟ چاکە، بادەیەکی تر خراپ نییە!

لەبەرئەوەی مات بووم و ورتەم نەکرد کابرا گوتی بیر لە لۆك دەکاتەوە، لە بەختی لۆك دایکی خوێندنگای هونەر و پیشەکانی بۆ پێشنیارکردبوو، ئابەم شێوەیە وەك ژنە دەیگوت ڕێگایەك لە ژیاندا بۆ خۆی دەکاتەوە، ڕێگایەکی خاکی و ساکار. بەلأم

ئەم ڕێگەیە ئاوەڵا بوو، بەڵام قسە دەربارەی ئەم مەسەلە بە جۆرێك لە شێتی دادەنرا کابرا گوتبووی ئەمە بەمانای یەك ئاکامە: سەر شۆری و زیلەت، ڕۆتینی کوشندە، ساڵە یەکڕەنگەکان، ئەو شکستانەی کە جەستە و ڕۆح دەپووکێننەوە، پەناگەیەك لە بارێکی گەڕەکدا ئەویش لە تەنیاییەکی بەسویدا، لە هەموو ئەمانەش خراپتر لە چارەنووسی لۆکدا نەبوو، چونکە لۆك جارێکە و دەمرێ و دەبڕێتەوە، کەسێکی تر وێنەی لۆك دەگەڕێنێتەوە، ئەویش بە نۆرەی خۆی دەمرێ و لە وێنەی پیاوێکی تردا دێتەوە ناو بازنەکە! لۆك گرنگ نەبوو: شەوان بێخەوی و شەو بێداری هەڵیدەگرێ و دوور دوور دەیبات بۆ لۆکێکی تر، بۆ لای کەسانێکی تر کە ناو دەنرێن ڕۆبەرت یان کلاودی یان میشێل، سیستمێکی ناکۆتا لە شەیتانە بەستەزمانەکان کە بەبێ ئەوەی بزانن وێنەکە دووبارە دەکەنەوەو بڕوایان بە ئازادی و هەڵبژاردن هەیە وەلێ مرۆۋ مەی هەیە و غەمی هەیە و شتێکی دیکەی لە دەست نایە!

—لێم لە هەرا دەدەن و هاهووم لێ دەکێشن کاتێك پێیاندەڵێم کە لۆك چەند مانگێك دوای ئەوە مرد، گەمژەن، ڕەشەولاًخن تێناگەن کە..

—وا تەماشام مەکە — بەڵێ مرد. ناسازییەکەی بەوە دەستی پێکرد — سینەی دەیەشا تومەز سینگی هەوی کردبۆوە، داڕزابوو، ڕاست وەك من کە لەو تەمەنەی ئەودا بووم تووشی هەوی جگەر هاتم، بە گوێرەی من لە نەخۆشخانە قەرەنتینەکرام و جەغزیان لە دەورم لێدا بەڵام دایکی لۆك سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لە ماڵەوە بخرێتە ژێر چاودێری و مقەیەتی و داژداری بکرێ. نزیکەی هەموو ڕۆژێك سەرم لێدەدا هەندێك جاریش برازاکەم لەگەڵ خۆم دەبرد وازی لەگەڵ بکات، خەم و ماتەم باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشابوو. ئەو کاتە تەنیا دڵخۆشی ماڵ سەردانەکانی من بوون، بە گوێرەی لۆکیش هاودەمی و پاکەتی گەزۆ و حەلوای دیمەشقی. لەسەر ئەوە ساغ بوونەوە کە من دەرمانەکان بکڕم دوای ئەوەی کە پێمگوتن دەرمانگەیەك هەیە بە هەرزان دەرزی و حەپ و شرووبم دەداتێ و خاترم دەگرێ. دواتر بەوە ڕازی بوون کە من ببمە نەخۆشەوانی لۆك.

خەیاڵی ماڵێکی وا بکە کە بەناچاری نەبێ دوکتور سەری پێداناکا کە کەس ئاگای لە نیشانەکانی هەوەڵین تۆژینەوەی پزیشك نیە، بۆ وا سەیرم دەکەی؟ مەگەر شتێکی خراپ و ناسازم گوتووە.

بۆ ئەوەی دڵنیای بکەمەوە گوتم نانا شتێکی خراپی نەگوتووە بە تایبەت دوای ئەم بادەمەیە لانیکەم دەتوانێ وێنای شتێکی سامناك و جەرگبڕی وەك مەرگی لۆك بکات ئەو بەستەزمانەی لە پاسی ژمارە 95دا وەك تارماییەك دەرکەوت ئێستاش هەردووکیان دوو بەدوو لە ژوورێکدا ئەم وەك نەخۆشەوان و ئەو منداڵەش لەسەر قەرەوێڵەکەی بە ئارامی دەمرد.

—چاکە چۆنت پێخۆشە باوابێ! ڕاستییەکەی هەفتەکانی دوای جەنازە و پرسەکەی بۆ یەکەمین جار هەستم بە شتێك کرد کە دەشێ ناوی شادی بێ!

ئێستاشی لەگەڵدا بێ ناو ناوە سەر لە دایکی دەدەم، کارتۆنێك پسکیت لەگەڵ دەستی خۆمدا دەبەم بەڵام نە شەقامەکەم بەلاوە گرنگە نە ماڵەکە نە ئەم مەحشەرگەلە جوانەی لەوە دەچێ نکۆڵی لە هەوەڵین مردوو بکات، نە هەست و هۆشی ئەوەی کە ژیانم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ و مەی لە دوای مەی لە کیس دەچێ، لە کۆتاییشدا لە کونجێکدا یان سەعاتێکدا

لەناو دەچم تا چارەنووسی مردوویەکی نەناس و گومناو دووپاتبکەوە بەبێ ئەوەی بزانم کەی و لە کوێ بەڵام من...

بەڵێ لە ڕاستیدا من دەمرم بەبێ هیچ لۆکێك بێتە ناو بازنەکەوە، تا بە گێلی ژیانێکی گێل دووپات بکاتەوە، تا چەرخی بوون بە هەرمانی بگەڕێ و هەموو بێنەوەو هەموو بپشکوێنەوە، پیرەمێرد لەم کەماڵە تێدەگەی؟ بەڵگەی ناوێ دڵخۆشییەکی گەورە لەو دووبارە بوونەوە و چەندپات بوونەوەدایە!.

مەیخانەی تاقیکردەوە، مەی هەرزانبەها، ئەو چاوانەی کە لە تایەکدا دەسووتان کە لە جەستەوە نەدەهات سەرباری ئەمەش چەند مانگێك ژیاو ڕۆژانە چرکە بە چرکە گێلی چەشت، دڵنیا لەوەی کە دەمرێ تا ئێوارەیەکیان کاتێك بە باغی لۆکسمبۆرگدا ڕادەبرد گوڵێکی زەردی بینی..

–لەسەر بەردێك بوو، گوڵێکی زەردی سادە و ئاسایی. وەستابووم جگەرەیەك داگیرسێنم، سەرنجی ڕاکێشام دەتگوت تەماشای من دەکات وەك جۆرێك لە ویسالێ و پێوەندی، ڕەنگە ئەوەبێ کە پێیدەڵێن جوانیی، نازانم. بەڵام گوڵەکە جوان بوو، گوڵێکی نازەنین. من مەحکومم و ڕۆژێك بۆ خۆم سەردەنێمەوە و دەمرم، گوڵەکە جوان بوو، هەمیشە گوڵ لە ئارادایە هەمیشە گوڵ هەیە، هەمیشە گوڵ دەڕسکێ و شین دەبێ بۆ پیاوە هاتووەکان! لە پڕدا لە هیچ تێگەیشتم، ئەو هیچەی ئارامی و خامۆشی دەخوڵقێنێ و بازنەکە ڕادەگرێ، من دەمردم و لۆکیش دەمرد و گوڵ بۆ ئێمەمانان ناپشکوێ، هیچ شتێك نیە نا هەرگیز هیچ شتێك نیە ئێمە تازە بکاتەوە. ئەوە هیچەکەبوو، دواتریش گوڵێك ناڕسکێ.. دەنکە شخارتە داگیرساوەکە پەنجەکانی سووتاندبووم! لە گۆڕەپانەکە بە هەڵەداوان و تەپوکوت خۆم هەڵدایە ناو ئۆتۆبیسێکەوە کە خۆشم نەمدەزانی بەرەو کوێ داژۆرێ، سەرسام و حەپەساو دەمڕوانی و دەمڕوانی بۆ هەر شتێك لەسەر شەقامەکان بەرچاوکەوێ، لە هەموو مرۆڤێك و هەموو شتێکی ناو ترامواییەکەم ڕوانی، کاتێکیش دواجار گەیشتە کۆتایی هێڵەکە دابەزیم و سواری پاسێکی دیکە بووم بەرەو پەڕگەی شار دەڕۆیشت بە درێژایی ئەو ئێوارەیە خۆم لە پاسەکان دەپەستاو دەهاتمە خوارێ، لەسەر تۆقی دەخولامەوە سواری ترامواییەکان دەبووم و دادەبەزیم و بیرم لە گوڵەکە دەکردەوە لە لۆك لە نێو سەرنشینەکاندا لە کەسێك دەگەڕام لەو بچێ، سۆراغی کەسێکم دەگرت بزانێ کە لۆك من بوو من!!

بێ ئەوەی هیچی پێبڵێم لێدەگەڕام بڕوا بۆ ئەوەی بمێنێ و نەمرێ بۆ ئەوەی ژیانێکی قۆڕ و مەینەتبار بژیایە، ژیانێکی بێ کەڵك و بەزیو، ژیانێکی گەمژە و شکستەباری دیکە، ژیانێکی.. من پارەی دانیشتنەکەم دا.

## خۆلیۆ کۆرتازار ( 1914-1984 )

یەکێکە لە گەورە نووسەرانی ئەمریکای لاتین، ساڵی 1914 هاتووەتە دنیاوە و بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەلادێ و گوندەکانی ئەرژەنتین مامۆستا بووە، دواتر لە ساڵی 1951دا هەڵاتووە بۆ فەرەنسا و تا مردن لە پاریس دا ماوەتەوە. بە درێژایی ژیانی و لە هەموو نووسینەکانیدا بەگژی حکومەتە تۆتالیتارەکانی کێشوەرەکەیدا چووە و غەم و شکستییەکانی وڵاتەکەی لەبیر نەچووە. کۆرتازار نووسەرێکە کە گابریل گارسیا مارکیز لە خۆشەویستی ئەو و وەك ئاماژەیەك بۆ هاوڕێیان یەکێك لە کارەکتەرەکانی –سەد ساڵ

تەنیایی- دەبات بۆ پاریس تا لەو ژوورەدا بژێت کە ڕۆکامادۆری تیادا مرد - کە پاڵەوانی سەرەکی ڕۆمانی لنگەشەلێی کورتازارە - ئاماژەیەك کە تەنانەت وەرگێڕی فارسی سەد ساڵ تەنیاییش - بەهمەنی فەرزانەر لێی تێنەگەیشتووەو دەڵێ - ڕۆکامادۆر - ناوی شارێکە بەبێ ئەوەی لە بیری بێ کە هەندێك جار ناوی شار لە مرۆڤ دەنرێ وەك مەهاباد. هەروەتر خۆلیۆ کۆرتازار یەکێکیشە لە هەژدە باوکەکەی ڕێبازی - ریالیزمی جادوویی-

ئەمانەی خوارەوە ناوی بەرهەمەکانیەتی

1- خەلاَتەکان، یان بەرندەکان - 1960 - الرابحون او الجوائز

2- لنگەشەلێ - ڕۆمان - الحجله - 1962

3- چەکە شاراوەکان - چیرۆك - 1961 - الاسلحه الخفيه.

4- میرالا

5- کتێبی مانویل یان کتێبی گیانەوەرەکان

6- کەسێك بەناوی لۆکاس - چیرۆك

7- لانەکان - چیرۆك - الأوكار یان مەکۆکان

8- هیچ کەسێك لەوێ نیە

9- هەموو ئاگرەکان - چیرۆك

10- گلیندامان زۆر خۆشدەوێ

11- هەشت روخسار - هەشت باوك

12- پادشاکان - الملوك

13- سوڕێك بە دەوری ڕۆژدا لە هەشتا دنیادا

14- 62 نموونە بۆ لەیەکگرێدان - 1968 - ڕۆمان

15- دوا خول - 1969

16- حیکایەتێکی موغیانە - مەجوسیانە - حكاية مجوسية

17- هۆراشیۆ

18- تاقیکردنەوەی کۆتایی

## فەرهەنگۆك

نەدوان: بێدەنگ.

گەمانە: وازیچە.

جەژنەزا: جەژنی لەدایك بوون.

چەمبەر: ئەڵقە.

جوانەرۆ: زیپکە.

## سەرچاوە

کوب الحليب قصه: زهرة صفراء لاپەڕە 71-78.

مختارات من قصص امريكا اللاتينيه

ترجمة طلعت شاهين. دار الكرمل، عمان الاردن - 1987.

# شەوی سێیەم

ناتسومی سۆسێکی

لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

من خەونم بینی

منداڵێکی تەمەن شەش ساڵە بە کۆڵمەوە بوو. دڵنیا لەوەی کە ئەو منداڵەی وا لە پشتێم کردووە منداڵی خۆمە. بەڵام، ئەوەی کە زۆر سەیر و سەمەرە بوو، من دەمزانی چۆن و بۆچی ئەو شتە دەزانم، من ئەوەش دەزانم کە ئەو کوڕێژگەیە کوێرە و سەریشی شینە، شین و پاك پاك تاشراوە.

من لێم پرسی ئاخۆ لە کەنگێوە کوێر بووە، لە وەڵامدا وتی:

–ئۆهۆو.. لە سەردەمێکی زۆر دێرینەوە.

دەنگ، دەنگی منداڵانەو.. تەواو.. کەچی گفتوگۆو ڕەفتاری لە هی کەسێکی گەورە دەچوو، قسەکانی کە لە زاری دەهاتنە دەر، ئەو قسانە بوون کە دوو کەسی هاوشان بە یەکدی دەیکەن.

بە دەستە ڕاست و بە دەستە چەپدا، تا چاو بڕ دەکات، مەرەزە بوو.. سەوز دەچۆوە. توولە ڕێگاکەش درێژ دەبۆوە. جار ناجارێکیش شتێك لە شێوەی شینە شاهۆ بە ناو چڕی ئەو تاریکییەدا دەدرەوشایەوە کە تا دەهات چڕتر دەبۆوە.

ئەو بوونەوەرەی سەر کۆڵم لە بەرخۆیەوە وتی:

–ئەها.. ئەوەتا گەیشتینە لای مەرەزەکان.

سەرم بۆ دواوە وەڕسوڕاند و بەو نیازەی بیدوێنم.. لێم پرسی:

–چۆن توانیت ئەوە بزانیت؟

–بە چریکەی شینە شاهۆکان.

وەڵامەکەی دروست بوو، هەر بەڕاستی، ئان و سات، شینە شاهۆکان دوو جار بەیەکەوە چریکاندیان.

گەرچی ئەو کوڕیژگەیە منداڵی خۆم بوو، کەچی کەمەکێ دەترسام. هیچ کەسێك ناتوانێت پێشبینی ئەوە بکات ئاخۆ لەو ڕێگایە چی ڕوودەدات بەو شتەوە کە بار بوو بەسەر پشتمەوە. کە دوور دەمڕوانی لە خۆمم دەپرسی ئاخۆ بڵێیت بلوێ ئەو بارەی سەر پشتم لە شوێنێکدا دابنێم. لەناو چڕی تاریکیدا دارستانێکی پان و پۆڕ دەردەکەوت.

هەر لە هەمان ئان و ساتدا کە من بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ لە کوێدا ئەو بارە فڕێ بدەم، گوێم لێبوو کە بەسەر پشتمەوە منداڵەکەم بە مەزاقێکەوە زیقاندی.

-تۆ بۆچی ئاواهی پێدەکەنیت؟

کەچی هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، وەلێ زۆر سادە و ساکارانە لێمی پرسی:

-باوکە.. ئەرێ من بارێکی قورس نیم؟

-نا.. نەخێر.. قورس نیت.

چاوەڕێکە.. هەر ئێستا قورستر دەبم.

من هیچم نەوت.. بەڵکو ڕووەو دارستانەکە بە خاوی و قورس هەنگاوم دەنا. ڕێ ڕۆیشتنێکی زۆر زەحمەت بوو، چونکە ڕێگای نێوان مەرەزەکان زۆر بە نارێکی پێچ و لوولی پێدەکردم. پاش ماوەیەك گەیشتمە سەر دووڕیانێك، هەر لەوێدا کەمەکێ هەناسەمدا و حەسامەوە.

کوڕیژگەکە هەڵیدایە و.. وتی:

-دەبێ لەم دەوروبەرە نیشانەیەك هەبێت کە ڕێمان پیشان بدات.

دەقاو دەق وابوو، بەردێك کە بە نزیکەی هەشت ئینجی چوارگۆشە، لەوێدا، قوت ببۆوە و بۆ بەرزییەکەشی دەگەیشتە کەمەربەندم. لەسەر بەردەکە نووسرابوو:

"دەستە چەپ، هیگاکوبۆ: دەستەڕاست، هۆتاوارا." گەرچی بۆ تاریکی، تاریك بوو، وەلێ پیتەکان بە ڕەنگی سوور نووسرابوون، زۆر ئاشکرا دەبیندران، ڕەنگە سوورەکەی کتومت وەك بەرسکی سەمەندەل دەینواند.

ئەو مۆتەکەیەی سەر پشتم فەرمانی پێکردم:

"دووڕیانەکە دەستی چەپتە."

لەولاتر و بەدەستە چەپدا.. لەوە دەچوو دارستانەکە سێبەری تاریکی بەسەر سەری ئێمەدا پەرت و بڵاو بکاتەوە، هەروەك بڵێیت لەو ئاسمانە بەرزەوە دابکەوێت. ڕاڕاو دوو دڵ بووم.

ئەو کوڕیژگە نەفامە هەڵیدایە:

-پێویست بەوە ناکات شەرمێ بکەیت.

ملکەچی فەرمانەکەی بووم، ڕووەو دارستانەکە ملم نا. لەو کاتەی بە کاوەخۆ ڕێگاکەم دەبڕی و تا دەهات لە دارستانەکە نزیك دەبوومەوە، سەرسامی ئەوە بووم کە چۆن چۆنی ئەو شتە، کوڕیژگەیەکی ساویلکە و کوێر ئەو هەموو شتە دەزانێت، لە دواوە گوێم لە دەنگی بوو:

-بەڕاستی کوێر بوون ئەوپەڕی ناڕەحەتییە و کەس حەزی پێناکات.

-دە هەر لەبەرئەوەشە کە من تۆم کردۆتە کۆڵم، تاوەکو جاڕس نەبیت و ئاسوودە بیت.

-من ئەوە دەزانم و هەقە سوپاست بکەم کە منت هەڵگرتووە، بەڵام خەڵکی مەبەستیانە سووکایەتی بە من بکەن کە زۆرم پێ ناخۆشە. هەتا دایك و باوکیشم سووکایەتیم پێدەکەن کە زۆر ناخۆشترە.

هەستم کرد تەواو.. ئیتر بەرگەی هیچ دیکە ناگرم. خێراتر هەنگاوم هەڵێنا و بیرم لەوە دەکردەوە تا بکرێت زووتر بگەمە ناو دارستانەکەو ئەو کۆپارەیەی سەر پشتم فڕێ بدەم.

-هێشتا بڕۆ.. کەمەکی تر، ئەوسا خۆت دەیبینی. دەقاو دەق لە ئێوارەیەکی ئاواهیدا بوو.

کە ئەم قسەیەی کرد وەك ئەوە وا بوو لەبەرخۆیەوە بدوێت.

منیش لێم پرسی:

-لە ئێوارەیەکی وادا چی بوو؟

بە جۆرە تۆنێك ئەم پرسیارەم لێکرد کە نهێنی هەست و نەستی منی ئاشکرا کرد، بەڵام بێئەوەی بهێڵم لە مەرامەکەم تێبگات.

-چی بوو؟ جا خۆ تۆ چاك دەزانیت چی بوو؟

وەڵامی ئەو منداڵە پڕ لە مەزاق و سووکایەتی پێکردن.

دوای ئەو قسەیە تێگەیشتم کە ئەو کوڕیژگەیە مەبەستی چییەو کەوتمە سەر غایەلەی ئەوەی کەچی بووە. هەرچەندە تا ئەو حەڵە مێشکی لە هەر

ختوورەو خەیاڵێك بەتاڵ بوو، بەڵام ئیدی هەستێکی تەمومژاوی داگیری دەکردم، بەواتا.. بەڵێ.. کت و مت لە ئێوارەیەکی ئاواهیدا بوو. هەستم کرد، وەك منداڵەکە درکاندی، کە ئەگەر کەمەکی تر هەنگاوی گرانم هەڵبنێم و ملبنێم.. بێگومان پتر تێدەگەم. گەیشتمە ئەو بڕیارەی کە مەرجە من مێشکی خۆم پاك و بەتاڵ بکەمەوە بەوەی کە خۆم ڕزگار بکەم لەو بارەی سەر پشتم بەر لەوەی نهێنی ئەو چیرۆکە بدۆزمەوە، چیرۆکی ئەو شتەی کە لە ئێوارەیەکدا ڕوویدا. چونکە تێگەیشتن لەو شتە بە واتا کارەسات. خێراتر هەنگاوم هەڵێنا، تا دەهات گورج و تیژ تر ڕێم دەکرد.

کەمەکێ پێشتر باران دایکردبوو. ڕێگاکەش تاریك و تاریکتر. وەك کەسێك بەدەم ڕێوە ورێنە بکات و تێکچوو بێت ڕێگاکەم دەبڕی. تاکە شتێك کە لێی دڵنیا بووم ئەوەبوو کە ئەو منداڵە کاڵفام و بچکۆلەیە وا بەسەر پشتمەوە، هەر ئەو منداڵەش بوو کە وەك ئاوێنە دەبریسکایەوە، وەك ئاوێنەیەك کە ڕابردوومی تێدا دەربکەوێت، ئێستام و داهاتووم، سادەترین و چکۆلەترین حەقیقەت شاراوە نەبوو. وێڕای ئەوەش.. ئەو کوڕیژگەیە بێ هیچ گومانێك منداڵی خۆم بوو.

تەواو.. لەوە پتر بەرگەم نەدەگرت.

ئەوەتا ئێرەیە.. ئەوەتا ئێرەیە، تەواو.. لە ژێر ئەم دارکاژە بوو.

دەنگی کوڕیژگەکە دەنێو بارانەکەدا بە جیاو ئاشکرا دەگەیشتە گوێم و دەزرنگایەوە. من وەستام بەر لەوەی کە بزانم من خەریکی چیم. بێئەوەی بە خۆم بزانم گەیشتبوومە ناو قوڵایی دارستانەکە. شتێکی ڕەش کە لەوە دەچوو دار کاژ بێت و تەنها دوو یاردە لە منەوە دوور بوو، دەردەکەوت. تەواو.. وابوو.. دەقاو دەق وەك ئەوەی ئەو کوڕیژگەیە درکاندی.

–باوکە.. تەواو.. لای ڕەگی ئەم دارکاژەوە بوو.. وانەبوو؟

–بەڵێ.. وابوو.

بێئەوەی خۆم بمەوێت ئەم وەڵامەم دایەوە.

–وا بزانم پێنجەمین ساڵی "بونکا" بوو؟

ئێستا کە ڕازەکەی درکاند، بۆم دەرکەوت کە وابوو.. دەقاو دەق پێنجەمین ساڵی –بونکا– بوو.

–بێ زیاد و کەم سەد ساڵ لەمەوبەر بوو کە تۆ منت سەر بڕی.

هەر کە گوێم لەم قسانە بوو، خەیاڵم تەقییەوەو زانیم کە زەمانێك لەمەوبەر من پیاوێکی کوێرم کوشت، نزیك بە ڕەگی ئەو دارکاژە، لە شەوێکی زۆر تاریکی وادا، پێنجەمین ساڵی –بونکا– بوو، سەد ساڵ لەمەوبەر. هەر لەو ئان و ساتەدا، کە زانیم کەسێکم کوشتووە، منداڵەکەی سەر پشتم ئەوەندە قورس بوو نەبێتەوە.. قورس بە قەد خوداوەندێك کە لە بەرد داتاشرابێت.

## پەراوێز:

ناتسومی سۆسێکی: (1867–1916) پرۆفیسۆری ئەدەبی ئینگلیزی بوو، ڕۆماننووسێکی گەورەی (یابان)ەو هەر لەو پێناوەدا وازی لە کاری ئاکادیمی هێنا لە زانکۆ تاوەکو خۆی بۆ ئەدەب تەرخان بکات، لە ڕۆمانە ناوازەکانی: کۆ کۆرۆ، بۆتچان، سانشیرۆ.

## سەرچاوە:


*The Oxford Book of Japanese Short stories*

*Edited by/ Theodore W. Goossen*

*Oxford – UniversityPress*

*1997*

*Reissued 2002*

*Pages (28-31)*

# دوا قومی ئەم جامە

فەرەیدون موشیری

لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

هەموو ئەپرسن:

=چی لە ئاوازی پەنهانی ئاودا هەیە؟

-چی لە هەراوزەنای دڵڕفێنی گەڵای درەختانا هەیە؟

-چی لە گەمەی ئەو هەورە سپییەی

سەروو ئەم شینایيە بێدەنگە بەرزەدا هەیە

وا تۆ نوقمی خەیاڵ ئەکا؟

-لە تەنیایی خامۆشی کۆترەکانا چی هەیە؟

-لە تەقەڵلای بێهودەی شەپۆلەکانا چی هەیە؟

-لە زەردەخەنەی جامی بادەدا چی هەیە؟

وا تۆ چەندان کاژێر

ماتو سەرسام تێی ئەڕوانی؟

-نە لە هەور

نە لە ئاو

نە لە گەڵا

نە لەم شینایيە بێدەنگە بەرزە

نە لەم گڕە سووتێنەرەی خزاوەتە جامەکەمەوە

نە لە تەنیایی خامۆشی کۆترەکان

من بیر لەمانە ناکەمەوە!

من.. ڕازونیازی دەمەو سەحەری درەختەکان

سەمای عەتری گوڵی "یەخ" لەگەڵ بادا

هەناسەی پاکی گوڵاڵە سوورەکانی بناری کەژ

دەمەتەقێی پەڕەسێلکەکان لەگەڵ سپێدەدا

ترپەی دڵی نەمری بوون لە سونبولەکانا

گەڕانی ڕەنگو تەڕایی لە گۆنای گوڵەکانا

هەموو ئەمانە ئەبیستم، ئەیانبینم

من بیر لەمانە ناکامەوە

من بیر لە تۆ ئەکەمەوە

ئەی ئەو کەسەی سەراپات "باشی"یە

بە تەنها بیر لە تۆ ئەکەمەوە!

هەموو کاتێ

لە هەر کوێ بم

حاڵم هەرچۆنێک بێ.. من بیر لە تۆ ئەکەمەوە!

ئەوە بزانە

بە تەنها تۆ بیزانە

تۆ وەرە

لەگەڵما بمێنەرەوە، بە تەنها تۆ بمێنەرەوە

لە شەوانی ئەنگوستەچاوا  لە بری مانگ

تۆ بدرەوشێرەوە

بە فیدات بم، لە بری هەموو گوڵەکان

تۆ بتریقێرەوە

ئەوەتام وەک ئەمبینی، سەرلەنوێ لە داوێنتام

لەو تاڵە درێژانەی قژت پەتێ دروستکەو

بمگرە!

خۆت بمبەستەرەوە!

خۆت حەزت بە چییە بیکە!

وەڵامی پەرەسێلکەکان.. تۆ بیدەرەوە!

تۆ چیرۆکی هەورو با بگێڕەرەوە!

تۆ بمێنەرەوە لەگەڵما، بە تەنها تۆ بمێنەرەوە

لەناو دڵی جامی بووندا تۆ بجۆشە

منیش هەناسەیەک لە قومی گیانم ماوە

دوا قومی ئەم جامە بەتاڵەش، تۆ بینۆشە!*

---

*ئەم شیعرە کە هونەرمەند "موعینی ئیسفەهانی"یش بە دەنگە بە سۆزەکەی خۆی چڕیویەتی.

## سەرچاوە:

لەم کتێبەوە کراوە بە کوردی:

گزینەو اشعار فریدون مشیری– ص ص 117–120، انتشارات مروارید– تهران– چاپ اول 1364.

ئەدەبی نامە

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم

## نامەکانی چیخۆف و ئۆلگاکنیپەر

## لە فارسیەوە: ڕەووف بێگەرد

کنیپەر

24 دیسامبەر

(5 ژانیوەری)

مۆسکۆ

ئازیزەکەم ئانتونی خۆشەویستم، پێدەچێت من گەیشتبێتمە ئەو ئەنجامە ترسناکە کە تۆ وەڵامی نامەی من نادەیتەوە، بڵێی بەدەستت نەگەیشتبن؟ هەرگیز لەمە ناگەم.

ئەمشەو شەوی کریسمسەو ڕاکەڕاکە سونەتیەکە لە ماڵەوە بەرقەرارە. لەبیرمە ئەو سەردەمانەی خۆیشم بەشێك بووم لەوەو هەوڵم دەدا شتەکان ڕێك و پێك بن و، هەرکەسەو ئەو شتەی بۆ دابین کرابێت کە چاوەڕێی ناکات. وەلێ ئێستا بە لامەوە گرنگ نیە.

لە ڕاستیدا بۆ من ماندووبوونە، من حەزدەکەم تەنیا تۆم لەگەڵدابیت، یان من لەگەڵ تۆدابم و بێ ئەوە هەرشتێکی تر (...)

** *** **

چیخۆف

26دیسامبەر

(نیس)

ئەکتەری ئازیز و چکۆڵەم، ئەم نامەیەت لە ساڵی نوێدا پێدەگات، ساڵی تازەو چارەنووسی تازە، ئەگەر ڕێگام بدەیتێ هەزار جار ماچت دەکەم، لەم ساڵی تازەیەدا هەموو ئەو شتانەت بۆ دەخوازم کە خۆت حەزیان لێدەکەیت، هیوادارم هەر لە هەمان باشی و شکۆمەندیدا بمێنیتەوە.

بە ڕاست تەندروستیت چۆنە؟ ئەو دوو نامەیەی دوایی کە بە قەڵەم نووسیبووت نیگەرانی

کردم، وەلێ ئەو وەرەمی سپڵە قەناعەتی پێنەکردمو لەوە دەترسم تووشی تیڤویدێکی سووك بووبیت، ئەمەیش بەو مانایەیە کە ڕێگای شانۆت نەدەنو نمایشنامەکەی من نەکرێتو ناچاربم بکەومە یاری ڕۆڵێت. بە ڕاست حاڵت باشە؟ بەڵێ؟ باشە ئازیزم، ئارەزووی بەختەوەریت بۆ دەکەم.

دنیا لێرە بە تەواوی ساردبوە، سەهۆڵبەندانە، باوەڕدەکەیت؟

پێشتر شتی وا ڕووی نەداوە. لە مارسیلیا بەفر چیاکانی داپۆشیوە، گوڵەکان لە ناکاوێکدا پەژموردە بوون، من بە چاکەتێکی هاوینەوە بەملاو ئەولادا دەڕۆم، ڕۆژنامەکان لەدەست ئەم سەرما چاوەڕوان نەکراوە سکاڵایانە (...).

** *** **

**کنیپەر**

27 **دیسامبەر**

8 **ژانیوەری**

**موسکو- تەلگوراف**

**بە تاسەوە چاوەڕوانی وەڵامی دە نامەکەمم.**

**ئۆڵگا**

** *** **

**چیخۆف**

27 **دیسامبەر**

**"مونت کارلو" تەلگوراف**

**سڵاو جوانکیلەکەم** ***salue.. belle***

** *** **

**کنیپەر**

27 **دیسامبەر**

8 **ژانیوەری**

**مۆسکۆ**

سەر لەمە دەرناکەم ئانتون، پێدەچێت نامەی منت پێنەگاتو نازانم بۆ؟ من تەلگورافێکم بۆ ناردیت کە تەنیا بە وشەیەك پێم بڵێیت نامەکانم گەیشتوون یان نا، بڕوانە، لە دوا نامەتدا نووسیوتە کە هیچت بەدەست نەگەیشتووەو تۆیش هیچ نانووسیت. لەو ڕۆژەوە من هیچم نەناردووە، ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ هیچ نامەیەکت بەدەست نەگەیشتووە؟ تۆ ئەمە بە چی دەزانیت؟

وەك لە تەلگورافەکەدا نووسیبووم دە نامەم بۆ ناردوویت، بە تەلگورافەکەتدا دیارە تۆ لە "مونتی کارلۆ"یت، یاری ڕۆڵێت دەکەیت یان نا؟ (...).

دوێنێ بۆ یەکەم جار پرۆڤەی "خاڵ ڤانیا"م کرد، ئەمڕۆ "مرۆڤە تەنیاکان" نمایش دەکەمو سبەینێ دەڕۆم بۆ پرۆڤەی "سێ خوشکەکە" (...).

دەڵێن "سولیونی گروموف" باش نیە. ڕەنگە "سانین" دەورەکە ببینێت.

"ڤیشنیڤسکی" (کوسیاگین) لە هەموویان باشترەو گشتیان دەست خۆشی لێدەکەن. مایرهۆڵد" (توزن باخ)ی ئاساییەو "ئارتیوم" (چبوتیکین) هێشتا بە تەواوی گفتوگۆکانی کۆنتڕۆڵ نەکردووە، ئەمانە قسەی ئەوانی ترە چونکە خۆم نەمدیون (...).

** *** **

**چیخۆف**

27 **دیسامبەر**

**نیس- ئێوارە**

ئەکتەری چکۆلانەم، بۆ هێند نیگەرانیت؟ ئەمڕۆ تەلگورافەکەتم بەدەست گەیشتو نەمزانی

چیت بۆ بنووسم. ئایا بۆت بنووسم كه وەك گایەك بەهێزم؟ باری تەندروستی تۆ چۆنە؟ هێشتا لەناو جێگادایت یان دەچیت بۆ شانۆ؟ ئازیزترین ئازیزم، وا چاكە مرۆڤ نەخۆش نەبێتو لەوەش چاكتر ئەوەیە كە دڵی مرۆڤ نەخۆش نەبێت، كاتێك لێم دووریت، هەموو جۆرە بیرێكم بەسەردا دێت، هەندێك جار بیری زۆر ترسناكیش. ئازیزم هەرگیز بۆ من نیگەران مەبە.

ئەمڕۆ چووم بۆ مونت كارلوو 295 فرانكم بردەوە. لە "نمیروڤیچ"ەوە تەلگورافێكم لە "منتون" پێگەیشتووە، بڕیارە سبەی یەكتری ببینین، كڵاوێكی تازەم كڕیوە، ئیدی چی؟ ئایا نوسخەی تازەی دەورەكەتت پێگەیشتووە یان نا؟

نووسیوتە دە نامەت بۆ ناردووم، لەوە دەچێت هەر لە مۆسكۆ بۆ ناونیشانەكەی منیان ناردبن، ئەگەر ناردبێتیشت پێم نەگەیشتووە. بە ڕۆژنامەكاندا وا دیارە لە "یاڵتا" هەوا زۆر ساردەو زریانو سەهۆڵبەندانە. دایكم لە بێتاقەتیدا خەریكە دیق دەكات.

دوا نامەت لە (21 دیسامبەر)دا گەلێك كاریگەرو شاعیرانە نووسرابوو (...).

** *** **

چیخۆف

28 دیسامبەر

نیس

تووتەڵەكەم، شتێكی زۆر سەیرت بۆ باس بكەم، دوو سێ ڕۆژ لەمەوبەر پێیان وتم پیاوێك هاتووە بۆ لات، منیش چوومە خوارەوە، پیرەمێردێكم بینی كە بە ناوی "چیركۆف"ەوە خۆی پێناساندم، چەند نامەیەكی بەدەستەوە بوو كە بە ناونیشانی منەوە گەیشتبوونە دەستی. چونكە ناوەكەی لەناوی من دەچێت. یەكێك لە نامەكانت (سێ نامەی تۆی پێبوو) كرابووەوە.

سەركۆنەكردنەكانت لەو كاتەدا كە لە ڤیەنا بوومو، ناوهێنانم بە "سلافیەكی نازو نووك كەر" زۆر درەنگ بەدەستم گەیشت، 15 ساڵ لەمەوبەر هەڵەیەكم كردو ئەو جێگایەی دەبوو بۆی بچم نەچووم. بەڵام ئەمجارەیان تاقە جێگایەك كە دەبوو بۆی بڕۆم، واتا شانۆ، چووم. بلیت نەمابوو، كیفێكی گەورەی پارەم لە ڤیەنا كڕی. پیشانگاكە لە ڕۆژی دووەمی پشوودا كرابووەوە. قایشم بۆ جانتاكانم كڕی، دەبینیت ئازیزەكەم چ ئەقڵێكی ساتو سەودایم هەیە.

باسی ئەوەت كردووە كە بۆچی نامە بۆ دایكم نانووسم، هەرە ئازیزم، من بۆ ئەوو بۆ "ماشا"یش چەند جارێك نامەم ناردووە، بەڵام هەرگیز وەڵامیان نەداومەتەوە، لەوەیش ناچێت هەر وەڵامم بدەنەوە. ئیدی منیش لێگەڕام. تەنانەت بە دێرێكیش هیچ كامیان وەڵامی نامەیان نەداومەتەوە. ڕاست دەكەیت من هەمیشە بە نازونوكمو هەر وایش دەبم، نازانم (...)

دنیا ساردبوو وەلێ ئێستا چاكترەو من چاكەتی هاوینەم لەبەردایە، لە یاری ڕۆلێتدا 500 فرانكم بردەوە. دڵدارەكەم ڕێم پێدەدەیت یاری ڕولێت بكەم؟ (...)

پەردەی كۆتایی شانۆنامەكەم گەلێك خێرا نووسی. وام بەبیردا هات زۆرتان پێویستە، وەلێ ئێستا پێدەچێت تا "نمیروڤیچ" نەگەڕێتەوە دەست بە پرۆڤە ناكەن. ئەگەر بمتوانیایە دوو یان سێ ڕۆژ زیاتر لەسەر ئەو پەردەیە كاربكەم زۆر باشتر دەردەچوو (...)

ژنەکان زۆریان لەگەڵ مندا نان دەخۆن، خەڵکی مۆسکۆی زۆر لێیە، وەلێ من وشەیەکیان لەگەڵدا ناڵێم، لە سووچێکدا دادەنیشمو دەڕۆمە پێستی خۆمەوە، تەنیاو تەنیا یان دەخۆم یان بیر لە تۆ دەکەمەوە.

مۆسکۆییەکان هەندێك جار دەیانەوێت قسە لەسەر شانۆ بکەن. ئاسایی دەخوازن منیش بهێننە قسە، وەلێ من هیچ ناڵێمو لەسەر خواردنی خۆم بەردەوام دەبم. کە باسی تۆ دەکەن، دڵخۆش دەبم، بە ڕاستی دەزانیت زۆر تاریفت لێدەکەن. لەوە دەچێت تۆ ئەکتەرێکی زۆرباش بیت. کەواتە چکۆلانەکەم ئاگات لە خۆت بێتو شادبیت.

ئانتوانەکەت

** *** **

چیخۆف

30 دیسامبەر

نیس

ئەکتەری ئازیز. ئەمڕۆ تەواو لە هاوین دەچێتو ڕۆژەکە بە نامە نووسین بۆ تۆ دەستپێدەکەم. دوا نامەت هەندێك خەمگین بوو بەڵام گرنگ نییەو ئەویش دەگوزەرێت. گرنگ ئەوەیە تەندروست بیت ئازیزم (...)

دوێنێ لە "ڤیشنیڤسکی"یەوە نامەیەکم پێگەیشت، تیایدا دەڵێت لە دوو پەردەی یەکەمدا زۆر باش دەوری دیوە، ئایا لە ماڵ هاتوویتە دەرەوە؟ بۆ پرۆڤە دەچیتە شانۆ؟

دەزانیت گۆڕانێکم بەسەر پەردەی سێیەمو چوارەمدا هێناوە، ئەی ئاگات لە پەردەی یەکەم هەیە؟ ئایا جارێکی تر دەورەکەتیان بۆ نووسیویتەوە؟ یان هەر لەسەر ڕەش نووسە کۆنەکە کاردەکەیت؟ (...).

نامەم لە دایکمو ماشاوە پێنەگەیشتووەو پێشم ناگات. نامەم بۆ پزیشکێك نووسی لە یاڵتاو داوام لێکرد هەواڵی ماڵی خۆمانم بۆ بنووسێت، دەبینیت لە ماڵەوە زۆر نازم ناگرن، بەڵام من ئەوەندە دڵڕەقو بێوەفا نیم. ئایا لە ماڵ هاتویتە دەرەوە؟ بۆ پرۆڤە دەچیت؟

1901

** *** **

کنیپەر

1 ژانیوەری

مۆسکۆ

ئەمڕۆ بۆ یەکەمین جار بەلای "درسدن"دا تێپەڕیمو بیرم کەوتەوە کە (...) دوێنێو ئەمڕۆ چووم بۆ پرۆڤە. ئەمڕۆ پەردەی سێیەممان بێ ستانسلافسکی ڕێك خست، سبەی خۆی دێت بۆ پرۆڤە. دوێنێ (سانین) پەیوەندی بە کاستەکەوە کرد، نازانم چۆن دەور دەبینێت، نەخۆش بوومو تەنانەت پرۆڤەیەکم نەدیوە (...).

لە شانۆنامەکەدا نووسیوتە بە درێژایی پەردەی چوارەم دەبێت "ماشا" بەرگی ڕەشی لەبەردا بێت، ئەی نابێت بلووزی سپی یان خۆڵەمێشی لەبەر بکات؟

ئەکتەرە چکۆڵەکەت

** *** **

چیخۆف

2 ژانیوەری

"نیس"

دڵدارەکەم، کچی شکۆمەندو ئازیزم، نامەکەی 11 دیسامبەرت ئێستا گەیشتە دەستم، نامەیەکی گەورەو گران، سوپاس بۆ خودا کە ون نەبوە (...) لە دایکمو "ماشا"وە نامەم بۆ نایەت، هەرچەندە لە 20ی دیسامبەرەوە ناونیشانی منیان لا هەیە.

لێرە ئارام دەژیم، لە "یاڵتا" زیاتر خەڵك دەناسم. شوێن نیە خۆتی تیا بشاریتەوە، وەلێ نازانم چی بکەم، "ستانسلاڤسکی" نامەیەکی درێژی بۆ ناردووم، لە پێش 23ی دیسامبەردا نووسیویەتیو دوێنێ پێم گەیشتووە، نامەکەی لە بارەی نمایشنامەکەوە نووسیوە، زۆرباش باسی ئەکتەرەکان دەکات، بە تایبەتی لە تۆ (...).

ئاووهەوای ئێرە دەگمەنە. من بەرگی هاوینەم لەبەردایە، دوو جار چووم بۆ "مونت کارلۆ" تەلگورافێكو نامەیەکم بۆ ناردوویت، ئازیزترین ئازیزم، لەوە تووڕەیت کە من نامەت بۆ نانووسمو لەوەیش پەشیمانیت کە تۆ نامەم بۆ دەنووسیت. وەلێ من بێ نامەی تۆ دەمرم، زیاترو درێژتر نامەم بۆ بنووسە، نامەکانت زۆر باشنو من عاشقیانم، چەند جارێك دەیان خوێنمەوە، نەمدەزانی تۆ ئەوەندە وریایت (...).

** *** **

**کنیپەر**

14-2 ژانیوەری

مۆسکۆ

ڕۆژباش ئانتونە هەرە ئازیزەکەم، وا دەزانم سالآنێکە نامەم بۆ نەناردوویت کەچی لە ڕاستیدا تاقە ڕۆژێکم لەدەست داوە. سوپاس بۆ تەلگورافەکەت، شادمانم کە دیسان تەندروستیت چاکە، "نیس" گەرمە؟ "نمیرڤیچ"ت دیوە؟ کوڕی چاکبەو هەموو شتێکم بۆ بنووسە. دەستت کردووە بە نووسینی شتێك یان داوتەتە تەمەڵی، هەردووکیان چاکن. دیسانەوە هاتوومەتەوە سەر خۆم، ئەگەرچی هێشتا دەکۆکمو گەرووم هەوی کردووە، ئەمڕۆ سبەی بێ کارم (...).

دوێنێ ساڵیادی لەدایکبوونی "لوژسکی" بوو. هەموومان چووین بۆ ماڵیان "مرۆڤە تەنیاکان"مان نمایش کردو پاشان گشت تیپەکە ڕۆیشتین. خانوەکە بینایەکی کۆنی بورژوازیانەی گەورەو پتەوە، دایکی ژنێکی بەخۆوەیەو "مانتیلا" بەسەروشانیدا دەداتو گەلێك بە وێڵە. سوپایەك نۆکەریان هەیە، خواردنیان هەمەجۆر گۆشتو مریشکی سوورەوەکراوو لاوەکانیش بە زۆر دەیان کێشایتە ناو هۆڵی سەماوە، ئەگەر کچێکی زۆر گەنجو لە خێزانێکی باشی وەك سەردەمی لاویەتی خۆم بوومایە، زۆر لەو دانیشتنە بێتاقەت دەبووم، وەلێ ئێستا هەستم جیاوازە، مرۆڤ دادەنیشێو تەماشا دەکاتو دەپەیڤێت. بە کورتی مرۆڤ هەستێکی خۆشی دەبێتو بەوە شادە کە بەشێك نیە لەو کۆمەڵە، ماڵەکەی "لۆژسکی" زۆر گەورەیەو ژوورەکانی لە ژمارە نایەن (...) هەردوو خانە خوێکەمان گەلێك میهرەبانو بە ئەدەب بوون "پیرتا"ی ژنی "لوژسکی" نموونەی ئافرەتێکی دڵسۆزو چاکەخوازە. هەموو شتێکی دنیای خۆش دەوێت، سوپاس لە هەموو شتێك دەکات. دوو تیپی پانتومیمیش هاتبوون، یەکەمیان 15 تا 20 کەس بوون، ماسیگرو قەرەجیش بە تەمبوورەکانیانەوە.

ماسیگرێکی تا ڕادەیەك قەڵەویان کە باریتونی دەچڕی، گۆرانی ئیتالیی وت. لەگەڵیدا کۆرس بە تەموورەو پێژەن کردیانە هەراوزەنا،

ویستیان پانتومیمێك نمایش بکەن، دوایی لە نمایشێکی لاوازدا "تارانتیلا"[1] یەکی توندیان پیشاندا (...).

بەڵام تیپی دووەم تامو چێژیان زیاتر بوو. ئەمە پێشنیازی ڕابەری ئەنجومەنی بیرو هونەری ئەدەبیات بوو، پیاوەکە بە قژێکی سووری دەستکردو لووتی درێژیەوە هەرچی لە بووکەڵەکانیدا هەبوو نمایشی کردو (...) ئێمەی وا هێنایە پێکەنین لەوەدا بوو ڕیخۆڵەمان بێتە دەرێ (...) "شاژنی بەفر" لە هەمووی خۆشتر بوو، ناوی لێنابوو بووکەڵە گەردان "بووکەڵەیەکی بێسوود کە لە شانۆی هونەریدا هەراجیان کردبوو" بووکەڵەکە لە ترسی ئەوەی لە مۆسکۆ ونبێت دەستی بە خوێندنەوەی هەر پێنج بەشەکە کرد. جارجارەیش ئاماژەیەکی زرنگانەی بە "ستانسلافسکی" دەدا، گەلێك مایەی پێکەنینو سەرگەرم کردن بوو، (...) دەستی "ستانسلافسکی"م گرتو پێکەوە سەمایەکی خاوی مازورکامان کرد. "لوژسکی"یش کە سەما نازانێت ئەو سەمایەی کرد. تا ڕادەیەك سەماکەمان باش بوو، کە بێگانەکان ڕۆیشتن ئێمە لە کتێبخانەیەکدا ئاسوودەو لە تاریکیدا کۆبووینەوەو گۆرانی قەرەجەکانمان وت، "بوریس"ی برای ستانسلافسکی بە گیتارەوە هاوکاری کردینو ژنەکەیشی گۆرانی دەوت. دەنگی خۆشە، پاشان دانیشتینو کەوتینە قسەو سەعات 7 لە یەکدی جیابووینەوە.

من سەعات 11.5 هەستام، ئاساییە کە ئەمڕۆ پرۆڤە نیەو من لەماڵەوەو بۆ تۆ، ئانتونی ئازیزو دوورم نامە دەنووسم (...).

خۆزگا زستان زوو کۆتایی بهاتایە.

سبەینێ بێ کتێب پەردەی سێیەم پرۆڤە دەکەین، دیکۆرێکی جوانی بۆ کرابوو. کەواتە دوو سبەی نامەت بۆ دەنووسم، هێشتا پەردەی چوارەمم نەخوێندۆتەوە. بیستوومە دیمەنێکم لەگەڵ "چبوتیکین"دا هەیە، پێم خۆشە. حەزدەکەم باش دەوری ماشا ببینم، زوو سێ پەردە پێکەوە پرۆڤە دەکەینو من لە بارەیانەوە بۆت دەنووسم.

ئەمەیش نامەی ئەمڕۆی من، ئیتر هەقی ئەوەت نیە زیزو خەمباربیت. ئێمە حەتمەن دەژین، دەژینو خۆشەویستیش دەکەین، وانیە ئازیزترینم؟ خۆشت بوێم (...) زیاتر بیرم لێ بکەرەوەو هەمیشە بیرم لێ بکەرەوە. ماڵئاوا تا نامەیەکی تر (...).

** *** **

**چیخۆف**

**2 ژانیوەری**

**"نیس"**

لە خۆشەویستان خۆشەویست تر، خەمباریت یان شاد؟ خەمبار مەبە شیرینەکەم. کاربکەو بۆ خاوەن شکۆ ئانتونیوی دانا نامە بنووسە. ماوەیەکە نامەی تۆم پێنەگەیشتووە، بێجگە لە نامەی دوانزەی دیسامبەر کە ئەمڕۆ گەیشتە دەستمو تیایدا نووسیوتە کە من ڕۆیشتم تۆ گریاویت، چ نامەیەکی نائاسایی، بە ڕاستی نائاسایی. دیارە خۆت نەتنووسیوە، داوتە بە یەکێك بۆت بنووسێت، وا نیە؟ نامەیەکی زۆر ناوازەیە. هێشتا "نمیروڤیچ" نەهاتووە بۆ دیدەنیم، پێرێ تەلگورافێکم بۆ کردو پێم وت بە تەنیا بێت بۆ لام، دەبێت یەکتر ببینینو لە بارەی ئەو نامەیەوە کە "ستانسلافسکی" بۆی نووسیوم قسە بکەین، ڕۆژەکانم لە ماڵەوە

بەسەردەبەم، وەك دوێنێ، من ناچمە دەرەوە لەبەرئەوەی کە یەکێکی زۆر گرنگ داوەتی کردووم، بەرگی ئاهەنگم نیەو حەزیشی پێ ناکەم، ئەمڕۆ "مالاکوڤ"[2] لە مۆسکۆ هاتە دیدەنیم ئیدی چی؟ هەر ئەمە. هیچ نەبێت باسی پرۆڤەیەکی "سێ خوشکەکە"م بۆ بکە. ئایا دەکرێت شتی بۆ زیادبکەیت یان لێی کەم بکەیتەوە؟ تۆ باش دەور ئەبینیت ئازیزەکەم؟ بڕوانە، خۆت وا پیشان مەدە کە خەمباریت، لە هیچ کام لە پەردەکاندا، تووڕە بە بەڵام خەمگین مەبە. ئەو کەسانەی لە ناوەوەیاندا خەمبارن ناتوانن قسە باش بکەن و لەبیرکردنەوەدا ون دەبن. زۆرجار لەسەر شانۆ کە خەڵکی قسە دەکەن تۆ خەم دات دەگرێت.. تێدەگەیت؟ بێگومان تێدەگەیت چونکە تۆ زیرەکیت (...).

**توتووی تۆ**

** *** **

**کنیپەر**

4 **ژانیوەری**

**مۆسکۆ**

ئازیزم دەمەوێت چەند دێڕێکت بۆ بنووسم. هەر ئێستا لە پرۆڤە گەڕامەوەو دانیشتووم نان بخۆم "خوتیاینستیڤا"[3] و "زڤانتسڤا"[4] هاتوون بۆ بینینیم و لێرەن، تا چارەکێکی تر دەبێت دیسانەوە بۆ نمایشی "مردووەکان" بگەڕێمەوە بۆ شانۆ. بۆ نەگبەتی هەڵامەتمە، دەنگم هەر دەرنایەت، ئەم هەڵامەتەم لێنابێتەوە، دوێنێ شەو نەنووستووم، نامەکەتم پێش چەند چرکەساتێك پێگەیشت. نامەکانت هێورن و ورەت باشە، هەوڵ بدە لەوێ بە چاکی بیگوزەرێنیت، دەتوانیت بگەڕێیتەوە، خۆ تۆ لە هیچ شوێنێك تویتکە ناگریت. هەقمە نیگەرانی نامەکانم بم نەوەك بکەوێتە بەردەستی خەڵکانی تر (...) سبەینێ بەیەکجار سێ پەردە پرۆڤە دەکەین.

لە ڕۆڵی "ماشا"م قایلم، وەلێ هێشتا دەقی تازەی پەردەی چوارەمم بەدەسەت نەگەیشتووە لەبەرئەوە نازانم (...).

** *** **

**چیخۆف**

6 **ژانیوەری**

**"نیس"**

خانمە هوشیارو ئازیزەکەم، زۆر دەمێکە لە تۆوە نامەیەکم پێگەیشتوە، تەواو لە یادت کردووم، پێم خۆشە کە پێت بڵێم گشت ئەو نامانەی بۆت ناردووم هەموویم پێگەیشت (...).

بۆ دواجار نامەیەکم لە "ماشا"وە پێگەیشت. ئیتر هەرسێ ڕۆژ جارێك نامەیەك بۆ دایکم دەنووسم تا بێتاقەت نەبێت (...)

"سێ خوشکەکە" چۆن بەرەوپێش دەچێت؟ تەنانەت یەکێکیش لەو ئاژەڵە بەدبەختانە شتێکی لەو بارەیەوە بۆ نەنووسیوم، تۆیش مەینووسە، بۆ ئەوەی لێدانێکم بەدەست بخۆیت (...).

** *** **

**کنیپەر**

7 **ژانیوەری**

**مۆسکۆ- سەرلەبەیانی**

ئازیزم، هەرچەندە سەعات یەکی بەیانیە من هەستاوم، چونکە لە دوا نامەتدا نووسیوتە من نازانم تۆ چەند منت خۆشدەوێت، دوێنێ ئێوارە کە ئەوەم خوێندەوە وام بەبیردا هات کە تۆ شتێکی وات

وتووه، پاشان بیرم کردەوە نەکا بە ڕاستی مەبەستت ئەوە بێت. وایە یان نا؟

تۆ وا دەزانیت من هەست بەوە ناکەم کە تۆ چەند منت خۆشدەوێت؟ تەواو بە پێچەوانەوە، ئازیزم، من دەزانم تا ئێستا هیچ کەسێك ئەوەندەی تۆ منی خۆشنەویستووەو خۆشیشی ناوێم. مەسەلەکە چیە؟ بێتاقەت بوویت؟

دوو ڕۆژە نامەم بۆ نەنووسیویت. دوێنێ لەگەڵ دایکمدا سەرمان لە چەند شوێنێك دا، تووشی سەرئێشە هاتمو پاشان سەرئێشەکەم بوو بە لاسەرئێشە (شەقیقە) دوایی چووم بۆ نمایشی "مرۆڤە تەنیاکان" دوێنێ ڕۆیشتم بۆ بینینی "فیدوتڤا"[5] ئەوەندەی قسە کرد سەری بردم (...) پۆستەری کۆنو وێنەو دیاریە کۆنەکانی پیشاندایین.

لە نێوان قسەکانیدا سەرم لەو جیاوازیە سووڕما کە لە نێوان شانۆی تازەو کۆندا هەیە (...).

ڕۆژی 14ی ژانیوەری سێ پەردە لە "سێ خوشکەکە" لەسەریەك پرۆڤە دەکەین، هێشتا "ساتین"م بەدڵ نیە، نازانم ئەو ڕۆژە چۆن دەبێت، "مایرهۆڵد"یشم هەر بە دڵ نیە، دەورەکەی زۆر بێزارکەرە، نە جووڵەی تیایەو نە توانا، گیانی تیا نیە، تۆ هیچ مەڵێ، با ئەوانی تر باس لە کەموکوڕیەکان بکەن.

هێشتا هەر فینگەفینگمە، هەڵامەت دەست بەردارم نابێت، هێشتا لەدەست یەکەم ڕزگارم نەبوو دووەم پەلاماریدام، هەرکە چاك بوومەوە وێنەیەك دەگرمو بۆتی دەنێرم، پێت خۆشە (...).

زۆر لە بیرمدایت ئازیزم، کەی یەکدی دەبینین، چۆن، لە کوێ؟

خۆشحاڵم بەوەی ئەوێ گەرمەو تەندروستیت چاکە، زۆر حەز دەکەم بێم بۆ لاتو ئەگەر بکرێت چەند سەعاتێك لەگەڵتا بپەیڤم، ماچت بکەم، بە هۆی قژتەوە ڕەخنەت لێبگرم، ئاه بپوورە ئاکادمیکوس. ماچت دەکەم، لە ئامێزت دەگرم، خۆشم دەوێیت.

چی تۆ؟

** *** **

**چیخۆف**

7 ژانیوەری

"نیس"

مەستە چکۆڵەکەم، نامەکەتو باسی ئاهەنگی شەوانەی ماڵی "لوژسکی"م خوێندەوە، پرسیبووت ئەو سێ نامەیە، یان باشترە بڵێم ئەو سێ نامەیەی لە زەرفێکدا بوون چیان بەسەرهات. نیگەران مەبە ئازیزترینم هەموویانم بەدەست گەیشتووە. سوپاس گوزارم (...).

بۆت نەنووسیوم نمایشنامەکە چۆن دەڕوات. من دەتوانم لەسەر چی کاربکەمو شتی تریشو تریش.. زۆر لەوە دەچێت 15 ژانیوەری بچم بۆ جەزایر، بەڵام تۆ هەر بە ئادرەسە کۆنەکەی "نیس" نامەم بۆ بنێرە. ئەوان لە جەزائیر بەدەستم دەگەیەنن. دەمەوێت بیابان ببینم (...)

** *** **

**کنیپەر**

7 ژانیوەری

مۆسکۆ

لەبەر چەند هۆیەك حاڵم زۆر خۆشە ئانتونی ئازیزم، تەنیا حەزم کرد ئەمەت پێ بڵێم، ئەوەندە

شەوقێکی زۆر لە ڕۆحم گەڕاوە بۆ ژیانی شادو تێگەیشتن و هەستکردن بە هەموو شتێك، هەموو جوانیەکان و گەورەیی ژیان. هەر مەپرسە. حەزدەکەم بە دەم هەموو کەسێکەوە پێبکەنم، هاوکاری هەموو کەسێك بکەم بۆ ئەوەی دەوروبەرم پڕبێت لە ڕووناکی و گەرمی.

تۆ مەسخەرەم ناکەیت؟ تێدەگەیت؟ ئاه ئانتون چەندم پێخۆشە ئێستا لەگەڵت بم. پێم بڵێ ئایا ئێمە تەنانەت ڕێژەیەك لە ژیان تێدەگەن؟ (...).

** *** **

**کنیپەر**

9 ژانیوەری

1 بەیانی- مۆسکۆ

توتوی ئازیزم شەوێکی هێورە، تازە لە شانۆی "بولشوی"[6] گەڕاومەتەوە. ئەڕۆم بۆ سەر جێگاکەم تا "کریمە"[8] بخوێنمەوە (...) ئێمە ئەمڕۆ پەردەی چوارەممان ئامادە کرد. دەوری زۆرت بە من داوە گیانە، ڕۆڵ بینینی سەختە، بەڵام من پێم خۆشە. دەربارەی پەردەی سێیەم "ستانسلاڤسکی" وتی کە من وەك "کارمین"[8] وامو دەبێت زیاتر خەونی و خۆگربم. دیکۆری پەردەی چوارەمم حەز لێیە، دەبێت بەیانی چاوەڕێ بین و بزانم "نمیروڤیچ" چی دەڵێت، وا بزانم لە بیست و چواردا دەیکەینەوە (...) نازانم نامەکانم بۆ کوێ دەچن، من تا ڕادەیەك هەموو ڕۆژێك دەنووسم. زیاد لە دوو ڕۆژم بەسەردا تێنەپەڕاندووە، هەواڵێك لە پۆستەخانە بپرسە (...)

**توتکەکەت**

** *** **

## پەراوێزەکان:

1-سەمایەکی میللی ئیتالیە.

*2-Malakov*

*3-Khotyaintseva*

*4-Zvantsova*

*5-Fedotova*

*6-Boloshoi*

7-نمایشنامەیەکی گیرهارد ها پتمەنە کە لە 27ی ئوکتوبەری 1901دا کرایەوە.

*8-Carmen*

## سەرچاوە:

کتێبی دلبند عزیزترینم ل 99-112.

# وێستگەکانی سەردەم

- **مەعریفە و پێکهاتی کۆمەڵایەتی**

خوێندنەوەی: یاسین عومەر

- **کتێبی دەروازەیەك بۆ ڕۆشنگەری ئەورووپی**

وەفیق غریزی

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- **"ئاوریشم"ی ئەلێساندرو باریکۆ**

لە عەرەبییەوە: سەردەم

- **ماری ئەنتوانێت (1755-1793)**

ئامادەکردنی: هەورامان وریا قانع

# مەعریفەو پێکهاتی کۆمەڵایەتی

نوسینی: پیتەر هاملتۆن
ڕانانی: حسێن ئەژدەریزادە
وەرگێڕانی: یاسین عومەر

دەروازەیەك بۆ
لێکۆڵینەوەگەلێکی کلاسیك لە
کۆمەڵناسی مەعریفەدا

ئەم کتێبەی بەردەستتان لە پێشەکییەكو دوو نەسكو پێڕستی بابەتەکان پێکهاتووە. نوسەر لە پێشەکییەکەدا دورنمایەکی گشتی لە چوارچێوەی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە بەشەکاندا خراونەتەڕوو، باس لێکردوە. بەشی یەکەم تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕۆشنگەریو کاریگەرییەکانی لەسەر کۆمەڵناسیی مەعریفە، لە سێ بەشی دواتردا (2و3و4)دا باسەکانی مارکسیزم دەخاتەڕوو: مارکسیزمی یەکەم بە باسەکانی هیگلو مارکس، مارکسیزمی دووەم بە باسەکانی لۆکاچ، مارکسیزمی سێیەمیش بە باسەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت (هۆرکهایمەر، ئادورنۆ، مارکۆزە، هابرماس)و کۆمەڵناسیی مەعریفەو کۆمەڵناسیی ئەدەبیاتی لۆسیان گۆڵدمان. نوسەر لە بەشی پێنجەمدا باس لە ڕای ئەپسیمیی ماکس شیلەرو لە بەشی شەشەمو حەوتەمیش یەك بەدوای یەك لە کۆمەڵناسیی ماکس ڤیبەرو دۆرکهایم دەدوێت. بەشی هەشتەم لەژێر ناونیشانی (کارل مانهایمو دروستکردنی کۆمەڵناسییەکی ئەپسیمیی ڕێژەییگەرا) تایبەتە بە دیدگای ڕێژەییگەرایانەی کارل مانهایم. لە بەشی نۆیەمو دەیەمیشدا بەدوای یەکدا ((ڕوهێنانی ئاشکرای کۆمەڵناسانە بە کۆمەڵناسیی مەعریفە))و ((ئەنجامگیریی)) دەهێنرێتەوە. دوایین بەش لە لاپەڕەی 153دا تەواو دەبێت.

ئامانجی سەرەکیی ئەم لێکۆڵینەوەیە، شیکارو توێکاری ئەو توێژینەوانەیە کە بە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵناسیی مەعریفە دەژمێردرێن. ئەم لێکۆڵینەوەیە نە بایەخ بە وردەکاری بابەتەکان دەداتو نە لە ڕوی شیکاریشەوە تەواوو بێکەموکوڕییە. ئەوەی دەهێنرێتەوە مەسەلەگەلێکن کە گەورە کەسانی هونەر تەرحیان کردوەو بە ڕای ئەوان زۆرترین کاریگەری بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵناسیی بەگشتی کۆمەڵناسیی مەعریفە دایناوە. هەروەك نوسەر خۆی دانی پێدا دەنێت بە هۆی کەمی کاتو تواناوە باسی لە هەندێك کەسی وەکو زنانیکیو مارتنو پارسۆنز نەکردوە. ئەو ئاڕاستانەیشی کە خراونەتەڕوو لەبەر ئەو مەبەستە بووە کە بزانرێت هەر یەك لەم ئاڕاستانە پەیوەندیی نێوان مەعریفەو پێکهاتی کۆمەڵایەتیی چۆنچۆنی شیدەکەنەوە. باسەکانی کتێبەکە لەسەر تەوەری سێ (پێش نمونە)ی بنەڕەتی لە کۆمەڵناسیی مەعریفیدا کە ڕەگەکانیان لە بەرهەمەکانی مارکسو دۆرکایمو ڤیبەردایە، چڕ دەبێتەوە. هەریەك لەم پێش نمونانە بە شێوەیەکی تایبەت بەرخورد لەگەڵ مەسەلەی پەیوەندی نێوان مەعریفەو پێکهاتی کۆمەڵایەتیدا دەکەن. ئەمە جگە لەوەی هەریەکەیان خاوەنی بنەمایەکی تەواو فەلسەفیو ڕیفۆرمیستی تایبەت بەخۆیانن. هەروەها لەم شیکردنەوەیەدا، باسی لەو زەمینە فیکرییانە نەکردوە کە سەپێنەری دەرکەوتنی

مەســـــەلەگەلێك بـــــوون لـــــە دروســــتكردنی كۆمەڵناســــیی مەعریفـــەدا. بـــەبڕوای نوســـەر چـــەمكی ئایـــدۆلۆژی ئـــالێرەوە دێتەكایـــــەوە: بەرژەوەنـــــدیی سیاسی، كۆمەڵایەتی یان ئابوری گروپـــی ئەفرێنـــەری مەعریفـــە، لەسـەر بنـەمای بەرژەوەنـدی ئـەو گروپە ئۆباڵی بە لاڕێدابردنی ئەم مەعریفەیـەی دەكەوێتـە ئەسـتۆ، هـــەموو بـــیری بیركردنـــەوەی ئایـــدۆلۆژی، و ئـــەوەی كـــە هەلومــــەرجێكی وجودیانـــــە دەتوانێـت كاریگـەر بێـت لەسـەر ئیعتیبـــــاری بیركردنـــــەوە، تایبەتمەندی فەلسەفەی چەرخی ڕۆشنگەرییە. لە ڕوی نەریتیەوە، مەعریفـــەی ئێمـــە بـــۆ جیهـــان و بـۆ خۆمـان و بـۆ ئـەوانی دیكـە وەك مەســـەلەیەك كـــە بـــەپێی تیۆرەكـــانی ئەپســـتمۆلۆجیای ئەزمونگـــــەرایی بەتایبـــــەتی دەیڤـــد هیـــوّم، بـــەم واتایـــە بـــوو كـــە مەعریفـــە دەبێـــت بـــەپێی هەلومـــەرجی بوونێـــك بناسرێت كە تیایدا هاتۆتە بوون. هەرئەوەنـــدە پێناســـەی ئـــەم ئەزمونـــە بـــە دەربڕینێكـــی كۆمەڵایـــەتی مەیســـەر ببێـــت، ئاشـــــكرا دەبێـــــت كـــــە (كۆمەڵناسییەكی مەعریفە) لەبەر دەستدایە.

لـــەم ڕووەوە، گەڕانـــەوەی ئازادانـــەی مێـــژوی ئـــەم بەشـــە زانســـتە لـــە ئەپســـتمۆلۆژیاوە دەگەڕێتەوە، هەرچەندە سەرباری پێداویســـتیی. هەڵســـەنگاندنی زەمینەكـــە، هەقیقـــەت و واتـــای مەعریفـــەش هەیـــە. گـــرنگترین پانتـــــــایی پەرەســــــــەندنی كۆمەڵناســــــیی مـــــــەعریفیی، ماركســـیزم بـــووە. لەڕاســـتیدا، زۆربەی ئەو بابەتانەی كە لێرەدا تاقیدەكرێنەوە، بە ئەندازەیەك كە لـــە پـــەیبردن بـــەوەی مەعریفـــە چۆنچـــۆنی دروســـت دەبێـــت، پاشـان پێكهاتبەنـدی دەكـات و خـــاوەنی ئیعتیبـــار دەبێـــت و بەلاڕێـــدا دەڕوات، بایـــەخ بـــۆ هۆكـــــارە كۆمەڵایەتییـــــەكان دادەنێن.

بـــەم پێیـــە، كۆمەڵناســـیی مەعریفی هەم مەعریفە لە باوەڕ جیادەكاتـــــەوە و، هـــــەمیش تێكـــەڵیان دەكـــات. پـــۆزیتڤیزم لێرەدا ڕۆڵێكی گرنگ دەگێڕێت، لەبەرئـــەوەی بـــەپێی نمونـــە ئەزمونییەكە، پێیوایە دەتوانێت لە نێوان ئەو دوو دەستەیە لەو مەعاریفانـــەی كـــە دەبێـــت بـــە ئیعتیبار وەربگیرێن، لەلایەكەوە، ئـەو مەعاریفانەشـی كـە دەبێـت نرخـــــــی داوەری ڕێبـــــــازە وەزعییـــــەكان یـــــان بـــــاوەڕە موجەڕەدەكان دابنرێن، لەلایەكی تـرەوە، جیاكارییـــەكی تـــەواو دابنرێـــت. لـــەم ڕووەوە دەبێـــت سـەرنج بـدرێت كـە هـەر كـەس چۆنچۆنی مەعریفەی ڕاستەقینە دەردەخات، چونكە لە هەقیقەتدا، ئەمـــە یەكێكـــە لـــە ڕێگاكـــانی ســـــەیركردنی مەســـــەلەگەلێكی هەمەچەشـنی ئـەم بەشـە و لـە توێژینەوەكاندا ڕون دەبێتەوە كە هـەر كـام لـە پـێش نمونـەكان چۆنچۆنی ئەم شێوەیە چارەسەر دەكەن.

نوسەر بەپێی پێنج ناوچەی بنـــەڕەتی لـــەو كۆمەڵناســـانە دەكۆڵێتەوە كە پێشتر باسكراون:

1-وەك تیۆرگـــەلێكی مـــەعریفی لـــــەڕوی كۆمەڵناســــــییەكی ئاڕاستـەدار كـە بـە پێناسـەكانی ئـــــەوان بـــــۆ (مەعریفـــــە)، و بەستنەوەی مەعریفە بە كۆمەڵگە یـــان سیســـتەمی كۆمەڵایەتیـــە لەبەرچاو گیراوە.

2-سـەبارەت بـە بونیـاتی فیكـری (فەلسـەفی، كۆمەڵناسـی و هتـد) تیۆرە مەترەحەكان.

3-وەكـو میتۆدگـەلێكی جیـا بـۆ شـیكاری پەیوەنـدیی داسـەپاوی نێـــوان مەعریفـــە و پێكهـــاتی كۆمەڵایەتی.

4-بـــــــە ئەندازەیـــــــەك تێگەیشـتنەكانیان أ: زانســتییە

نـەك فەلسـەفی ب: لانـی کـەم لەڕوی کەمییەوە، ئایدۆلۆژییە.

5-بـە ئەندازەیـەك هـەر یـەك لـەم تیۆرانـە لـە ڕوی ناوەڕۆکـەوە یەکانگیرن.

## کتێبی
## دەوازەیەك بۆ ڕۆشنگەری ئەوروپی

**وەفیق غریزی**

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

کتێبی (دەوازەیەك بۆ ڕۆشنگەری ئەوروپی) کە بیریار "هاشم سالح" نوسیویەتی و لەم ماوەی دوایـیدا لەلایەن (دار الطلیعة) لە بەیروت بلاوکراوەتەوە، بریتییە لە سەرەتایەك بۆ لێدوان لە دیاردەیەکی ترسناك کە تەنها لە ئەوروپادا ڕوی داو ئەو دیاردەیەش بریتییە لە ڕۆشنگەری.

نوسەر لەم کتێبەدا هەوڵدەدات ڕەگوڕیشەی سەرەتای ئەم دیاردەیە ئاشکرا بکات و ئەوە نیشان بدات کە چۆن چۆنی بۆ یەکەمین جار لە ولاتانی ئیتالیا و هۆلەنداو ئینگلتەرەدا، سەریهەڵدا. لەم سەروبەندەشدا نوسەر جیاوازی لە نێوان سێ قۆناغی سەرەکی لە مێژووی فیکری ئەوروپیدا ئاشکرا دەکات: سەدەکانی ناوەڕاست پاشان سەردەمی ڕێنیسانس و هەروەها سەردەمی ڕۆشنگەریش. "هاشم سالح" پێیوایە ڕێنیسانس بۆ خۆی ڕۆشنگەری بووە، بەلام نەبوتە مایەی دروستکردنی دابڕانێکی ئەپستمۆلۆژی تەواو لەگەڵ سەدەکانی ناوەڕاستدا، بەڵکو قۆناغێکی ئینتقالی بووە، سەرەڕای بوێری بیریارانی و گەورەیی دەستکەوتەکانیان.. تەنها سەدەی هەژدەهەم، واتە سەردەمی ڕۆشنگەری مەزن توانی ئەم دابڕانە گەورەیە دروستبکات، ئەو دابڕانەی ناچێت بە ئەقڵدا و تا ئێستاش سەراسیمەمان دەکات. لێرەدا پرسیارێك دێتە ئارا، ئەویش ئەوەیە چۆن ئەم دابڕانە مەزنە لە مێژووی فیکردا ڕوویداو، لەگەڵ خۆشیدا سەربەخۆیی تەواوی بۆ ئەقڵ و فەلسەفە لە بەرامبەر ئەقڵ و ئایینـدا دەستەبەر کـرد؟ کێن ئەوانەی قارەمانی ئەم پرۆسەیە بوون؟ چۆن توانرا تێگەیشتنی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ ئایین بە تێگەشتنێکی ئەقلانی ڕۆشنگەرانە بگۆڕدرێت؟ ئەمە هەندێك لەو پرسیارانەیە کە "د. هاشم سالح" هەوڵدەدات بیانکات و وەلامیشیان بداتەوە.

### هوشیاری میتۆلۆژی

نوسەر لەم کتێبەیدا باس لەوە دەکات کە فیکری ئەوروپی بۆ ماوەی سی ساڵە، خەریکی گێرانەوەی ئیعتیبارە بۆ ئەو سەردەمانەو دان بە هەندێ لایەنی پۆزەتیڤانەیاندا دەنێت و بە قۆناغێکی مردوو بەسەرچویان ناداتە قەڵەم. لێرەدا نوسەر تەئکید لەوە دەکاتەوە کە پێویستە جیاوازی لە نێوان سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپا و لەگەڵ سەدەکانی ناوەڕاست لە جیهانی ئیسلامیدا بکرێت. چونکە گەر بێتوو سەدەکانی ناوەڕاست بە یەکجارەکی لە ئەوروپادا کۆتایی هاتبێت و لە بیرچوو بێتەوە، ئەوا لە جیهانی ئیسلامیدا هەر بەردەوامە و سەرکەوتن و هەڵکشانی زۆری بزاوتە فێندەمێنتالستەکان بەو خێراییە لە ساتەوەختی ئێستادا، بەڵگەیەکی روونی بەردەوامێتی سەدەکانی ناوەڕاستە. تەنانەت وەکو "هاشم سالح" دەڵێت: (ئێمەی ڕۆشنبیرانی مۆدێرنیش،

تا هەنووکە شتێك لە پاشماوەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لە ناخماندا ماوە).

لەلایەکی ترەوە نوسەر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە نابێت وا بزانین سەدەکانی ناوەڕاست هەر هەمووی، کەوتبووە ژێر هەژموونی ئەقڵیەتی میتۆ لۆژی و ئەفسوناوی و خورافیەوە. لێرەشدا پێویستە جیاوازی لە نێوان سەدەکانی ناوەڕاستی یەکەم و سەدەکانی ناوەڕاستی دووەمدا بکەین.

چونکە لە ڕاستیدا ئەقلانیەت هەر لە سەدەی دوانزەهەمەوە بەرەبەرە هاتە ناو ئەوروپاوە و لە سەدەی سیازدەهەمدا گەیشتە ئەوپەڕی. پاشان لە هەڵکشاندا بەردەوام بوو، تا گەیشتە تخوبەکانی سەردەمی ڕێنیسانس لە سەدەی شازدەهەمدا.

## وێنەی سەردەمی ڕۆشنگەری:

لە بەشێکی دیکەی ئەم کتێبەدا، نوسەر باس لە سەردەمی ڕێنیسانس و کەسایەتیە ڕابونخوازەکانی وەك: "پەترارك و لۆرنزۆڤالا و ئیراسمۆس و جیۆردانۆ برۆنۆ" دەکات. پاشان دێتە سەر باسی پێشەنگەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری "بایل، گالیلۆ، بوسوێ، سپینۆزا، ڤۆڵتێر". تا دەگاتە ئەوەی وێنەیەکمان دەربارەی سەردەمی ڕۆشنگەری لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا پێشکەش بکات.

"هاشم ساڵح" باس لەوە دەکا کە ئەگەرچی ڕۆشنگەری بەلای ڕۆشنبیرانی ئێمەوە شتێکی زۆر نوێیەو هێشتا ئەزموونمان نەکردووە، بەڵام بۆ ڕۆشنبیری ئەوروپی شتێکی کۆنە و لانی کەم ماوەی دوو سەد ساڵە ئەزمونکراوە، واتە بۆ ڕۆشنبیری ئەوروپی ڕۆشنگەری جێهێشتووە و لە دواوەیەتی، لە کاتێکدا ئێمە هێشتا لە پێشدەمماندایە. سەبارەت بەم مەسەلەیە نوسەر لە پەرەگرافێکی کتێبەکەیدا دەنووسێت: (لە کاتێکدا ڕۆشنگەری بۆتە کەلەپوورێکی کەڵەکەبوو، ئەوا لە ئەوروپا و ئەمریکادا ئەوە دەخوازێت کە ڕەخنە بکرێت و شەن و کەوی بکەن و هەڵسەنگاندنی بۆ بکەن. بەڵام بۆ کۆمەڵگاکانی ئێمە تا ئێستاش شتێکە، بیرکردنەوە لێی مەحاڵە. لای ئێمە سەرەڕای ئەو هەموو کوشتوبڕەی ڕوودەدات، کەچی کەس ناوێرێت ڕەخنەی بیروباوەڕەکان بکات و بیانهێنێتە ژێر باری میتۆدێکی مێژوویەوە.. فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری لە ئەوروپا، لە بەرامبەر سەردەمەکەیان و میللەتەکانیاندا خۆیان بە بەرپرسیار زانی و دەستیاندایە گەورەترین جەنگی ڕۆشنگەری کە تا ئێستا مرۆڤایەتی بەخۆیەوە بینیبێت).

وەکو ئاشکرایە سەردەمی ڕۆشنگەری، تەئکیدی لە بوونی بەهای یۆنیڤێرسالی کردۆتەوە کە بەسەر تەواوی ڕەگەزی مرۆڤایەتیدا دەچەسپێت، نەك تەنها تایبەت بێت بە ئەوروپا. بۆیە کاری ڕێکەوت نییە کە زۆربەی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری لە فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئینگلتەرا، باسیان لە ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەکرد نەك ڕەگەزی ئەوروپی. ئەمانە خۆشحاڵ بوون بەو پێشکەوتنەی ڕۆحی مرۆڤایەتی، نەك ڕۆحی ئەوروپی بەدەستی هێنابوو. لە پەرەگرافێکدا "هاشم ساڵح" دەنووسێت: (چەمکی چارەنووسی دەستەجەمعی مرۆڤایەتی یاخود بەرپرسیارێتی گەردونی شتێك نییە لە ئێستادا، جێ بایەخی فەیلەسوفانی پۆست مۆدێرنە بێت). ئەم میراتیە لە "مۆنتسکیۆ" وە بۆ

"کۆندۆرسێ" و لە "لایبنتز"ەوە بۆ "لیسینگ" و لە "جۆن لۆك"ەوە بۆ "کانت"، دەربەستی داهاتووی ڕەگەزی مرۆڤایەتی بوو. لەمبارەیەوە نوسەر دەڵێت: (تەواوی سەردەمی ڕۆشنگەری، بەرهەمی ژمارەیەك لەو فەیلەسوفانەیە کە لە بارودۆخێکی ستەمکاری ڕەهادا، داوای ئازادی سیاسیان دەکرد). هەروەها لە بەرامبەر ئسولیەتدا، داوای ئازادی بیرکردنەوە و ڕادەربڕینیان دەکرد.

بایەخی گەورە و گرانی ئەو فەیلەسوفانە بەوە بوو کە چەمکی مافەکانی مرۆڤ لە چوار چێوەی دیدگایەکی گەردونیدا گەلاڵە بکەن. ئەو فەیلەسوفانە بەر لە "فیکتۆر هۆگۆ" پێیان وابوو کردنەوەی قوتابخانە بە مانای داخستنی زیندان دێت و گۆڕینی سستمە تۆتالیتاریەکان، دەبێتە مایەی بەختەوەری.

ڕەنگە ئەوانە زیاد لە پێویست یۆتۆبیست بووبن، بەلام ئاخۆ هەموو دەسکەوتێکی گەورە، سەرەتا بە خەونی ئایدیالستی دەست پێناکات؟ ئاخۆ کۆمەلگاکانی ئێمە دەچنە نێو سەردەمی ڕۆشنگەری و فەیەلەسوفانی ڕۆشنگەری بەرهەم دێنن بۆ ئەوەی تەخت و تاراجی ستەم و تاریکی هەڵتەکێنن، بۆ ئەوەی هەمووەمان لە ئازادی و یەکسانی بەهرەمەند بین؟ ئەم کتێبەی "هاشم سالح" دەیەوێت ڕێگە خۆش بکات و بوار لە بەردەم هاتنە ئارای ڕۆشنگەری برەخسێنێت. فیکر لە توانایدایە دڕ بە تاریکی و شەوە زەنگ بدات، بەلام داخۆ کێ ئێمە لە دەست کێشە و ستەمکاری و نەزانین و پەراوێزکەوتن قوتار دەکات؟ بەلام نوسەر گەشبینی نیشان دەدات و دەڵێت: (سەردەمی ڕوناکی نزیك بۆتەوە.. سەردەمی دەرچوون لە تاریکستانی مێژوو و سەدەکانی ناوەڕاست بەڕێوەیە).

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی – البلد، 2006/4/19.

## "ئاوریشم"ی ئەلێساندرو باریکۆ

**لە عەرەبییەوە: سەردەم**

ڕۆمان نووسی ئیتالی ئەلیساندرو باریکۆ، لە ڕێی ڕۆمانی "ئاوریشم"ەوە دەقێکی ناسکمان پێشکەش دەکات کە وەك ناوی خودی ڕۆمانەکە ناسکە. چیرۆکی خۆشەویستیەکی تایبەتیە کە لە سەدەی نۆزدەدا روویداوە. باریکو ئەم خۆشەویستیە دەخاتە چوارچێوەی چیرۆکێکی ڕەوان و سووکەڵەوە کە کاریگەریەکی خۆشی لەسەر دەروون هەیە. دەتوانیت بە یەك دانیشتن بیخوێنیتەوە چونکە یەکەم قەبارەکەی بچووکە (140 لاپەڕە) دووەم شێوازەکەی وەك ئاوریشم نەرم و نیانە.

هیرڤەژۆنکۆری پاڵەوانی ڕۆمانەکە پیشەیەکی نائاسایی هەیە، ئەو ئاڵ و وێر بە گەرای کرمی ئاوریشمەوە دەکات کە ئاوریشم بەرهەم دەهێنێت. "ساڵ 1861ە، فلۆبیر ڕۆمانی "سالامبو" دەنووسێت و کارەبایش هێشتا گریمانەیەکە لە گریمانەکان. ئەبراهام لنکۆنیش لەوبەر ئۆقیانووسەکانەوە لە شەڕێکی بێ کۆتاییدا بوو" ژۆنکور کە لەو کاتەدا تەمەنی 32 ساڵ بوو، لەگەڵ هیلینی ژنیدا، لە خوارووی فەرەنسادا، لە شارێکدا دەژیا بەناوی لاڤیلدیو. هیلین ژنێکی قەدوبالا جوانی بەلەنجەولار بوو، قژە درێژەکەی بەردەوام بەسەر شانیدا دەهاتە

خــــــواریٚ و دەنگێکـــــــی زۆر خۆشیشی پێوە بوو. هەرچەندە بـــاوکی ژۆنکـــۆر دەیویســـت کوڕەکەی ببێتە ئەفسەری سوپای فەرەنسی، بـەڵام ڕێکـەوت بـەرەو پیشـەیەکی بردبوو کـە تـەواو دژ بـــە پیشـــەی ئەفســـەری بـــوو "مۆرکێکی ئەفسوناوی و بۆنێکی شـاراوەی مێینـەیی" ژۆنکـۆر لـە نهێنیـەکانی ئـەم کـارە کتـوپڕەی گـەلێك شـارەزا بـوو، بۆیـە خـۆی لەو نەخۆشیانە دەپاراست کە لە ئەوروپادا تووشی مەڵبەندەکانی تروکاندنی ئەو گەرایانە دەبوون، بۆیـــە ســـەفەری دووری بـــەرەو ســـوریا و میســـر دەکـــرد بـــۆ بەدەســـتهێنانی گـــەرای ســـاغ و تەندروســـت. بـــەڵام نەخۆشـــی "پـپـرین" کـە تووشـی گـەراکانی ئـەوروپا هـاتبوو، سـەری کـردە ئـەفریقا و هیندسـتانیش، بۆیـە دەبـوو چارەسـەرێکی تـری بـۆ بکرێت.

لێـــرەوە زرنگـــی بالـــدبیو دەردەکـەوێت، ئـەو پیـاوە وریـا و نامۆ ڕەفتارەی کە ئـەویش هـەمان کـاری دەکـرد. ئـەو بـە ژۆنکـۆر دەڵێت: "ئەگـەر بمانـەوێت بـژین، دەبێـت بـڕۆین بـۆ ئەوێنـدەر، بـۆ ژاپـۆن" کـە ژۆنکـۆر شـوێنی ئـەو وڵاتـە غەریبـەی لـێ دەپرسـێت، بالدبیۆ گۆچانەکەی بڵند دەکات، ئامـــاژە بـــۆ پشـــت ســـەربانی کڵێســـەی شارۆچـکەکە دەکـات و دەڵێـــت: "لـــەوێوە ســـەری ڕێ دەگریت، تا کۆتایی دنیا". ژاپۆن کۆمەڵێك دوورگەیـە کـە دوو سـەد سـاڵ لـە هـەموو دنیـا دابڕابـوو. نـاوازەترین بەرهـەمی ئاوریشـمی جیهـــانی لەوێیـــە هـــەموو ئـــەو هەوڵانـــە بەفیڕۆچـــوون کـــە دەیانویسـت ژاپـۆن لـەو تەریکیـە دەربـــاز بکـــەن. بالـــدبیو بـــیری کردەوە: "دوورگەیـەك بـۆ مـاوەی دوو ســـەد ســـاڵ پێـــی مرۆڤـــی نەکەوتبێتـە سـەر، ئـەو دوورگەیـە هـیچ نەخۆشـیەکی ناگـاتێ" بـەم جـــــۆرە ژۆنکـــــۆر لـــــە شارۆچـکەکەیەوە بـەرەو ژاپـۆن بـــەڕێ دەکـــەوێت، ئـــەوروپا و دەشـــــتەییەکانی روســـــیا و چیاکانی ئۆراڵ دەبڕێت تا دەگاتە سـیبریا و پاشـان چـین و ئینجـا ژاپـــۆن. دوای گـــەلێك گێرمـــە و کێشـــە دەگاتـــە هاراکـــای کـــە پێشـەوایەکی ناوچـەییە، ژۆنکـۆر لە ژوورێکدا هاراکای دەبینێت کە "لە سەرزەوی گۆشـەی ژوورێکـدا چـــوار مشـــقی دانیشـــتووە، عەبایـەکی رەشـی لەبەردایـە، چ زێر و زیوێکی پێوە نیە کە تاقە نیشانەی دەسـەڵاتیەتی، ژنێك بە بـێ جوڵـە لـە پاڵیـدا ڕاکشـاوە، سـەری لـە باوەشـیدایە، چـاوانی لێك نـاون، باسکی لـە نێـو بەرگـە ســـوورەکەیدا کـــە وەك بڵێســـەی ئـــاگر بەدەوریـــدا و لەســـەر فەرشـێکی ڕەنـگ خۆڵەمێشـیدا بڵاوبۆتـــــەوە، شـــــاراوەنەتەوە. هاراکـــای وەك گەمـــە لەگـــەڵ پشـیلەیەکی قەڵـەوی نوسـتوودا بکـات، دەسـت بـە نێـو قژیـدا دەهێنێت".

ژۆنکـــــۆر، چـــــیرۆکەکەی بەڕاسـتگۆییەوە بـۆ ئـەو پیـاوە زیتـەی ژاپـۆن دەگێڕێتـەوە. لـە کاتی قسـەکردندا، سـەرنج دەدات کـە چـاوی کچـەکە لـە چـاوی ئاسـایی ناچـێت و زۆر بـە وردی لەم دەڕوانێت وەك ئەوەی هـەر لـە سەرەتاوە، تەنانەت لەو کاتەیشدا کـە چـاوی لێـك نـابوو، هـەر لـە ژێرەوە هـەر لـە ئـەمی ڕوانیبێت. ژۆنکۆر بـە ئامانجەکـەی دەگـات، موجیزەکـــە بـــەدی دێنێـــت، دەگەڕێتـــەوە شارۆچـــکەکەی و گـــەرای ســـاغ بـــۆ بازرگانـــەکان دەهێنێـــت. بـــەڵام ڕوانـــینی بێدەنگی کچەکە ئاگرێت لـە دڵـی بەردەدات کە هەرگیز دانامرکێت.

گەشتی ژۆنکۆرر بۆ دوورگـە تەریکەکە دووبارە دەبێتـەوە و تـا دێـــت خـــۆی و هاوپیشـــەکانی دەوڵەمەنـدتر دەبـن، بالـدبیو لێـی دەپرسـێت: کۆتـایی دنیـا چۆنە؟ وەڵامـــی دەداتـــەوە "نابینرێـــت"

وەڵامەکــــە زیــــاتر بــــۆ ئــــەو خۆشەویستیە دەگونجێت کە دڵی هێناوەتــــــــە ژار و ژەنـــــــگ. خۆشەویستیەك کـە لـە دەسـت لێدانی ئاوریشم دەچێت. کاتێك کــە دەســـتی لـــێ دەدەیـــت وا دەزانیـــت دەســـتت بـــەر هـــیچ نەکەوتوە.

شـــــەڕ لـــــە ژاپۆنــــدا هەڵدەگیرسـێت، لەگـەڵ هـەموو مەترسیەکدا ژۆنکۆر هەر سوورە لەسەر سەفەرەکانی بۆ ئەوێ. ئەو بـە دوای ژنێـك – شـەبەنگێکدا وێڵە نەك بە دوای ئاوریشمدا. کە بالـدبیو پرسـیاری ئـەوەی لـێ دەکـات بـۆ ئەوەنـدە بـەو وڵاتـە دوورەوە بەســـتراوەتەوە و بــۆ ئەوەی بیگاتێ دەبێت سەر چڵی بکات. ئەو وەڵام دەداتەوە و دان بـە خۆشەویسـتیە نهێنیەکەیـدا دەنێت. بە چەند وشەیەك باس لە چـیرۆکی خۆشەویســتیەکەی و سەرســـام بـــوون و خـــۆ بـــە دەســـتەوەدانی بـــۆ ئـــەو کچـــە قەشەنگە دەکات: "تەنانەت گوێم لــە دەنگیشــی نــەبووە، چــەند ئـازارێکی سـەختە بـە تاسـەی خۆشەویستیەکەوە بمریـت کـە هەرگیز پێی ناگەیت".

ژنەکـەی ژۆنکـۆر هەسـت بـەو مەیلـە تازەیـە دەکـات. مـەیلی خۆشەویســتی، کــە خەریکــە ســـەراپای مێردەکـــەی داگـــیر دەکـات، ژنەکـــەی بـــۆ ئـــەوەی هیوایەکی بداتێ بەناوی ئەو کچە دوورەوە کـە مێردەکـەی عاشـقی بوە نامەیـەکی بە زمانی ژاپـۆنی بـۆ دەنووسـێت. "ژنەکـەی تاقـە ئـاواتی ئـەوەبوو کـە ئـەو ژنـە ژاپۆنیە بوایە".

کە ژنە دڵسۆزەکەی دەمرێت، ئەوسـا مێـرد و عاشـق لەیـەك کاتـدا، پـێ دەزانێـت کـە نامەکـە ژنەکەی ناردوویەتی، ئەوەیش بە یارمەتی خاتوو بلانش کە زمانی ژاپــۆنی چــاك دەزانێــت و لــە شـارێکی نزیـك بـە لافیلـدیودا دەژی. زانـــینی ئـــەم ڕاســـتیە هەنـدێك هاوسـەنگی بـۆ ژۆنکـۆر دەگێڕێتــەوە، چــونکە "ســالآنی دوایــی تەمــەنی وەك پیــاوێکی دەوڵەمەند وابەستە بووە بە جۆرە ژیـانێکی شـەفافەوە کـە لەسـەر بنــەمای هەســتێکی دیــاریکراو داڕێژراوە. ژیانی هێوری پیاوێك کە لەگەڵ خۆیدا ئاشتبۆتەوە".

ژۆنکــــۆر نائاســــاییانەو لەسـەرخۆ، چیرۆکەکەی خۆی بۆ ئــەو کەســانە دەگێڕایــەوە کــە دەچوونە دیدەنی، ئەوان سـەریان سـووڕ دەمـا. وەلـێ ئـەو بـەرەو ئاسمــان ســەری هەڵـــدەبڕی و دەیڕوانی، شتی وای لە ئاسماندا دەبینی کە کەسی تر نەیدەبینی

"دیمەنـە بـەڕاز و نیازەکـانی ئـەو ژیانەی گوزەراندبووی، بە هـەموو سووکباریەوە".

بـــاریکۆ لــــە گێڕانــــەوەی چیرۆکەکەدا شێوازێکی خـۆش و دڵگیری هەیـە کـە لەگـەڵ هەسـتی ناسکی پاڵەوانـە سەرکێشـەکەدا پێــك دێنــەوەو لەگــەڵ فــەزای ڕۆمانەکـــــەدا دەگـــــونجێن، گفتوگۆکــــان کــــورتن و وەك بروسکە تێدەپـەڕن، یـان ڕسـتەی خێرا و ئیحابەخشن، وەسفی ورد و چـڕن. ئامـاژەی سـەرپێیی بـۆ ئـــەو کارەســـاتە مێژوویيانـــەی لەوســــــەردەمە دێرینـــــــەدا ڕوویانـداوە. لـە ڕۆمانێکـدا کـە شـوێنەواری خۆشەویســتیەکی وەهمـی لـە باشـووری فەرەنساوە بـۆ ئارخـەبیلی ژاپونیـای دوور هەڵگرتبێت، هەرچیەك بڵێیت بە هەدەرناچـێت. بـاریکو بـاری ڕۆمانەکەی بەوە قورس ناکات کە خۆی بخاتە نێو جیاوازی ئەتنی و کلتـووری و ئاکاریـەوە کـە لـە نێــوان باشـــووری فەرەنســـا و دوورگە دوورەکانی ژاپۆندا هەیە. بەڵکو ڕۆمانەکە سووکەڵە دەکات و هەرچــــــیەك بیــــــەوێت بێگەردیەکـەی لێـڵ بکـات پـاکۆی دەدات. لـە شـانۆکاراندا ئەوانـە هەڵدەبژێرێت کە دەتوانن بە وشە هاوکاری بکەن لە دروست کردنی

پەیکەری خۆشەویستیدا. ئەو چیرۆکێکی خۆشەویستی وا دەگێڕێتەوە کە لە هیچ چیرۆکێکی باوی خۆشەویستی تر ناچێت کە ئێمە دەیانزانین و لە کلتووری گەلاندا نەمرن. بۆ نموونە ناتوانین بەراوردی بکەین بە ڕۆمیۆو جولێت. لێرەدا، ئێمە بەرانبەر بە خۆشەویستیەك وەستاوین کە لە نێو مەودا دوورەکاندا داگیرساوەو دڵەکان ڕووناك دەکاتەوە. بەڵام لەسەر زەوی واقیعدا هیچ بەڵگەیەکی بوونی نیە.

ڕەنگە تایبەتمەندی ڕۆمانی ئاوریشم لەوەدابێت کە باس لە خۆشەویستیەکی نائاسایی دەکات، ئەم لە نێو قووڵایی دەروونــدا ئەزموونی خۆشەویستیەك دەکات لە ڕێی نیگایەکی خەیاڵ کرد، یان پزیسکێکی هەڵاتوو کە لە سووچێکی دووردا بدرەوشێتەوە،یان دەنگێك کە بە کووچە و کۆڵانەکاندا گوزەردەکات.

لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا، باریکۆ زۆر بە وردی چاودێریی پاڵەوانەکەی دەکات، بە گەوجێکی دانەناوە کە دوای تراویلکە کەوتبێت، بەڵکو ژۆنکۆر عاشقێکی بەویقارەو ئەوەندە لە نهێنی خۆشەویستی دەزانێت کە تیایدا نقوم بووە. دڵیشی بە پێك گەیشتنێك خۆش کردووە کە هەرگیز نایەتەدی.

سەرچاوە:

الحياة 2006/7/18

*ڕۆمانی -ئاوریشم- لەلایەن هاوڕێی خۆشەویست کاك -ئازاد بەرزنجی-وە کراوە بە کوردی و لە ساڵی 2004دا لەلایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمەوە لە چاپدراوە.

## ماری ئەنتوانێت

## (1793-1755)

### ئامادەکردنی
### هەورامان وریا قانع

خێزانی "لویسی شازدەهەم"ە، لەوڵاتی نەمسا هاتۆتە دنیاوەو لە لەدایکبوانی بورجی (دوپشکە)، دایکی شاژنی نەمسابووە، "ماری ئەنتوانێت"لە منداڵیدا کچێکی جوان نەبووە، تەوێڵێکی زیاد لە پێویست بەرزی هەبووە، لوتێکی درێژوفش، دووریز دانی ناڕێکی هەبووە، لێوی خوارەوەی ئەستور بووە، بەڵام کاتێ دەزانێ خوێنی شینە، واتە سەر بە چینی خانەدان و ئەرستۆکراتیەکانە، هەر لەو تەمەنە بچوکەیدا خۆی فێری ڕۆشتنی شاژنانە دەکات، دوای باڵقبونی لەشولاری جوان دەبێ و دەبێتە خاوەنی قژێکی ئاوریشمی زەرد، پێستێکی پەمەیی، دووچاوی شینی گەشاوە، گەردنێکی ئەفریقی، لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا کەمەکێك فێری ئیتالی دەبێ، وەلێ نە دەزانێ بە ئەڵمانی بنوسێ و نە بەفەرەنسی، هیچ شتێکی ئەوتۆش سەبارەت بە مێژو نازانێ، لەبواری مۆسیقاشدا گەرچی لەسەر دەستی "جلوك" خوێندویەتی، بەڵام شتێکی ئەوتۆ فێرنابێت.

کاتێ "لویسی پازدەهەم" بڕیاردەدات بیهێنێ بۆ کوڕەزاکەی، واتە "لویسی شازدەهەم"، سورە لەسەر ئەوەی دەبێ دژ بە نەخۆشی (ئاوڵە)بیکوتن و پەلەش لە فێرکردنی بکەن. دوای کوتان و پشکنینی، دەردەکەوێت هەم دڵ و هەم تەندروستی زۆرباشە، بەڵام کەمەکێك تەمەڵە، سەرەڕۆیە، بەزەحمەت فێری شت دەبێت، حەزی لە سەماکردنە،

پێی خۆشە لەگەڵ سەگەکانیدا بەنێو دارستانەکاندا ڕابکات. لە 19 نیسانی ساڵی 1770 لە کڵێسای (ئۆغۆستین) لە ڤییەنا، بەوەکالەت "ماری ئەنتوانێت"ی چواردەساڵ لە "لویسی شازدەهەم" مارەدەکرێ، دوای دووڕۆژ لەمارەکردنەکە، لە کەژاوەیەکدا کە پێکهاتبوو لە 57 گالیسکەو 366ئەسپ خانمی تازە مارەبڕاو، لە ڤییەناوە بەرەو پاریس دەکەوێتەڕێ، ئەم کەژاوەیە 132 کەسی لەگەڵدابووە کە پێکهاتبوون لە خانمانی ئارایشتی قژ، ئافرەتی بەرگدرو، دەستوپێوەند، کاهینی کۆشک، پزیشک، صەیدەلانی، چێشتلێنەرو 35 کەس بۆ ئەوەی بایەخ بە ئەسپەکان بدەن، چونکە ئەو ئەسپانە لە ڕۆژێکداو لەمیانەی ئەو گەشتە دوورودرێژەیاندا بۆ پاریس، دەبوا چوار تا پێنج جار بگۆڕانرایە.

پاش شازدە ڕۆژ کەژاوەکە دەگاتە سەر ڕوباری ڕاین لە ستراسبۆرگ، لەسەر دورگەیەکی ڕوبارەکە، "ماری ئەنتوانێت" جلوبەرگە نەمساییەکەی دادەکەنێ و جلوبەرگی فەرەنسیانە لەبەردەکات و داورودەستە نەمساییەکانی بەجێدەهێڵێ و دەگەڕێنەوە بۆ ڤییەنا، کۆمەڵێ لە دەستوپێوەندو خزمەتکاری فەرەنسی شوێنیان دەگرنەوە، ئالەم ساتەوە ناوە نەمساییەکەی"ماریا ئەنتونیا" دەگۆڕێت و دەبێت بە "ماری ئەنتوانێت"ی فەرەنسی.

کاتێ گەورەی ئەو شوێنە ویستویەتی وتارێك بە ئەڵمانی بخوێنێتەوە، "ماری ئەنتوانێت" وتارەکەی پێبڕیوەو پێی وتووە: (چیتر بە ئەڵمانی قسە مەکەن، من لە ئێستاوە لە زمانی فەرەنسی بەولاوە، هیچ زمانێکی دیکە نازانم).

کاروباری بەیەکگەشتنی کەژاوەی "ماری"و کەژاوەی "لویس" واڕێکخرابوو کە لە باکوری ڕۆژهەڵاتی فەرەنسا بەیەك بگەن، ڕۆژی 14 ئایارکەژاوەکان بەیەکدەگەن، بووکە لە گالیسکەکە دێتەخوارەوەو بەرولای "لویسی پازدەهەم"دەڕوا، لەبەردەمیدا دادێتەوەو بەو شێوەیە دەمێنێتەوە تاکو پاشا بەرزیدەکاتەوەو بە ڕستەیەك دڵنەوایی دەداتەوەو پێی دەڵێ: (خانمەکە..لە ئێستاوە بویتە ئەندامێکی خێزانەکەمان)، دواتر ماچێکی تەوێڵی دەکات و بە وەلی عەهدی دەناسێنێ، ئەویش بەهەمان شێوەی باپیری ماچێك لە تەوێڵی دەکات، لە 15 ئایار هەردوو کەژاوەکە بەرەو ڤێرسای دەکەونەڕێ، لە 16 ئایار بە شێوەیەکی ڕەسمی ئاهەنگی گواستنەوە دەستپێدەکات، لەو شەوەدا خوانێکی شاهانە لە هۆڵی ئۆپرا تازەکەدا سازدەکرێ، "لویسی پازدەهەم" بە وەلی عەهد دەڵێ ئاگای لەخۆی بێت و زۆر نەخوات، ئەویش وەڵامی دەداتەوە: (هەموو کاتێ دوای خواردنێکی خۆش، خەوێکی باشی لێدەکەوێ)، هەر ئەوەش بوو ڕویدا، دوای چوونە ژورەوەیان بۆ ژوری هاوسەریەتی، وەلی عەهد خەوی لێدەکەوێت، لە شەوانی داهاتوشدا بەخێرایی خەوی لێدەکەوت و بەیانیانبش زوو لەخەو هەڵدەسا و دەڕۆشت بۆ ڕاوکردن، لێرەوە دەردەکەوێ کە "لویسی شازدەهەم" توانای سێکسی نەبووەو ناتوانێ لەگەڵ ژنەکەیدا جوت ببێ. هەندێ لە پزیشکەکان ئامۆژگاری دەکەن وەرزش و خواردنی باش بخوات، توانای سێکسی باش دەبێ، وەلێ مەسەلەکە پێچەوانە کەوتەوە، نەك توانای سێکسی باش نەبوو، بگرە لەگەڵیدا قەوڵەتر بوو، هەروەها مەیلی بۆ نوستنیش زیاتربوو.

دواجار لە كۆتايی ساڵی 1770ويستی ژنهێنانەكەی بگەيەنێتە ئەنجامو چووە لای ژنەكەی، بەڵام بەهۆی ئازارێك لە چوكيدا، نەيدەتوانی هيچ بكاتو هەمووجارێ شكستی دەهێنا، دوای پشكنين دەركەوت لە ژێر پێستی چوكيدا بەربەستێك هەيە كە نايەڵێ مەسەلەی جوتبون ڕوبداتو ئێشێكی زۆری هەيە، جەڕاحەكان پێشنياريان بۆكرد كە ئەو بەربەستە بە نەشتەرگەرييەك لابەرن، وەك نەشتەرگەری خەتەنەكردن، بەڵام وەلی عەهد ڕازينەبوو، وەلێ دوای مردنی "لويسی پازدەهەم"و بونی "لويسی شازدەهەم" بە پاشای وڵات، ناچار ساڵی 1770 بە پەلە نەشتەرگەری بۆ دەكەنو چاكی دەكەنەوە.

ئەم خانمە كاتێ ميللەتی پاريس ڕادەپەڕنو بەرەو ڕووی كۆشكی پاشايەتی دەكەونەڕێ، دێتە نێو بەلەكۆنەكەیو دەڵێ: (ئەوانە بۆچیوا توڕەن؟ ئەو هاتو هاوارەيان لە چييەو چيان دەوێ؟)وەڵاميان دايەوە: (خاوەن شكۆ، ئەوانە برسيانەو دەيانەوێ شتێ بخۆنو نانيان دەستناكەوێ) شاژنيش دەڵێ: (گەر (نان)يان دەستناكەوێ، ئەی بۆچی پسكيت ناخۆن!!).

ئاشكرايە پسكيت زۆر لەنان گرانترە، ميللەت گەر نەتوانێ نان بكڕێ، ئيدی چۆن چۆنی دەتوانێ پسكيت بكڕێ؟!. ئەوە برسيەتیو هەژاری ئەو خەڵكە بوو شاژن بيرلێنەكردبوەوە، ئەو خۆی ژيانی لە كۆشكەكاندا دەبردەسەر كە پڕ بوون لە هەموو جۆرە خواردنو خواردنەوەيەكی خۆش. لێرەوە ئەو بێئاگابوو لە حاڵو گوزەرانی خەڵكو لەوەش تێنەدەگەيشت خەڵكی ناتوانن نان يان پسكيت بكڕن، چونكە ئەو شتانە بۆ شاژن شتگەلێكی زۆر سادەو هەرزان بوو. ئەم خانمە زۆر پەرۆشی ئەوەبووە بەردەوام ڕوخسارێكی جوانو ڕێكو پێكی هەبێت، هەميشە خەريكی خۆڕازاندنەوەو گرنگی دان بووە بە لەشو لاری.

كاتێكی زۆری بۆ خۆشۆردنی ڕۆژانەی خۆی تەرخانكردووە، گەرماوەكەی پڕ بووە لە بۆنی گرانبەهاو ڕوەكی زينەو گوڵاو، هەميشە پەرۆشی ئەوەبووە لە دوو ئاهەنگدا بەيەك جۆر جلوبەرگ دەرنەكەوێت، يەكەم ئافرەت بووە وێراويەتی جلوبەرگێك لەبەربكات، ڕەنگەكانی بۆ ئەو سەردەمە سەيربووە، قژی خۆی چۆن بووە، ئاوا بەريداوەتەوەو بارۆكەی لەسەر نەكردووە، لە ئارايشتكردندا حەزی لە بەكارهێنانی ڕەنگی سور بووە، بەردەوام بۆ پارێزگاريكردنی دەستی، دەستكێشی بۆنداری لەدەستكردووە، ئەم دەستكێشە بۆندارانە لەلايەن "جان لويس فارگۆن"ەوە، دروستكراون. "فارگۆن" سەرچاوەی پەيداكردنی عەتر بووە بۆ كۆشك، "ماری ئەنتوانێت" داوای لێكردووە عەتری تايبەت تەنها بەخۆی بۆ دروستبكات، دەڵێن كاتێ شۆڕشی فەرەنسی بەرپادەبێ، "ماری ئەنتوانێت"ويستويەتی ڕابكاتو خۆی بشارێتەوە، بەڵام بۆنو بەرامەی عەترەكانی ئەوەندە بەهێز بووە، پياوانی شۆڕش بەئاسانی شوێنی خۆشاردنەوەكەيان دۆزيوەتەوەو دەستگيريان كردووە.

خانمی مێژونوسی فەرەنسی "ئيڤلين لۆفيە" كە پسپۆڕە لەكاروباری سەدەی هەژدە بەگشتیو شۆڕشی فەرەنسی بەتايبەتی، بۆيەكەمجار هەموو نامەكانی "ماری ئەنتوانێت"ی لە كتێبێكدا بڵاوكردۆتەوە، ئەم مێژونوسە فەرەنسيە لەسەر ئەم

نامانــــە دەڵـــێ: (ئـــەم نامانــــە دەریـــــــدەخات نوســــــەرەکەی ڕۆشـنبیرییەکی هێجگـار کـەمی هەبووەو خاوەنی هیچ خەیاڵ و شێوازێکی ئەدەبی گەورە نەبووە، بـەڵام ئـەم نامانـە ئـەوبارودۆخ و کـــەش و هـــەوا سیاســـی و کۆمەڵایەتیەمان بۆدەردەخات کە لەوسەردەمەدا لەنێو کۆشکەکانی لویسـی شـازدەهەمدا بـاوبووە. کەشـــوهەوایەك پـــڕ بـــووە لـــە پلانگێڕی و دەسیسەنانەوە).

هــــەروەها ئــــەم نامانــــە وێنەیـــــەکی ئاشـــــکراو ڕون دەربــارەی ئــەو پەیوەندییـــە (ئیباحییــە) گەورەیــەی نێـوان "لویســــــی شـــــــازدەهەم"و دۆســــــــــــــتەکەی "دوو باری"دەخاتــەڕوو، هـــەر لـــەم نامانـــەدا پەیوەنــــدی نێـــوان فەرەنســا و نەمســـای ئــەوکات دەردەکـەوێت، ئاشـکرایە "مـاری ئــەنتوانێت" خـــۆی ســـەر بــە بنەماڵەیــەکی نەمســـایی بــووە بە نـاوی بنەماڵـەی (هابسبۆرگ) کـــە چـــەندین ســـاڵ حکمـــی نەمسایان کردووە.

لە16 تشرینی یەکەمی ساڵی 1793کـە ڕۆژی لەسـێدارەدانی "ماری ئەنتوانێت"ە، بەیانیەکەی دوا نامــە بــۆ "ئـــەلیزابێت"ی خوشـکی "لویســی شـازدەهەم" دەنوســـێ و دەڵـــێ: (حـــوکمی مردنیان بۆ دەرکردوم، بەڵام ئەم مردنـە بـۆ مـن شـورەیی نییـە، بـەڵکو بـۆ ئـەوان شـورەییە، مـن دەڕۆم بــۆ بیــنین و گەیشــتن بــە براکـەت). ئـەم نامانـە لـە نێـوان ســــــاڵانی 1770–1793 دا نوســراون و ســاڵی 2005 لـــە کتێبێکـی 912 لاپـەڕەیی قـەبارە مـــام ناوەندیـــدا لــــە پـــاریس بڵاوکراونەتەوە.

ڕۆژی لــــە ســــێدارەدانەکە، "مـــاری ئـــەنتوانێت" لەلایـــەن شۆڕشـگێڕەکانەوە دەخرێتـە نـاو گالیسـکەیەکی سـەرکراوەو بـە نێـــو شـــەقامەکانی پاریســـدا دەیگەڕێنن، خەڵکێکی ئاژاوەگێڕ کـــە لەســــــەر شــــەقامەکان ڕاوەســتاون، ئـەوەی بکەوتایەتـە بەردەســتیان لــە شــتی پــیس و پـۆخڵی ئەوناوە، هەمویان گرتـە شاژن، لەبەردەم مەقسەڵەکەدا قژە درێـژە جوانەکـەیان بـڕی، پاشـان سەرە بچوکەکەی شاژنیان خستە ئـــەو شـــوێنە تایبەتـــەی بـــۆ لێکردنــــــــەوەی (ســــــــەر) تـــەرخانکرابوو، دواتـــر چـــەقۆ تیژەکـەی مەقسـەڵەکە بە خێرایـی دێتـــەخوارەوەو ســـەرە جـــوان و قەشـــەنگەکەی لێدەکرێتـــەوەو دەکەوێتە ناو ئەو سەبەتەیەی لە تەنیشتەوە دانرابوو.

ڕەخنـــەگری ســـوری "رجـــاء النقاش" یـەکێك لـە هۆکارەکـانی شـۆڕش دەگەڕێنێتـەوە بـۆ سـاڵی 1766، لـــەو ســـاڵەدا پاشـــای فەرەنســا "لویســی پازدەهـــەم"، بیرلەوەدەکاتـــەوە کوڕەزاکــــەی "لویسـی شازدەهەم" کە تەمەنی تـــەنها ســـیازدە ســـاڵ بـــووە، شـازادەیەکی بـۆ مارەبکـات کـە کچـــی ئیمپراتۆریــــەتی نەمســـا بـووەو سـاڵێك لـەخۆی منـداڵتر بـووە، بـەو هیوایـەی ملمڵانـێ و کێشەکانی نێوان ئەم دووولاتـە، فەرەنسا و نەمسا، لەڕێگـەی ئـەم ژنهێنانـــــــە سیاســــــــیەوە چارەسـەرێکی بـۆ بدۆزرێتـــەوە، چارەسـەرێك سوپاکانی هـەردوو وڵات نەیانتوانی بیدۆزنەوە.

ســـاڵی 1770 ژنهێنانەکــــە ڕویـــــدا، شـــــەوی یەکـــــەمی گواســــــتنەوەکە کێشـــــەیەك هاتــەئاراوە کــە بـــووە شـــوێنی دڵەڕاوکـەی هـەردوو خێزانەکـە، بگـرە بـووە شـوێنی ناڕەحـەتی هەردووولاتەکـە، لـــەو شـــەوەدا "ماری ئەنتوانێت"ی تازە بووکی شۆخ و شەنگ، دەبینێ "لویسـی شــازدەهەم"ی مێـــردی توانـــای سێکســـی نییـــە، بـــەهۆی ئـــەو عەیبـەی کـە لـە چـوکیدایە، ئـەم ناتەواوییە نزیکـەی حـەوت سـاڵ دەخایـەنێ و لـە سـاڵی 1777 لـە

ڕێگـــەی نەشـــتەرگەرییەکەوە چـوکی شـێوەی ئاسـایی خـۆی وەردەگرێتـــەوەو دەکەوێتـــەوە ئـــیش. کـــاتێ ســـاڵی 1775 "لویســـی شـــازدەهەم" دێتـــە ســـەرحوکم و شـــوێنێ "لویســـی پازدەهـەم"ی باپیری دەگرێتـەوە، ئەم ناتەواویە وادەکات پاشا پەلە بکـات لــە ئــەنجام گەیانــدنی نەشتەرگەریەکە، چونکە کێشـەکە لە کێشەیەکی خێزانییـەوە ببووە کێشـەیەکی سیاسـی و پەیوەنـدی بـەوەوە هــەبوو لــەدوای مردنــی پاشـا کـێ دێتــە ســەر عەرشــی فەرەنسـی، بۆیـە دەبـوا پاشـا لـە ژنەکەی کە ببوە شاژن، نەوەیەك بخاتەوەو ببێتە جێگری.

ئەم مەسەلەیە چیتر بە نهێنی نەمایــەوەو پاشــاو شــازادەکانی ئەوروپا لە کۆڕو کۆبنەوەکانیاندا باســیان دەکــردو گاڵتــەیان بــە "لویســـی شـــازدەهەم" دەکــرد، بگـرە ئـەم تراژیدیایـە خزییـە نـاو گۆرانیـــە میللییەکانـــەوەو لـــە هـــەموو شـــوێنێکدا بڵاوبـــووەوەو هـــەموان ئـــەو گۆرانیانـــەیان دەوتـەوە کـە گاڵتـەو سـوکایەتیان بـــە پاشـــاو شـــاژن دەکـــرد، گۆرانیـــەکان گەرچـــی گـــۆرانی ڕەمـــزی بـــوون، بـــەڵام خـــەڵکی هەمویان دەیانزانی ئەو گۆرانیانە باسـی ئـەو ژن و مێـردە دەکـات. دواتـر ئـەم گۆرانیانـە گـۆڕان بـۆ دروشـم و هوتـاف بـێ ئـەدەبی. ئیدی لـەو سـەردەمەدا فەرەنسـاو نەمسـاو زۆربـەی پایتەختـەکانی وڵاتـانی ئـەوروپی لـە قـەیرانێکی سیاسـیدا دەژیـان، هۆکارەکەشـی قەیرانی ژوری نوستنەکەی شاژن بـــوو، ناتـــەواوی "لویســـی شـازدەهەم" بـە درێـژایی حـەوت ســـاڵ کۆمـــەڵێ دەرئـــەنجامی ترســـناکی لێکەوتـــەوە، لەوانـــە پاشــا بــە تــەواوی تەســلیمی ئـیرادەی ژنەکـەی ببـوو، هـەموو شـــتێکی بـــەگوێ دەکـــردو نەیدەتوانی لە قەسەی دەرچێت. ژنەکەشـی دەیویسـت لـە ڕێگـەی دیکـــەوە قـــەرەبوی ناتـــەواوی مێردەکەی بەدەستبێنێت، لەوانە مانـەوەی تاکو درەنگانێکی شـەو لـە بۆنـەو ئاهەنگەکانـداو خودانـە قومارکردن و گەڕان بە شێوەیەکی شـێتانە بـە دوای جلوبـەرگی تـازەی گرانبـەهاو کـڕینی زێـڕو موجەوهەرات، ئیدی شاژن توانی تاڕادەیـــەکی زۆر دەســـەڵاتی ئیـــداری و بـــەڕێوەبردنی وڵات بگرێتەدەسـت، بـەبێ ئـەوەی لـەو بـــوارەدا شـــارەزاییەکی باشـــی هەبێت.

تەنانـــــــــــــەت دوای نەشـتەرگەریەکەو چـاکبونەوەی پاشــاو بــونی بــە مێردێکـــی ڕاســتەقینەو بــاوکی خێــزان، کەچی دەسەڵاتی شاژن وەك خۆی مایــەوەو هــەر خــۆی خــاوەنی قســەی یەکــەم بــوو. لێــرەوە تێکشـکاندنی شـان و شـەوکەتی پاشـایەتی لـە فەرەنسـا، لەگـەڵ ڕوخانـدنی بەندیخانـەی باسـتیلدا دەســـتیپێنەکرد، بـــەڵکو لـــەم چـــیرۆکەی ژن و مێردایەتیـــەی کۆشـــــکی ڤێرســــــایەوە دەستیپێکرد.

